# دیوانی

# شێرکۆ بێکەس

**بەرگی چوارەم**

**1993 - 1998**

کوردستان ـ 2006

# غەزای گوڵجاڕی ئاوێستا*

شوان ئەحمەد

جیاواز لە دیوانە شیعریەکانی دیکەی کاك شێرکۆ "ئافات" یەکەمین بەرهەمێك بوو کە لە دوای بەهاری ئازادیەوە، دوور لە ڕەقیب و دوور لە چاوی سانسۆرو بەبێ ترس خوێندبێتمەوە.

خوێندنەوەی چەند جارەی ئەم دیوانە جارێکیتر گەیاندمیە ئەوەی، قەڵەمی ئەم داهێنەرە گەورەیەمان ئاشناترین قەڵەمێکە کە بە درێژایی ئەزموونی شیعری خۆی ترپەی دڵی مێژووی کورد بە شیعر نووسیبێتەوە.

بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە ئەزموونی شیعری شێرکۆ بێکەس هەر بە تەنها گواستنەوەی ڕووداوەکانی ناو مێژووی نەتەوەی ئێمە بێت و تۆمارکردنی بێت بە شیعر.

ئاشنایانی شیعری شێرکۆ (بە ڕەخنەگرو خوێنەرەوە) بە ئاسانی پەی بەو ڕاستیە دەبەن کە شیعری ئەو چ تەماس و چ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە مێژووەوە هەیە، بەتایبەت بە مێژووی نەتەوەوە (دەرگای شیعری من لە کوردستانەوە دەست پێدەکات).

بەڵام سەوداو مامەڵەی شێرکۆ بێکەس لەگەڵ مێژوودا جیاوازەو تایبەتمەندی خۆی هەیە. هەر ئەمەشە وایکردووە ئەزموونێکی قوڵ و دەوڵەمەندبێ و بە درێژایی سی ساڵی ڕابردوو دەنگێك نەبێت بتوانێت تەجاوزی دەنگی ئەو بکات. ئەگەر بەشێکی گرنگی ئەزموونی شیعریی شاعیری گەورەی عەرەب "ئەدۆنیس" سەوداکردن بووبێت لەگەڵ زماناو

* شێرکۆ بێکەس: ئاوابوون و بوومەلەرزە.

ئیشکردن بووبێت لەناو زماندا، ئەوا ئەزموونی شیعری کاک شێرکۆ مامەڵە کردن بووە لەگەڵ مێژوودا لە هەردوو حاڵەتەکەشدا سەلیقەی شیعری هەریەکەیان لە ئاستێکی وەهادا بووە، کە نە دەقێکی مردوو بەرهەم بهێنن و نە شیعریەتیش لە دەقەکانیان بزربێت.

مەبەستمە بڵێم "ئەدۆنیس" سەرەڕای سەرکێشی زۆری لەگەڵ زماندا، بەڵام نەکەوتە ناو تۆڕی یاریکردنێکی بێ مانایانەوە بە وشەو شکڵ سازییەوە.

هاوکات کاک شێرکۆش لە قۆناغە جیاجیاکانی ئەزموونی شیعری خۆیدا نەکەوتۆتە تەڵەزگەیەکی وەهاوە، کە مێژوو بەشێوەیەکی میکانیکی و وەکی خۆی بە ڕووداوەکانیەوە پەلکێشی ناو شیعرەکانی بکات. ئەڵبەتە ئەوەی ڕاستی ئەم بۆچوونەش بسەلمێنێ بەردەوامی و داهێنانی شیعری بەردەوامی کاک شێرکۆیە. چونکە گەر وا نەبوایە ئەوا ئەم دەنگە هەرزوو دەبووە تۆماری مێژوو و، لە کاروانەکە جێدەماو وەك چەندین قەڵەمی تر پەراوێز دەکەوت.

بەڵام کاری مەزنی ئەم پیاوە لە سەوداکردنیدا لەگەڵ مێژووی نەتەوە بە شیعر ئەوەیە کە ئەو (بە نهێنی و شاراوەیی، بەسیمبول و دەمامکەوە لە دەروازەی مێژوو نادات. بەڵکو کارەکەی بە پێچەوانەوەیەو دەیەوێت مێژوو بە کێش کاتە ناو پێچ و پەناکانی شیعرەوە و بە ئاشکرا مامەڵە لەگەڵ ناوەکانیدا بکات.. یان ڕوونتر بڵێین دواجار ئەو شاعیرێکە دێت و بەستەڵەکی مێژوو دەگۆڕێت بە شیعر)**

لێرەوە دیوانی "ئافات" بە هەرسێ چامەی شیعری (ئافات و، پەریزادو گوڵەکەی دوژمنی و، ئاوابوون و بوومەلەرزە) دێت و زیاتر ئەو قەناعەتەمان لەلا دروست دەکات، کە چۆن چۆنی سەلیقەی شاعیرێتی شاعیرێك دەتوانێت بەستەڵەکی مێژوو بگۆڕێت بە شیعرو، لەگەڵ بوونی قەزیەیەکدا شیعریەتی دەق بزر نەبێت. کاك شێرکۆ کاتێك لە دووتوێی ئەم دیوانەیدا دەست دەخاتە سەربرینە سەختەکانی مێژووی هاوچەرخی ئێمە (هەڵەبجە، ئەنفال)، بەشێوەیەکی ستاتیکی تایبەت و بە فانتازیایەکی قوڵەوە جارێکی دی مەحکوممان دەکات بەوەی یادەوەری مێژووییمان بخەینە گەڕو، لەگەڵیدا سەرەتای سەرەتاکانی برین و خوێن ڕژانی ئەبەدیمان دەست نیشان کەین.

---

** خەلات عومەر: خاچی مێژوو، یاخود خاچی شیعر.

سەرەتایەك كە بەغەزای گوڵجاڕی ئاوێستاو
خۆرنشینی بانگی موغ و
داچۆڕینی دواتنۆكی زەردەخەنەی گاتاكان و
بردنی كڵاوەكەی (زەردەشت) دەستی پێكرد.
سەرەتایەكی بەد كە لە مێژوومان نابێتەوە:
من گەردنی ژێر شمشێری زەردی
هەموو كات و سەردەمێكم
من ئەو خوێنە نەفرەتیەم كە ڕشتنم نابڕێتەوە.

سەرەتای غەزای كۆن (غەزای گوڵجاڕی ئاوێستا) بە هەستانە سەرپێی زریانی زەردی لم و چۆك دادانی چیاكانمان دەستی پێكرد
لەگەڵیدا بێشەیەك شمشێر ئەجوڵا و دەهاتە پێش
كە (با)ی دڕكاوی سەحرای لە شمشێرزاو دەگاتە لامان،
مەملەكەتی خەونی میدیاو مەمكەكانی (ناهید) دەخوا.
لە غەزای نوێ و لـە ئـەنفالی تازەشمانـدا، كاتێـك سـەر لـەنوێ لێـشاوی پێكـەنینی لم دەست پێدەكات، ئەوا:
سەد بێشە (خودە) ئەجوڵێ و دێتە پێشێ
سەد بێشە پۆستاڵ.. سەد بێشە تفەنگ
سەد بێشە بەڵاو سەد بێشە تاوان ئەجوڵێ و دێتە پێشێ.
ڕاسـتیەكی حاشـا هەڵنـەگرە كـە گـەورەترین قەزیـە ناتوانێـت شـیعرێكی جـوان بخوڵقێنێو، مێژووش بە هەموو شكۆداریەوە لە باریدا نییە شاعیرێك دروست بكات. بـەڵام شـاعیری بەهرەمەنـد دەتوانێـت سـەودایەكی هونەریانـەی بـەرز لەگـەڵ بابەتـدا بكاتو، مێژووش بكاتـە سـستمێكی ڕەمـزی و دەلالی تایبـەتی وەهـا ــ كـە ئەمـەش كـاری شێركۆیە ــ تابێتە (تەوەرێكی سەرەكی و دالێكی سەرەكی شیعرەكانی).[***]

[***] بەختیار عەلی: ململانێی مەرگ ــ ژیان لە قەسیدەی خاچ و مارو ڕۆژژمێری شاعیرێ.

ئـەم كورتـە نووسـینە جگـە لـە چـەند بـاری سـەرنجێك بـەولاوە لافـی هیـچی دیكـە لێنادات.. بەڵام ئەمە دەستم لەوە ناگرێت كە لە داهاتودا وردترو بەنەفەسـێكی درێـژتر قسە لەسەر ئەزموونی شیعری ئەم شاعیرە داهێنەرەمان بكەم.

كارێك كە دەبێت ڕەخنەی كوردی زۆربە جیدی ڕەچاوی بكات و، ئاوڕی پێویست لـە ئەزموونی كاك شێركۆ بداتەوە. پێشمەوایە شـكاندنی ئـەو گـەمارۆی بێدەنگییـەی دەوری ئـەزموونی شـیعری شـێركۆیی داوە، ئـەركێكی كـە زیـاتر دەكەوێتـە ئەسـتۆی ئـەم نـەوە تازەیــە، ئــەركێك كــە دڵــسۆزانە هاوڕێیــانی گۆڤــاری (ئــازادی) هــەر لــە ســەرەتاوە ئەنجامیانـداوە، هاوڕێیـانی دیكـەش لـە ڕێگـای كتێبـی (تیرێـژەكان و شـیعری شـێركۆ بێكەس)دا درێژەیان پێدا.

2000/6/29
**سلێمانی ـ كوردستان**

ئاوێزانی ژینەژانم[1] بە، ئاوێزان
ئاوێزانی چراخانی خەمم!
تۆ بەخەمی یاقووتینی منەوە جوانی و

[1] ژینەژان: مەراقی گەورە.

منیش بە ڕشتەی مرواریی گوناهە سپیەکانی تۆوەیە
ئەدرەوشێمەوە.
ئاوێزانم بەو وەختی سوروسات[2] بەسەرچوو.
وەختی باوێشکدانی مێژوو،
وەختی نووسینی راستیی،
وەختی گەمەی پەیامبەران، گوزەشتن، گوزەشت!.
با فریای دوا وێردی گوڵە گەنم و
دوا پەیامی بەردوو، دوا نزای
فریشتە تاوانبارەکان بکەوین.
فریای ئاهوناڵەی شەیتانە بەسزمانەکان.
وەختی هێوریو چاو بڕینە چاوی
مانگە گەلحۆکان بەسەرچوو.
لەم بەندەرە سامدارەدا، ئەوینی زەڕنەقووتەی ئێمە
چۆن باڵ بگرێ؟! بڕوانە لە رۆژهەڵاتی سەرتەوە
چ ئافاتێکی چڕ بەڕێوەیە.
ئافاتی ئەشکەوتی زاووزێکەر بەتاریکیی و ڕقەوە.
ئاوێزانم بە. مەرگ ئەڵێ: درەنگە
عەدەم ئەڵێ درەنگە، بەهەشت و دۆزەخ ئەڵێن درەنگە.
فەنابوون یەك ساتەو هەموو سات.
ئەی کچی مەرگەسات!
ئەی ژنی بەفری ڕەش، ئەی کچی وڵاتی

[2] سوروسات: میوانداریی.

**تاعوون و کارەسات!**

**ئاوێزانم بە تێکەڵم بە**

**تۆ گەردەلوول و من پێدەشت تێکەڵم بە**

**تۆ دڵنیایی  و منیش ترس، تێکەڵم بە**

**لەکەڵە موستی پێمەوە تا تەوقی سەر تێکەڵم بە.**

**موو بە موو، دەمار بە دەمار، تێکەڵم بە.**

**با ئاوو ئاگر، خەم و خۆشی، تاوان و سزا**

**ڕەش و سپی،  وەرین و پشکووتن، حیلەو گمە**

**تێکەڵ بن و بەڕەنگی خۆیان ڕەنگمان کەن!..**

**با ئەم ئەوینە نەفرەت لێ کراوە.**

**ئەم دوو جەستە قەدەغەیە**

**یەك خاچی دەم بە زەردەخەنە**

**دوای خۆیان جێ بێڵن!.**

**ئەوەتا (با)یەکی مۆری ڕەقاویی گرنج گرنج، زبر،**

**وەکوو ئەو غەزەبەی لە کەناری مەملەکەتی**

**ئاتەشێنی "پارس"ەوە زوو، هەڵیکردوو،**

**لەگەڵ خۆیدا،**

**دەغڵی ماچ و ئاگردان و رووناکی برد.**

**لەگەڵ خۆیدا،**

**لانکەی گوڵ و بەردەنوێژی موغەکان و**

**کلاوەکەی "زەردەشت"ی برد.**

**"ئەم بەیانییە" "با"یەکی ئا لەو چەشنە**

"با"یەکی ریشنی دڕکاویی، "با"یەکی ئێسك گرانی
دەنگ گڕی دۆزەخیم بینی
ئەم"با"یە هاتووە، پاشەڕۆژ بفڕێنێ.
وا هاتووە درەختی ساسانی شیعرم ڕیشەکێشکات.
وا هاتووە، سەرمان، خەونمان، پەنجەکانمان
گوڵدانەکانمان، ژێی گیتارو گەرووی وشەو
سەمای گیان و ڕەشبەڵەك و پەرداخەکانی خەیام و
باڵندەکانی مەستوورەو سروودەکانی بێکەس و
هەرچی هەوری ژان گرتووە، هەرچی کرمی ئاوریشمینی ئایندەیە،
هەرچی گەرای چراکانە هەمووی بەرێ"
ئەمە مەرگی نوورانییەو بە شەپۆل دێ.
ئەمە مەرگی وەجاخزادەی ڕۆژهەلاتە.
ئەمە مردنێکی قسە خۆشەو دەوری داوین.
لەبیرت دێ کە پێم  وتی:
ئێمە لەبەر ئەم بارانە ڕەشەدا بۆ وەستاوین؟!
ئەی کچی بەنەعلەت کراو
لەبەردەمی ئەم مێژووە ترسنۆکەدا!
ئەم قەوزانە تازە لە لەشمان نابنەوە.
ئێمە لەبەر ئەم بارانە رەشەدا بۆ وەستاوین؟!
ئەم چەترە کۆنانە دادی ئێمە نادەن.
ئەترسم ئەمە دوا سەمای خۆشەویستی ئێمە بێت!
ئاوێزانم بە،

ئەی کچی درەختی سەربڕاو، ئاوێزانم بە.
ئەمڕۆ ئاینده هات بۆ لام، بەچاوی تەڕەوە
هات بۆ لام پێی وتم:
ئەو مەرگە نورانیانە ئابلۆوقەی
قەلاّی دەنگیان داوم، ئابلۆوقەی خوێنم.
هەموو رۆژ فرسەخێ دێنە پێشەوە.
هەموو شەو چاڵێك لە سینەمدا هەڵ ئەکەنن.
ئەی کچی لە خاچ دراوی بەردەم مانگەشەو!
ئەی ژنی لەش قفڵ کراو!
لەم بەندەرەدا بۆ کلیل مەگەڕێ.
لەم زەریایەدا بۆ کەشتیی مەگەڕێ.
کەشتیی ترسەو مردن تەنها بەندەرێکە
کە بێ تەم و مژ بیبینم
سەرەتا.. ترس
کۆتایی.. ترس
حیکایەت و ماڵ و خەبات و کتێبم
هەموویان هەر، بە ترس و، لەرز، داپۆشراون.
ڕەگی ئەم مەرگە درێژە.
ڕێگای ئەم مەرگە لە فەوتی سەرچاوەدا کۆتایی دێ.
مردن لەناو مردندایە، شمشێر لەناو شمشێردایە.
لە رۆژهەلاّتی سەرتەوە تۆفانی ڕەش بەڕێوەیە.
ئەی کچە ساسانیە بەد ناوەکە!

ئەی ژنی موغە کوژراوەکان!
"لە ئێوارەیەکی شەڕەنگێزدا،
لە ئێوارەیەکی کوێردا،
لە ئێوارەیەکی ڤیریندا:
ئاسمانیان لەسەر داخستین،
خاکیشیان لەسەر پێوەداین.
(مانگ)یان بە نووکی ڕمەوە بۆ هێناین و
ئەوسا بوو بە
ئاهەنگی لە دایکبوونێکی ترمان.
ئیتر لە شەرابی بەهەشت و
ماچی حۆرییاندا خنکاین. من بەتەنها چل حۆرییم هەبوو چل.
بەڵام تۆیان تیانەبووی،
ئەی کچە ساسانیە نەفرەت لێ کراوەکە!
تۆیان تیا نەبووی، تۆ ئەوکاتە لە گەشتی ژێر زەمین و
دنیای ژێرەوە بووی، تۆ لەوێ بەشوێنی مندا ئەگەڕای"
ئەوە یەکەم جاری مردنە ئێسك سووکەکەم بوو.
ئەوە یەکەم پەیوەندی نێوان ملم و شمشێری بەوەفاو
داری حەد بوو.
ئەوە ئەوەڵ سەحەری مەرگی من بوو.
ئاوێزانم بە،
ئەی کچی خۆڵەمێش و ئەی ژنی مەملەکەتی ئافات!.
وا لە رۆژهەڵاتی سەرتەوە

PDF 4 KURD

مۆم و بوغوردی مەرگم ئەسووتێنن.
وا لە ڕۆژهەڵاتی لەشتەوە
گۆڕەوشاری شیعرو پرشنگ و گۆرانیم ئەدەن
من ناتوانم باهۆزی شێتێتی خۆم
لەم ئافاتە بشارمەوە
ئەمە چارەنووسی عەشقێکە مل لە شمشێر ئەسوێ.
ئەی کچە ساسانیە جوانەکە!
وەختی سوروسات بەسەرچوو
مەرگێکی نوێ منی ئەوێ!

# پەریزادو
# گوڵەکەی دوژمنی

ئەمە "بۆرەتار"[1] ێکی شوومەو سەرەتای شەوێکی ئاوس بە قات و قڕیی.
بۆرە تارێکی ژان گرتوو بە: بەچکەشەیتان و بەچکە سیاسی و بەچکە بازرگانەوە
ئەمە شەوێکی چەڵاکی[2] ڕەقەڵەی بەدبینەو بێ بەزەیی.
چاوەکانی گۆڕیچەی ئەستێرانن و پەناگەی جادووگەران.
ئەم شەوە: قەڵای مێردان نییە، قەڵای دزانە، قەڵای کاسە سەرم و
قەڵای جەستەی ڕووخاوم و قەڵای خۆڵەمێشی ئارەزۆکانمەو هەوێزی[3] تاوان!
لەم شەوەدا، پەریزادەکەم!، کاتی ئەوە هاتووە، نۆرەمە
منیش چیرۆکی بەنەعلەت کراوی خۆمت بۆ بگێڕمەوە:
حیکایەتی مردنم و گۆڕەوشاردانی هەزار جارەم
"تۆ بڕوانە هەڵمی ڕۆحم"
تۆ بڕوانە حیکایەتی ژیانە کەڕو (کوێرە)کەم

---

[1] بۆرەتار: تاریکایی سەرەتای ئێواران و بەیانیان.
[2] چەڵاک: داری باریك و درێژ.
[3] هەوێز: مۆڵگە.

تۆ بڕوانە پرشنگی زیندە بەچاڵ کراوم
حیکایەتی مێژووە گەوجە خۆشەویستەکەم
"تۆ بڕوانە شازادە شەڕواڵ کەسیفەکانم"
ئەم چیرۆکە سەرابەو سەرابیش نییە
ئەم حیکایەتە پەندە و نەخشی سەر بەردیش نییە
پەریزادەکەم ئەی پەریزادی بێ دایك و باوك
پەریزادی لە کونە دیوار بووی، بێ کۆشك و بێ کەنیزەك!
ئەی پەریزادی لە خێڵی پەرییان یاخیی و بەخێڵی رافزی ئاشنا.
نۆرەمە منیش بتخەمە ناو کەشتیی گومان ودوو دڵیی خۆمەوە
کەشتیی ڕاڕایی و بەدمەستیی و گوناهی خۆمەوە بە جۆگەی شەراب و
رووباری ژەهرو یەکاوی[4] تاواندا بتسوڕێنمەوە.
بە شاری چوارمێخە کێشراوی ویژدانی خۆمدا بتگەڕێنم
بە شاری چۆڵ و هۆڵی زراو تۆقیوی هاوارەکانی کۆن و نوێمدا
بتبەم و سەرە بڕڕاوەکانی خۆمت نیشانبدەم
"تۆ بڕوانە چەندە جوانم بەم خوێنەوە"
دەروازەی مۆزەخانەی
لەشە مۆمیاکراوەکانی خۆمت بۆ بخەمە سەر گازی پشت
"تۆ بڕوانە شوێنەواری خەونەکانم"
پەریزادەکەم! ئێستا ئیتر کاتی ئەوە هاتووە
بتخەمە سەر ئەم باڵە کۆتەرانەی خۆم و
بەرەو سووتانی ئەبەدییت بەرم و تا لای"مانگ"ی

---

[4] یەکاو: شەت، چەمی گەورە کە لە چەند ئاو پێکهاتبن.

باتوومەتی سۆزانیی لە ئاسمان بەدەرکراو.. بەرزت بکەمەوە.

نۆرەمە، پەریزادەکەم!، نۆرەمە، منیش پێت بڵێم:

"هێندە لە تەنکاودا ژیام

بووم بە ماسیەکی گەمژەی ئاوی دنیا

ئەوەتا نە زەریاکان پێناسەم ئەدەنێ و

نە ئۆقیانووسەکان بڕوام پێ ئەکەن.

هێندە لە گوێ ئاگردانی وڕێنەکردنی باپیراندا دانیشتم و

ئەژنۆم دایە بەر چەناگەم و گوێم لە شلّپ و هووڕی درۆیان گرت

ئێستا وەك سێبەرێکی کڕی خەواڵووی مێش لێ نیشتووم لێهاتووە

ئۆه! من چ عیبرەتێکم بۆ مەرگی هەرزان

ئۆه! من چ عیبرەتێکم بۆ ئاخرزەمان!"

گوێم لێ بگرە! پەریزادەکەم!، گوێم لێ بگرە!

جارێکی دی ئەچمەوە ناو دەنگی

"ئاناباز"و ئەسپەکەی جڵەو ئەکەمەوە

سەر ئەکەمەوە بە مێژووە خۆڵاویەکەی داو توێژ بە توێژی

زەمان هەڵ ئەدەمەوە. دیسانەوە جارێکی دی ئەبمەوە بەکالانی ئەوسا:

"لە دەمادەمێکی[5] ژەنگاویدا، لە کازیوەیەکی حەپەساودا

"گەزنەفۆن"ی خواوەندی زرێ پۆشانی گریك،

سەرکردەی هزرو بازووی

جیهانی خوێن و دووکەڵ،

کوڕی پەرستگا ڕووناکەکانی"ئەثینا" و ئەسپی

---

[5] دەما دەم: بەرەبەیان.

ئاوی و شێری چنگ بە مەشخەڵانی باکۆدانی زەمین لە دوای زەمین
"گەزنەفۆن"ی وەچەی"ئاخیل" بەخۆی و دەهەزار سواری
تۆز لێ نیشتووی بیابانێکی دوورەوە
ڕەو ڕەو، دەستە، دەستە
لە دوای شەڕێکی دیکەی سوورهەڵگەڕاو
روویان کردە ئەم وڵاتی
دێوو درنجە
ڕێگای گەڕانەوەیان بۆ یۆنان، بە کێوی هاواری ئێمەو
پێدەشتی جەستەی جنراوی ئێمەدا تێ ئەپەڕی.
گەیشتنە دەربەندی
"گۆمە سپیان"
پەیکانی هەزاران ڕم لەبەر بارانێکی نارنجیدا
ئەدرەوشانەوە
تۆ ئەو کاتە رووت و قووت
لەسەر ڕەوەزێکی
دڕەوە تەماشات ئەکردین.
ئێمەش لەبەر باهۆزێکی ڕەشدا بەرەو ژوور
هەڵ ئەهاتین
بانگی خواوەندە بەردینەکانمان ئەکرد.
پەنامان ئەبردە
بەر مانگەشەوی تۆڤیو
پەنامان ئەبردە بەر برووسکەو چەخماخەی

نیشتمانی هەورە کۆیلەکان
داوێنی جادووگەرە ترساوە ڕیش درێژەکانی
خۆمانمان ئەگرت.
عەقڵی ئێمەو عەقڵی بەرانە کێویەکان
لە یەکتر جودا نەئەکرانەوە.
چاوی ئێمەو چاوی گاشە بەردەکان هەر یەك چاو بوون
دەروونی ئێمەو دەروونی ئەشکەوتە نسرمەکان
هەریەك شت بوو.
لە پڕێکدا "گەزنەفۆن" رێگەی وێڵ کرد
ئێمە ترسی خۆمان کرد بە بەردوو
بەسەر ئۆردوی ماندوودا.. خلمان کردنەوە.
لە بۆسەی "با" پێچێکدا، دوو برایان دەستگیر کردم.
"گەزنەفۆن" برا بچکۆلەکەمانی لەبەردەم ناوەنجیەکەدا لە
هەڵەموتێکەوە هەڵداشتە خوارێ.
ئیتر ناوەنجیەکەمان کەوتە پێش ڕمەکان،
کەوتە پێش مەرگی زرێ پۆش،
کەوتە پێش تۆفان و بوولەرە.
ئیتر لەو رۆژەوە ئەو برایەم، برای نەوجوانی نەعلەتیم،
بوو بە دیرۆکی[6] چارەنووسی بەردەوامی تا ئەمرۆم"
ئەمە دەورکردنەوەی خامۆشییە لە دۆڵێکدا"با" نەیگرێتەوە
ئەمە چەقینە، چەقین، چەقینی ئەسپەکانمان
لە زستانێکدا کە کۆتایی ئەوان و ڕمەکانمان،

[6] دیرۆك: مێژوو.

ترس و بیممان.

نادیارن"نادیار"

ئۆه! چ زستانێکی نەزۆکەو چ ترسێکی دوورو درێژ

ئۆه! چ ئەوینێکی بەسامەو چ مردنێکی شەرمنۆك

ئۆه! پەریزادەکەم، پەریزادەی باداوه[7] و گەرداو

ئۆه! پەریزادەکەم، شاژنی کلۆڵی و گڕاوی[8] سووتاو!

پەریزادم!

لەم شەوەدا هەموو برینێکم

مۆمێکەو هەموو مۆمێکم برینێکە

"ئەو بکوژێتەوە ئەم هەڵئەبێ،

ئەو هەڵبێ ئەم ئەکوژێتەوە"

بەمجۆرە: لە ئازارە جوانەکان، لە ئازارە نازدارەکان،

لە دۆژەنە[9] شۆخو شەنگەکان، جودا نابینەوەو

دابڕیین لە نێوانی من و تۆو مەرگدا مەحاڵە!

لەم شەوەدا،

هەموو پەیڤێکم پزیزکێکی ترافیەی[10] نێو غوربەتەو

هەموو غوربەتێکم

پەیڤێکی سەرگەردانی  سەر شەقامەکانی دنیایە

بەمجۆرە: لە هیوا نائومێدەکان، لە مژدە رەشپۆشەکان،

---

[7] باداوە: کرێوە، تۆف.

[8] گڕاوی: ماشقە (عاشقەو ماشقە)

[9] دۆژەن: خەفەتی گەورە.

[10] ترافیە: ئاوارەو دەربەدەر.

**له بەهارە زەردو بنسانەکان[11] جودا نابینەوەو**
**دابڕیین لە نێوان من و تۆو وڵاتی گریاندا مەحاڵە!.**
**پەریزادم!**
**من گیانم زەنەکی[12] عەشقەو بەرپەسارێکی[13] نسێی ساڵانتە**
**هەمیشەو هەمیشەو هەمیشە.. تەڕوپاراوە مەراقم.**
**هەمیشەو هەمیشەو هەمیشە.. وشك و برنگە ئارامم و**
**هەمیشەو هەمیشەو هەمیشە.. تینووە ئاوم**
**هەمیشەو هەمیشەو هەمیشەیش:**
**ئاگرم ساردو، سەرمایەتی و هەڵ ئەلەرزێ هەتاوم!.**
**پەریزادم! ئەز بۆ ئەوە زاوم قەبرم لە گوێ سەرم بلەرزێ!**
**"چ سەرێکی نەفرەتییە سەری من"**
**ئەز بۆ ئەوە زاوم هەر ڕاکەم و هەر ڕاکەم و، نەیشگەمێ**
**"تراویلکەی کام قاقڕو خۆڵستانە ئاواتم؟"**
**پەریزادم!**

**من لەسەر گێڕانەوەی رووبارە- چیرۆکە درێژەکەم و**
**جۆگە- چیرۆکە کورتەکەم**
**چیرۆکە- کانیە زۆر زۆر کورتەکەم بەردەوامم:**
**"لە دوای کۆچی ئەسپەکەی "ئاناباز"یشەوە**
**هەر جڵەوی ترە ئەیگرم و**

---
[11] بنسان: کزبوون و ڕەنگ پەڕینی مرۆڤ.
[12] زەنەك: شوێنی هەمیشە تەڕ.
[13] بەرپەسار: لاپاڵ.

هەر سوارم و هەر غارێکی وەستاوم!
چەندین سەدە لە دوای"گەزنەفۆن"یشەوە
ئەو گاشە بەردەم بێ وچان لە تل بوونەوەدام.
جوانترین مێژووی وەرینم.
خێراترین تیشکی تەمەڵییم.
قۆزترین سواری چەقێنم!.
هەزاران ساڵم خستە سەر ڕانم،
یەکێکیان نەبوون بە دۆستم.
هەزاران ساڵم خستە سەر شانم و
هەموویشیانم بەردانەوە..
بەم جۆرە- پەریزادەکەم!. بەم جۆرە.
من پڕۆژەی عیبرەتێکی هەمیشە نوێم
عیبرەتێکی مامۆستا ئاسا
بۆ سروشت- بۆ دنیا، بۆ گەردوون
بەلاّم هەر بۆ تۆ ناو هەر بۆ خۆم نا!"
پەریزادم! پەریزادی تاق و تەنیا
جارێکی دیش لە کۆچدا بوو
لەوێ لە"ڤینتسیا"
لە ڤینتسیای عاشقی مانگە شەو و ئاودا
لە شاری سیحردا
لە شەوێکی زیویندا
لەنێو "باڕ"ی بەلەمێکی پەمەییدا،

چرۆچاوی خۆم نا، شیعرەکانم کچێکیان کرد بە هاوڕێم.

ئەم کچە فریشتەی ئاویی بوو،

لە دوورگەی خەون و خەیاڵەوە هاتبوو،

نیوەی لەشی ماسیی و

نیوەکەی تری ئادەمیی بوو، ئەبریسکایەوە،

ئاوازێکی ئاڕووشەی[14] داگیرساو بوو.

نەوڕەسێکی مێینە بوو.

ناوی"ئەلیزابێـث" بوو.

کە لێم پرسی تۆ خەڵکی کوێی؟ پرشنگی دایەوەو

وتی:"من خەڵکی نیشتمانی هونەرم

باوکم ناوی شیعرەو

دایکم ناوی مۆسیقایەو

هەر ئەوەندە لە ڕەچەڵەکی خۆم ئەزانم!"

ئەو شەوە تا درەنگان

لەگەڵ ئاودا مەوجمان دایەوە.

ئەو شەوە تا درەنگان

لەگەڵ سنەوبەرەکاندا سەمامان کرد.

لەگەڵ بادەدا

ماچی مانگە شەو و روومەتی هەورمان کرد.

لەگەڵ گیتارژەنەکانی ناو کۆڵانی ئاودا

خۆشەویستیمان خواردەوە.

---

[14] ئاڕووشە: بزۆزو جووڵە جووڵکەر.

لەتەك ماسیگرەكاندا
لە قولایی زەریا ورد بووینەوە.
لەتەك گەڕیدەكاندا
گۆرانیمان وتو عەشق نامەمان خوێندەوە.
لەسەر پەلكە رەنگینە دیلانێمان كردوو
خۆمان لە ئەستێركی خەرمانە هەڵكێشا
دوو كلاوی پووشی دەستكردمان كڕیو
لە دواییشدا دامان بەدەم جۆگەیەكەوە.
لای ژنە فالگرەوەیەكی قەمووری دەموچاو كوتراو
دوو فاڵمان گرتەوەو لە دواییدا قاقا پێكەنین.
لەبەر جامخانەی كتێبخانەیەكی خەواڵوودا
وەستاین و لەیەك كاتدا
تەماشای كتێبەكانی"ماو" و"قەززافی" و
"جان جاك رۆسۆ" مان ئەكرد.
"ئۆە! پەریزادەكەم
ئەو ساتانەیش بەختیاریم هەر شپرزەبوو
ئەو ساتانەیش
هەر گوێم لە ترپەی پێی مەرگ بوو
ئەو ساتانەیش
هەر لە بەلەمێكی سەرەو نخون ئەچووم.
لە ناكاوێكدا، "ئەلیزابیث" كێشیكردم و
بردمیە ناو كابینەیەكی نیوە ڕووناكەوە

**لەهەر گۆشەیەکدا مۆمێك ئەسووتا**

**هەڵۆیەکی مۆمیاکراو باڵەکانی کردبۆوە.**

**لەسەر مێزێکی ئەبەنووسی خڕ**

**گوڵدانێکی پڕ لە گەڵاڵ زەیتوون دانرابوو،**

**چەند کەسێکیش دەوریان دابوو،**

**کە بەرچاوم ڕۆشن بۆوە، ناسیمنەوە:**

**دانتی و کەپووە کەوانیەکەی، بتهۆڤن و**

**قژە بژەکەی، ڤان کوخ و گوێچکە بڕڕاوەکەی،**

**دستویڤسکی و ڕوومەتە تێك قوپاوەکانی،**

**لۆرکاو پەڵە خوێنەکەی سەر سنگی،**

**وەك مەلێکی ترساو لەسەر کورسیەك هەڵکوڕمام**

**پەریزادەکەم! من هەر گوێگر بووم گوێگر،**

**گوڵدانەکە چەند دووا منیش هەر ئەوەندە!**

**لەو شەوەوە زانیم من هێشتا فێرە ئاخاوتن نەبووم.**

**شیعرم ئازار داوە، تەنکاوم خوێندۆتەوە، ڕوانینم هەر ئەوەندەی**

**چۆلەکەیەکی تەڕ فڕیوە. ئۆە! پەریزادەکەم!**

**ئەم کارەساتی عەقڵە چەند گەورەیە!**

**هەر ئەو شەوەیش زانیم**

**لەبەرچی"ئەلیزابێـث" ی کچی شیعرو مۆسیقا**

**پەلکێشی کردم بۆ ئەو کابینە نیوە ڕووناکە**

**پەریزادم! لە کەناری ئەم ئەشکەنجە بە خوڕانەی مندا**

**لە کەناری ئەم نیگا وێڵ و پەڕاگەندانەی مندا**

وەك دەيان پۆلە پەرەسێلكەی دوای تۆفانێكی تووش
چیرۆك لە دوای چیرۆكم ئەمرن و
شیعر لە دوای شیعرم رەق ئەبنەوە
من كوڕی كارەساتم و
كارەساتیش كوڕی ئەم هزرە زڕو نەزۆكەمە!
پەریزادم!.. من ئەمشەو هاتوومە لات و
مەستی نەزانینی خۆمم،
پەپووسلێمانكەیەكم سەر خۆش،
فڕینم لا سەنگ و نزم و
دەنگم قرتاو و خەونم قرچۆك.
من پەیامبەری ئازارە بڕۆنزیەكانی تۆم و
پۆستەی بروسكەی
هەرگیز نەگەیشتووت.
من پەیامبەری ئازای ژێر كەوتووی تۆم و
قەڵغانی مێژووی لە دەست پەڕیوو
شمشێری نوشتاوەت!
من بكوژی هەموو ئەو ڕووبارانەم
كە لە سەرچاوەی خوێنی تۆوە هەڵقوڵێن.
بكوژی هەتاوی ڕوخسارت.
بكوژی گوڵە گەنمی پەنجەكانت.
بكوژی بارانە سەوزو سورەكانت.
بكوژی بەخت و بكوژی لەشت!.

**پەریزادەکەم! دە ئیتر بۆ دوودڵی و بۆ راماوی؟**
**لەم شەوە شوومەدا، لەم شەوەبەدبینەدا، وەختێتی ڕا بەو**
**عاشقە بکوژەکەت، دڵدارە چەقۆکەت، بارانە ژەهراویەکەت،**
**گوڵە دوژمنەکەت، کە منم من..**
**بە سزای ئەبەدیی خۆشەویستیی بگەیەنەو**
**عاشقی نوێ و مێژووی نوێ و گوڵی نوێ بخوڵقێنە!**

ئەیلولی 1992

# ئاوابوون و بوومەلەرزە

ئاوابوون بوو.
ئەی شەفەقی لە خاچدراوی جەستەم و مانگی کوژراو!
ئاوا بوون بوو.
وەك زەردەپەڕی"گاتاکان" لە پەرسگەی ڕووناکیدا.
وەك پووکە پووکی درەخت و،
وەك بینایی دارو بەردوو،
سۆمای کێوو، نیگای هەورو، چاوی ڕێ و بان..
وەك ئاگردان
وەکو دایکم
هەموو کەلەپۆکان گریان!
غەزای سەربڕینی شاخ بوو، غەزای ڕۆحم، غەزا.. غەزا
غەزای دەروونی داربەڕوو
غەزای.. بەفرو
غەزای.. وشەم
غەزای گوڵجاڕی ئاوێستا!
لێشاو بوو، لێشاو بوو، لێشاو
لێشاوی پێکەنینی لم،

قاقای ڕم و قاقای دەف و قاقای تەپڵ

لێشاوی خوڵی بیابان:

لە هەڕەتی تەپ و تۆزی سەرکەوتوودا!

لێشاوی دوورگەی نەفرین بوو

لە هەڕەتی خوێن جمانی شیرو شمشێری لەشکردا..

چاوەکانی خۆشەویستیی

چاوی نەستمان

وەك قوتیلکە کزەکانی سەر تاشەبەردی ئاتەشگە

کوژانەوەو بوو بە ئاهەنگی خەلیفەو

جەژنی فەتحی کافرستان...

غەزابوو. غەزا بوو.. غەزا

ئاوابوون بوو لە بەیاندا

هەڵقرچان بوو لەناو بەفراو

بەفرانبار بوو لە دۆزەخداو

دۆزەخیش بوو لە بەهەشتی تازەماندا!.

فەرمان فەرمانی سەحرا بوو.

فەرمان فەرمانی ئاسن بوو

فەرمانی باوك، فەرمانی تیر، فەرمانی شیر

ئاوابوون بوو.

ئاوابوونی عەشق لە مەرگاو مەرگ لە عەشقا

"شین و شەپۆڕی باران بوو"

ئاوابوونی لەش لە تەمداو تەم لە لەشدا

"گەرمەشینی دارستان بوو"
هەستانە سەرپێی زریانی زەردی لم و
چۆك دادانی چیاكان بوو..
ئاوابوون بوو
خۆرنشینی بانگی موغ و
پژانی شیعرو گۆرانی و
توانەوەی ئێسكی هەتاو و
هەڵوەرینی سەروقژی دڵداران بوو..
ئاوابوون بوو
خەرەندەكان پڕ بوون لە تەرمی دارگوێزو
پڕبوون لە سكڵی كوژراوو
پڕبوون لە گوڵی جوانەمەرگ
بێشەیەك شمشێر ئەجووڵێ و دێتە پێشێ
ئاوابوون بوو
كانیی وەك منداڵ ئەترسێ
پیاو وەكوو چیا ئەترسێ
مێژوویش  وەك درەخت ئەسووتێ
بێشەیەك شمشێر ئەجووڵێ و دێتە پێشێ
غەزا بوو.. غەزا بوو.. غەزا..
ئاو لەسەر تاوێر خۆی ئەكوشت
دابڕان بوو. جوێ بوونەوە. دابڕان بوو
داچۆڕانی دوا تنۆكی زەردەخەنەی گاتاكان بوو.

ڕنینەوەی دەنگی شاخ و
بڕینەوەی ڕەنگەکان و
دابڕانی کات لە شوێن و شوێن لە کات بوو.
بێشەیەك شمشێر ئەجوولێ و دێتە پێشێ.
گوناهە بەسەزمانەکان، پۆلە باڵندەی وەریو بوون
پۆلە هەوری رەنگ پەڕیو بوون
خۆیان خزانە باوەشی شمشێرەوەو
بوون بە ترسێکی رواوی باخچەی بەهەشت
بوون بە کەنیزەکی شەو و
بوون بە غیلامانی یاوەران..
کوژانەوە دەستی پێکردا.
لە سەرانسەری ئەم کافرستانە جوانەدا،
لە سەرانسەری ئەم ئازارە شۆخ و شەنگەدا.
باڵندەیەك نەما کوێر نەبێ
هەورێك نەما نەزۆك نەبێ.
باخێك نەما ئیفلیج نەبێ
لە سەرانسەری ئەم بەهارە خوێناویەدا:
هەردێك نەما وەك غەنیمە سەوزیی لەبەر دانەکەنرێ
گومێك نەما وەك غەنیمە شینیی لەبەر دانەکەنرێ
ئاوابوون بوو
توانەوە بوو
دابڕان بوو

"ئەوەی بیستتان: ئەوە دەنگی جەستەی من بوو.
ئەوە زریکەی مەمکم بوو. قیژەی بەژن و گەردنم بوو
ئەوە هاواری مەرگم بوو. لە هەڕەتی داڕماندا..
ئەوەی بیستتان: دەنگدانەوەی یەکەم غەزای
یاوەران و پیاوچاکان بوو لەناو لەشما.
ئەوەی بیستتان: دەنگدانەوەی خوێنی عوزرو
دوا چەخماخەی کچێنیم بوو.
ئەوەی بیستتان: گرمەی کەوتنی سەرم بوو.
شڵپەی ناخم، هاژەی رۆحم، زەنگی ناخم.
ئەوەی بیستتان قرمەژنی نوشوستیم بوو.
من کچە چاو سەوزێکی میدیاییم
ناوم"ناهید"ە
شەرابی گاتاکان لە ناوەکەم ئەچۆڕێتەوە
من بە نێوی"ناهید"ی خواوەندی جوانی و میهرەوە ناونرام.
گەڵا زەیتوون چاومەو چاوم گەڵا زەیتوونە.
باڵام کلپەیەکی کەڵەگەتە، گەردنم کێلی ڕەوەزانە.
ئەو شەوەی لە دایك بووم
مانگ لە دەربەندی پیرەمەگروندا قەتیس مابوو
مانگ بە هانای مەزدەوە هاتبوو.
ئەو شەوەی لە دایك بووم
لە تێلی طاوسیانەوە پێچام و حەوت جار
بەدەوری ئاگرێکی خۆشدا گێڕایانم..

چل قومری باڵ شین بۆیان ئەخوێندم
چل گوڵە هێرۆشیان کردبوو بە چەتری سەرسەرم.
ئەو خاڵەی لەسەر تەختی تەوێڵمە
نیشانەیە، ئەوە شوێن ماچی پیرۆزی ئاهورامزدایە
من لە دەستەی فریشتە سپیەکانی میدیام.
باوکم ڕەزەوانی پەرسگە گەورەکەمانە.
باوکم بە ڕیشە سپیەکەیەوە
لە درەختی نووری ئاوێستا ئەچێ.
من تاقانەی ئەو بووم..
وەك تاقانەی زنەی قاقرێك.
"مەردۆخ"ی پاڵەوانی سەر سنگ نەخشاو
بەسەرە "بەران"ی پیرۆز، عاشقم بوو
چەندین بەوری بۆ کوشتم
چەندین پڵنگی بۆ ڕاو کردم.
هەتا "با"ی دڕکاویی سەحرای لە شمشێر زاو
نەگەیشتبووە لامان
ئاسمان و زەویمان وەکوو
پەڵە هەوری سپی و گوڵەگەنم پاك بوون
کە "با"ی ڕەش گەیشت "با"ی وەشتمان مرد
بوو بە زەمانی کوللە بارِیین
بوو بە زەمانی ئەوین هارِیین..
ئەم "با"ی چقڵە بەیەکەوە گوڵەگەنم و چاومان ئەخوا

بەیەکەوە پەنجەمان و لاسکی شیعرو تاڵە قژی پەریەکانی
مەملەکەتی خەونی میدو مەمکەکانی"ناهید" ئەخوا.
کچە میدیی گوڵ وەنەوشە، لە پەنجەرەی
ڕەوەزەوە وەك کازیوە هەموو ڕۆژێ سەر دێننە دەر،
مانگ بەسەروو، گوڵ بە سەروو، گزنگ بەسەر
ئەڕواننە دوور، چاوەڕوانی حیلەی ئەسپ و بانگەوازی
مەردۆخ ئەکەن. چاوەڕوانی بوومەلەرزەی مەلەك طاوس،
چاوەڕوانی رەزەوان و گەڕانەوەی گاتاکان و مەشخەلأنی
پرچەکانی ئاگر ئەکەن
"نایەنەوە، تیژتر بووە
دەمی ئەم شمشێرە زەردە
نایەنەوە، زیندوویش تەنها سبەینێیە"
خوداوەندی عەشق و جوانیی
خوداوەندی پەیام و جەستە خوێناویی
خوداوەندی شیعرو نامۆیی و تەنیایی
"ناهید" ئەڵێ:
زەریاکانی چەندین سەدە وان لە سەرما.
من هەڵمی دوێنێ و
بارانی ئەمێستاکەو
خەونی سەوزی سبەینێشم
لەیەك وەختا یەك ناوم هەیەو سەدان ناو.
مێینەم و نێرینەم و گیاندارم و بێ گیانیشم.

**من خۆم زەمانی قوربانیی بێ بڕانەوەی ئەوینم.**
**سەدهەزار جار کوشتویانم.**
**سەد هەزار جار ژیامەوە.**
**من گەردنی ژێر شمشێری**
**زەردی هەموو کات و سەردەمێکم.**
**من ئەو خوێنە نەفرەتیەم کە ڕشتنم نابڕێتەوە.**
**سەدە هات و سەدە ڕۆیشت و منی یەکەمین دەریاچەی**
**گوناهی جوان، گوناهی شەنگ، بووم بە دایکی**
**هەموو مێرگە کوژراوەکان، بووم بە سەری پڕ لە قیژەی**
**مێژووی ئاوو مێژووی خۆڵ و هەقی چوار مێخە کێشراوی**
**ڕەجم کراو.**
**من تەبایی ناکۆکیەکانم:**
**کۆنی تازەم.**
**زامی ساغم.**
**سوێی تریقەی پێکەنینم.**
**ماڵی بێ جێم.**
**بەهەشتییەکی دۆزەخیم.**
**ڕەشەبایەکی لەسەرخۆم.**
**شەماڵێکی پڕ لە پشکۆم.**
**شەرابی بێدارکەرەوەم.**
**تۆبەی مەستم.**
**پەپوولەیەکی زۆر دڕم.**

کلێپەیەکی ساردو سڕم.

خۆرەتاوێکی تاریکم.

تاریکایی چراخانم.

کوێستانێکی پڕوکاو و

بیابانێکی پاراوم..

تەم و مژو، لێڵی: روونم.

من ئەشکەنجەی کامەرانی و پێکەنینم.

ئاخ لە من ئاخ لە من ئاخ.

نامۆی ناو ماڵەکەی خۆم و

غەریبی ناو گیانی خۆمم.

سپی ڕەش و ڕەشی سپی و

دەنگدانەوەی ناو بێ دەنگی و

ڕەنگدانەوەی ناو بێ ڕەنگی و

سووڕانەوەی ناو وەستانی جەستەی خۆمم.

من بینایی نابیناییم،

من کەسدارێکی بێ کەس و

جوگرافیای بێ خەریتەو

ماتماتیکی بێ ژمارەو

کارەساتی بێ دیرۆك و

ڕێزمانی بێ زمانی دەنگی خۆمم!.

من لە تەمتوومانی سەدەی خۆمدا

لە ئاگری جەستەی خۆمداو

لەسەر کورسیی خاچەکەی خۆم
هەموو جارێ
بە دیداری ئەو ئازارە سووتاوانە شاد ئەبم
کە دوای من ڕسکان و نەمدین.
کە دوای من هاتن و
بە بەردە ئەستێی خەم
سەرزەمینیان ئاگردا.
بە بومەلەرزەی شپرزەو گومان
تۆببەی یەقینیان هەڵەوگێڕ کردەوە
هەموو جارێ
لە باڵکۆنی هەورە بەرزەکەی خۆمدا
بە دیداری ئەو بارانە کوژراوانەی دوای خۆم شاد ئەبم
بەرامبەر یەك دائەنیشین
چاو ئەبڕینە زامی یەکتر
ئەوان ئەبن بە من و من ئەبم بەوان..
دەست ئەخەینە ناو دەستی ژان و خولیای یەکترەوە.
مەگەر بە هەندێ نیشانەی ساڵدا لە یەکتر جوێ بکرێینەوە
ئەگینا هەر:
یەك سەرمان هەیەو
یەك چاومان هەیەو
یەك پەرستگایش.
شەوانە لە باڵکۆنی هەورە بەرزەکەی خۆمدا

**پێکەوە ئەیکەین بە شایی گوناهی سپی و**
**شایی مەرگی ڕاپەڕیو و شایی خاچی سەرچۆپی کێش.**
**زەماوەندی هەموو گومانە جوانەکان.**
**ئێمە لەم ولأتی هەتا هەتایەی عەشق و هەتا هەتایەی**
**ئاگردا. بریتین: لەو ژن و پیاوە بە نەعلەت کراوو**
**ڕەجم کراوانەی، کە یەك لە دوای یەك، کەڵبەی**
**مێژووە دڕەکانمان هەڵکێشا، هزریان تووشی**
**ژانی خۆشەویستی و بوومەلەرزە کرد. ئێمە لەم ولأتی**
**ژیلەمۆو ناتەباییەدا، هۆش و گۆشە مل کەچەکانمان**
**فرێدایە گەرداوە تووشەکانی گومانەوە. وەك پڵنگ**
**"نەء" مان بەردایە گیانی"بەڵێ" باوەکانی دیوەخانان.**
**ئێمە دەرزی ئاژنی جەستەی دڵنیاییمان کرد.**
**دۆزەخی ئەبەدیمان بۆ بەهەشتی قەناعەتە بەسەزمانەکان**
**داخست. نەمانهێشت تەختی پادشاهان و تاجەکانیان**
**لە ترس و لەرز بەدووربن**
**ئەگەر لە ترسی هەڕەشەی کوختێکی تەنیایش بووبێ.**
**نەمانهێشت قفڵەکانی لە گەروودڕاوی ڕووناکیی**
**هەموو شەو بەئاسانی چاویان بچێتە خەو**
**بێترس و لەرز بنوون**
**ئەگەر لە ترسی کلیلێکی ون بوویش بووبێ.**
**ئێمە بریتین لەو برینانەی ڕاوی چەقۆمان کرد.**
**لەو خوێنانەی زریانی سپیمان لێ کەوتەوە.**

لەو سێدارانەی گوڵاڵەمان لەسەر ڕووا.

لەو مەنفایانەی نیشتمانمان لێزا.

ئێمە بریتین لەو نائومێدیانەی بە هیواوە سەرمان نایەوە!

شەوانە لە باڵکۆنی هەورە بەرزەکەی خۆمدا

پێکەوە، زامی هەموو سەدە دوورو نزیکەکان کۆئەبینەوە

وەك پوورەی هەق ئەخرۆشێین.

کورسیەکەی من بە تەنیشت کورسیەکەی مەسیحەوە.

کورسیەکەی حەللاج بەرامبەر کورسیەکەی ژان دارك.

کورسیەکەی بابك بەتەنیشت کورسیەکەی قاسملووەوە.

کورسیەکەی جەمال عیرفان بەرامبەر کورسیەکەی "مەزد"ە.

کورسیەکەی عبدالخالق معروف بەرامبەر کورسیەکەی شەرەفکەندی.

کورسیەکەی موسا عەنتەر بەرامبەر کورسیەکەی سەعید پوور.

شەوانە لە باڵکۆنی هەورە بەرزەکەی خۆمدا:

پێشوازی لە تۆفان و مەوجدانەوەی هەقی خوێناویی ئەکەم

پێشوازی لەو سەرە بڕراوانەی تووڕدرانە بەردەم سەگەلی خەلیفەکان

"دواتر بوون بە مانگ"

پێشوازی لەو مەچەکە بڕراوانەی

خرانە تەندورەکانی خەلیفە ژنەوە

"دواتر بوون بە قەڵبەزە"

پێشوازی لەو پەنجە قرتاوانەی

کران بە دەنکە تەزبیحی ئیمام

"دواتر بوون بە پەلکە گیا"

پێشوازی لەو لۆلاقانەی خرانە ژێر تەختی شاهان و
"دواتر بوون بە دارستان"
دیسانەوە ئاوابوونە
ئەی"ناهید"ی ئەو دیو پەنجەرەی غوربەت و سامالّی رۆح!
ئاوابوونە.. دیسانەوە خۆرنشینی
سەری من و.. دابڕان و جویٚ بوونەوەی
نێوان جەستەو گیانی منە.
پێك گەیشتنەوەی مەرگ و دووکەڵ زریکەو خۆڵەمێشی
ناو ئەنفالی یەکەمین و دەیەمین و سەدەمینە..
پێك گەیشتنەوەی خاچەکانە.
پێك گەیشتنەوەی ماچ و مووچی زامەکانە.
پێك گەیشتنەوەی دووڕییانی هەموو هەموو مەزدەکانە.
تێك ئالآنی پرچی ژان دارك و کاکۆڵی عیساکانە.
تێك ئالآنی ڕیشی حەللاج و مام وەیسی گەرمییانە.
ئاوا بوونە!.
"1988"ی میلادی
بەرامبەر"2693"ی ئەنفالیی!
1988 هەزار هاوار.. دوای لە دایك بوونی کوڕی خاچ و کوڕی ئازار
1988 هەزار برین.. دوای خوێنی ژان و وێلآشی مریەم.
1988 هەزار قولاپ.. دوای لە دایك بونی تۆڕی یەهودا.
1988 هەزار تۆفان و1988 هەزار بورکان و
1988 هەزار ئاخ لە چرکەیەکدا

ئاخ 1988!
ئەی کێله ساڵی، گۆڕی شیعرو ئەستێران
گۆڕی زەردەخەنەو
گۆڕی گژوگیاو
گۆڕی چاوانم.
ئەی بەرزترین دەنگی نائومێدیم و
ئەی جوانترین شیوەنی شاخانم!
ئاوابوون بوو.
سەد بێشه (خودە) ئەجووڵێ و دێته پێشێ
سەد بێشه پۆستاڵ. سەد بێشه تفەنگ
سەد بێشه بەڵاو.
سەد بێشه تاوان ئەجووڵێ و دێته پێشێ.
ئەمێستاکه بەغدا
دۆڵپای هەشتاو هەشتی ئاسنینه، پێیەکی
لەسەر زاخۆیەو
ئەویتریان لەسەر بەسرەو مێژووی کۆن و
مێژووی تازه قووت ئەدات و تاعوونێکی نێو دەوڵەتیی
خۆشەویستی سەر زەمینه.
پەتایەکی سپی جوانه.
ئایەتێکی ژەهراوییەو
شەرەفێکی پان و پۆڕی ناو کەنداوەو
درۆیەکی (عەرەب)انی پۆڵاییینه.

ئەمێستاکە بەغدا غەرقی
سیحری نەوتەو
کەمەندکێشی گشت جیهان و سەرزەمینە.
ئاوابوون بوو. دیسانەوە ڕۆح نشینی باخچەو بەفر و
ئاوابوونی زەردەخەنەی دەشت و شاخ و سەربڕینی
کێلگەو هەرد بوو. دیسانەوە غەزای جەستەی
من و بەرد بوو. غەزای تازە. غەزای ڕاگوێزانی لەشم.
غەزای شیعرو غەزای جەستەم.
ڕاگوێزانی دەست و پەنجەم.
هەڵکێشانی لاسکی خەون و سەروملی حەرفەکانم و
دەرهێنانی چاوی گوڵ و کوێرکردنی مەلەکانم و
کوشتنی ئاوو منداڵ و هەڵواسینی یادگارم و
بڕینەوەی بەژنی هیواو قەدی خاك و کوژانەوەی
یەك بە یەکی چراکانی ناو دەربەندی ژیانم بوو.
سەد بێشە دووکەڵ ئەجووڵێ و دێتە پێشێ.
سەد بێشە رق، سەد بێشە عەفلەق،
سەد بێشە صدام، سەد بێشە ژەهروو
سەد بێشە ئاسن ئەجووڵێ و دێتە پێشێ،
لێشاو بوو، لێشاو بوو، لێشاو
دیسانەوە لێشاوی پێکەنینی لم..
قاقای تانك و قاقای تۆپ و قاقای مێك و
قاقای مووشەکی زەمین بە زەمین..

قاقای کریملنی مۆسکۆو
قاقای پەیکەری ئازادیی ئەمریکاو
قاقای ڕیشی فیدل کاسترۆو
قاقای مەمکی هاوسەرەکەی کیم ئیل سۆنگ و
قاقای کتێبە سوورەکەی چین و ماچین..
"ئەوەی بیستتان: ئەوە دەنگی برینەکەی سنگی من بوو.
ئەوە هاواری پەیامە یاخی بوەکەی سەری من بوو.
ئەوەی بیستتان: دەنگدانەوەی قەڵای وشەو
قەڵای ڕستەی جەستەی من بوو
ئەوەی بیستتان: ئەوە بوومەلەرزەی خوێن و
دەنگدانەوەی ئەشکەوتەکانی برینم و شریخەی
هەردوو نیگام و چەخماخەی ئاسۆی گەردن و
تەوێڵم بوو"
من کوڕە چاو مەیلەو سەوزێکی هەولێریم
ناوم "عبدالخالق"ە
کوڕی سەفینی کوڕی مەتینی کوڕی هەڵگوردم..
لە ڕەگەزی ئاگرم.
ئەو بەیانییەی لە دایك بووم
دایەنە یەزیدیەکەم
لە پەڕە گوڵاڵەیەکیەوە پێچام و
بردمی بۆ دەربەندی بازییان و
حەوت جار بە دەوری بەردە قارەماندا گێڕامی

حەوت جار لە ئاوباریکی هەڵکێشام.

ئەو بەیانییەی لە دایك بووم

جەمال عیرفان حەوت جار سەری ماچ کردم و

بە قەڵەمە پیرۆزەکەی خۆیشی

حەوت خەتی لەسەر تەختی تەوێڵم کێشا

"بێکەس"یش حەوت سروودی بەسەردا خوێندم.

حەوت پەپوولەی باڵ نارنجیش..

لە سنگی"حەللاج"ەوە هەڵفڕین و

لەسەر دەم و لێوم نیشتنەوە،

من لە ڕەوگەی ئەسپە سوورەکانی ئەیلول بووم

کورڕژنی چیام گەیاندە گوێی دنیا.

من ناوە کۆنەکەی خۆم فڕێ دایە ئاگرەوە..

ئاگریش ناوی نام پشکۆ..

تۆڕی یەقینم چەواشەکرد..

لە هەموو گەشتێکی بەگەرداو و تووشدا

ئەستێرەکانی"مصحەفی ڕەش" پێشم ئەکەوتن..

مەلەك طاوس بە هانامەوە ئەهات.

گومانی جوان هاودەمی تەنیاییم بوو

کەشتیەکەم شپرزەیی بوو..

چارۆکەم دوو دڵیی بوو..

من سەری خۆم پێشکەش بە دوا کتێبی خۆم کرد..

بەو جۆرە بووم بە نووسەری تۆفانێکی نوێ

بووم بە کەڵەگەت ترین قەڵەمی ئازار
بووم بە زەنگ و
بووم بە گوێچکەی دارو بەردو
بووم بە هاواری سەردەم و
بوم بە شەقام و بە ڕووبار.
ئیتر لەو ساتە زیوینەوە
من "مەردۆخ"م
عاشقی چاوە سەوزەکانی "ناهید"ی کچە میدیم
شەیدای باڵای کڵپەی ئەوم..
هەموو رۆژ لە بالکۆنی هەورە بەرزەکانی خۆماندا
ئەچینە بەر بارانێکی سوور..
هەموو شەو ژان ئەگۆڕینەوە.
هەموو شەو مێژوو ئەگۆڕینەوە.
هەموو شەو خۆڵەمێشی جەستەمان ئەگۆڕینەوە.
ئاوێتەی دەنگی یەك ئەبین و
لە یەكتر جوێ ناکرێینەوە.
ئێمە دەرگای ئایندەی سامانڵ و بارانین.
عەشقی سەوزی لە ئەشکەنجەدا هەڵهاتووین.
ئێمە گەردنمان شاخەو
رۆحمان زەریایەو
پەیاممان"رەشەبای" بڵێسە.
ئێمە شمشێر لە خوێنماندا خنکا.

ئێمە ئەو تاقمە سوور پۆشەین
ئەو تاقمە کڵپەو تاقمە سروودو
تاقمە زەردەشتەین
بە مەرگ ژیانمان نووسیەوە.
لە تراویلکەدا ئاومان هەڵهێنجاو
لە"عەدەم"دا "بوون"مان خوێندەوەو
بە نوشوستیدا پشکووتین و
لە وەرزی هەڵوەریندا پشکووتین.
هەموو درەختێك.
نیشانەی خوێنی ئێمەی پێوەیەو
هەموو خاکێك
بە خاچی لەشی ئێمە نەخشاوەو
هەموو زەمانێك پێکەنینی سێدارەکانی ئێمەیان
تێدا دەنگ ئەداتەوەو هەموو پەلکە گیایەکی کوژراو
سینەمان نواڵەیەتی و هەموو چرایەکی کوژراویش
شەوقی باڵگرتووی ناو چاوی کتێبەکانمانن.
منیش.. ئەی مەلەك طاوسی پیرۆز!
سەر ئەکەمەوە بە ژێر باڵە ڕەنگینەکانی تۆدا
لەسەر بەردە نوێژی گاتای نوێ
نوێژی گوناهو یاخیبوونم دائەبەستم!
چ چارەنووسێکی جوان و نازدارەو
چ مردنێکی مەزنە..

چ مەرگێکی ئاڵ و واڵا..
کڵاوکووڕڕەی شیعرێکی بچکۆلانە.. بتوانێ
ئەو هەمو شمشێری بیابانە تووڕە بکاو
خەلیفەکان هەراسانکاو..
دۆڵپای مێژووی عەبدەکانیان بترسێنێ.
ئەی مەلەك طاوسی پیرۆز!
تازە ئەوەڵی شیعرمە!

هەولێر
حوزەیرانی/1993

# هەژین

به باڵەبانی چ ژانێك بتژەنم؟
بتنێم به لالێوی  کام شوانی حەسرەتو گوناهمەوە؟
تا بیستنم به بارانی ئەم دۆزەخە شیرینە
گوڵ گوڵی و تەڕ و پاراو بێ؟
به کام ڕەگی تێر ئاو به ئازار، پڕوپۆت شێت بکەم؟
بۆئەوەی له خاچی ئەم باڵا سوورەی ئاسۆمەوە بئاڵێن؟
له پێدەشتی ئەم گومانە زەردو بەرینەدا
کام ئەسپی یەقین بئاژوێم؟
بۆ ئەوەی بگەمە هەواری خۆڵەمێشت؟

ناتوانم بتژەنمو بتکەم به باڵی ئەفسانەی ڕوانینم
هەتا دڕ به ئابلۆقەی ئەم وەرزە نێزە به دەستانە نەدەم،
ئابلۆقەی: هەوەسە زێڕینەکان.
ئابلۆقەی: دەمامك.
ئابلۆقەی: کتێبە چەکمە لە پێکان.
ئەم بەیانییە دەستی خۆم

له کۆتی شانی خۆم ئازاد کرد و
پێم وت: بچۆ
"با" لەسەر "ئاو" بنووسەرەوە
گەردەلوول بخوێنەرەوە
ساکاریی بکە بە تەمو مژ.
شەوەزەنگ هەڵهێنجە
بۆ هەڵتەکاندنی بورجی سیای  فەرهەنگەکان
بوومەلەرزە بە.
سیحری شیعر بەو سرووشت تەوق کە.
ڕێی نەهاتێ بگرە کە وتیان پیا مەڕۆ
لە ڕواڵەتی بە بریقو باقی گەڵاکان گەڕێو
بەرەو بنج داگەڕێ.

پێم وت: بڕۆ و گوێ مەدەرە "سەر"م.
"سەر"م: ئەو سوڵتانەی تا ئەم چرکەیەش
هەرخۆی لە کفنی تاریکستانەوە پێچاوەو
بە دڵنیاییەکی گەوجانەوە هەتا ئێستەیش
لە نێو تابووتی پەندە بوێرشەکاندا ڕاکشاوە.
بڕیارم دا، ئەم بەیانییە، وا بتژەنم.
بڕیارم دا: دەست بکەمە گەردنی مەحاڵی ئەو دیو سنوورەکان
چوارچێوەکان فەرامۆش کەم
گەردوون بێنمە نێو چاوانمەوە

به باڵی فڕینێكی بێكۆتایی ئەوینت بكەم بە ئاسمان.

پەنجەكانم بەرەڵا كرد:
بۆ ئەوەی شارو شارۆچكەی ئەم "زمانە" بهەژێنن
ئەو دیوارە نەفرەتییانە بڕووخێنن
كە قامووسی تاریكیی و وشەی نۆكەریی دەست لەسەر خەنجەر
سەقامگیری كردوون.
قەڵەم بە دەوری كاغەزدا كەوتە حیلە:
دواتر بوومە یاوەری و بەجووتە
ملی بن بیفە ترسناكەكانی ئەوینمان گرت.
باڵە خوێناوییەكانی قەڵەمم داگیرساند
ئەو باڵانەی وەك باسكی داستانەكان
سرەوتیان بۆ نەبوو.
لەو هاوارانە ئەچوون كە لە دووڕیانی
نەمری و بزربووندا
بە مەحاڵی بەخشندە،
بە ترسی ئێسك سووك،
بە مردنی  بە شۆڕش ڕازاوە،
ئەگەنو ماچیان ئەكەن.
مێژووش خێڵی تۆڵە بوو.
دەمی بڕندەی ئەو یاسا بەردینانە بوو
كە هەموو ڕۆژێ لەسەر سەكۆی خوایەكی دڵڕەق

وەکوو ئاسکێکی پەڕاگەندەو لانەواز، سەریان ئەبڕیم.
بەلاّم من دوای هەموو سەربڕینێ
هەڵئەستامەوە سەرپێ
دیسانەوە ڕووم ئەکردەوە: ڕووگەیەکی تازەی تۆ.
گیانی نوێخوازم.. گیانی گەڕیدەی ڕەجم کراوم
وەکوو "سەمەندەر"
دیسانەوە بە خەونو گۆرانیو سەما
هەڵئەگیرسایەوە، دائەمرکایەوە، هەڵئەگیرسایەوە،
ڕێگەم
ڕێگەی ئەوینی ڕووتو ڕەجاڵم:
بۆ ئاوی تینوو،
بۆ گوڵە گەنمی برسی،
بۆ پرشنگی وێڵی بێ ئەنوا .. ئەکردەوە.
هیوام
رافزییەکی عاشقی بێپشت و پەنایە
سۆزەکانی "حەللاج" ناوکیان بڕیوە.
من سەرەتای ئەو یاخی بوونەی مەرگی خۆم..
سەرەتای ئەو شێت بوونەی دەستم لە بیرە:
کاتێ پەنجەم لەسەر گردۆڵکەیەکی شەوەزەنگی زمان
کەوتە قاسپە قاسپ و خوێندنی ڕەنگاو ڕەنگی
بە گوێچکە نائاشناو بە چاو نامۆ.
لەوساوە ئیتر  یەکەمین هێڵی کازیوە

لە منداڵدانی "ڕستەیەکی نوێدا"
سەری لە قەڵەم جوقاو بە نەفرەت کرا.
ئەوسا منیش نەفرەتم
لە یەکەمین لە دایکبوونی شێوێنراوی خۆم کرد.
بەفری ڕوانینێکی نوا باریوم
پێشکەشی بوونم کرد:
کە لە گەرووی سێدارەکانمدا زابوون.
" ئەو سێدارانەی  هەموو شەوێ
لە ژوورەکەمدا ڕیز ئەبن"
لە فرمێسکی ئەو گوڵە نامۆیانەدا
"کە لە سەرمێزەکەم.. هەڵئەقوولێن"
لەو نیشتمانە گرمۆڵەیەدا
"کە سەری لە گوێ قەبری چرپاکەم ئەلەرزێ"
جارێکی تریش گوڕم بەستەوە
گوڕبەستنەوەی شەیتانێکی دڵنەرمی بازۆڵە ئەستوور.
بێباك بووم، بێدەربەست.. لە چاوی
ئەو وشە- جاسووسانەی
شوێن پێی شەپۆلیان هەڵگرتبووم.
بێباك بووم، بێدەربەست لە داوی
ئەو "زاراوانەی"  بۆ خەیاڵم نرابوونەوە.
ئیتر ئەوسا
"قەناعەت"م وەك بلیتی "یانسیب"ێکی دۆڕاو لەتو پەت کرد.

زەمانم وەك سەعاتە ژەنگ گرتووەکەم شکاند.
بە هەوێنی تیشکی ئەم بەیانییەیش
نانم بۆ خۆشەویستییەکی هەژارو بێ داڵدەو
نیشتمانێکی ئاوارە کردەوە.
ئەو دەستەیش کە بەڵێنی
هەژین و بوومەلەرزەی بە "زمان"داوە
بارانی خەون، لە هەڕەتی تێکشکانو هەرەسدا
لەسەر تەم تەوومان ئەنووسێتەوە.

تەمووزی 1991

# ڕەو ـ بەغدا

ئەمە باهۆزی مردنە؟
یاخود كۆستێكی باڵدارە
بەم بەیانییە خەواڵووە
لە دەربەندی بەهارێكی ترساوەوە
بە نێو تان‌وپۆی هاوارو زریكەمدا
ئەئاژوێت‌و
تیژتر لە چاوی شەیتان‌و
ڕەقتر لە تۆڵەی تەتەرو
مۆنتر لە قاقای هۆلاكۆ
بەرەو كاولاشی ڕووناكیم دائەگەڕێ !

★

ئەمە باهۆزی مردنە؟
یان تەپاوتلی مێژوومە؟
یان خل بوونەوەی دۆزەخەو

لە تەوقەسەری  بەهەشتی
وڵاتێکی بێخواوەندو کەساسەوە
بەرەو ڕۆحم دائەگەڕێ !

★

لەم مەرگە ساردەدا
بە لووزە و
بە لووزە و
شارانم ئەڕژێنە ناو چیاو دۆڵەوەو
وەك خوێنی باخانم کوتو پڕ ئەمەیێن !.
لەم وەرزە وێڵەدا
هەر بە پۆل
هەر بە پۆل
لە شەوی زەردە "با"و
باوەشی بەفرێکی ڕەشپۆشدا
وەك کۆتر
منداڵو
کارژۆلەو
پەلکە گیام
هەڵاڵەو گۆرانییو شیعریشم
ڕەق هەڵدێن !.
لەم مێژووە تاريكو قووڵەدا
بە هێشوو

**به هێشوو**
**گۆی مەمكو گێلاسو**
**تەماشاو هاوارم**
**ئەوەرێن !**

★

**ئەبینن؟! وا دیسان ڕابوردوو**
**بە خۆیو گۆچانی تاریكیی دەستیەوە**
**دێتەوە ناومانو فوو ئەكا**
**لە چرای دیواركۆی ڕۆحمانو**
**سەعاتی هەتاوی دوارۆژمان ئەدزێ !**
**ئەبینن؟!**
**بەغدا داوەو.. كەچی قاچم ئەچێ بۆ لای،**
**بەغدا پەتی سێدارەیەو كەچی ملم ئەچێ بۆ لای.**
**بەغدا پەرداخێ ژەهراوەو**
**كەچی دەستم وا خەریكە هەڵیبگرێ.**
**بەغدا درۆیەكی لووسەو**
**كەچی دەمم وا خەریكە قووتی بدا**
**بەغدا تاتەشۆری گوڵو هەقەو كەچی**
**منیش ئەیكەم**
**بە ئاوێنەو بە ئینجانە!.**
**بەغدا قفڵێكی ژەنگ گرتووی**
**لە زاری عێراق دراوەو**

من ئەمەوێ بە ددانم بیکەمەوە.
بەغدا تۆڕی ماف گرتنەو
قولاپە بۆ زەردەخەنەی
کانیو زنەم
کەچی ماسییە سوورەی دڵم
وا خەریکە پێوەی ببێ !.
دە بڕوانن:
سوورانەوەی هەمان بازنەی چەقۆیە
بە چواردەوری سەرو ملما.
گەڕانەوەی تارمایی هەمان داڵاشی خەلیفەیە.
هاتنەوەی هەمان دۆڵپایە
گرتنەوەی هەمان پەتایە.
دەبارە بوونەوەی هەمان
عیشقی کوێرو فاقەی ڕێیە.
بیست بارە بوونەوەی هەمان
بەڵێنی: شیرو شمشێرو
گەشتی "سمکۆ"و
دوا شێوی سەرای "شنۆ"یە.
چل بارە بوونەوەی هەمان
لە بێژنگدا ئاوهێنانە
شەست بارە بوونەوەی هەمان
ماچی نێوان ژەهرو نانە

**سەد بارە بوونەوەی هەمان**

**دیمەنی ئەو کورسییەیە**

**کە پێکەنینی "قاسملو"ی**

**لەسەر دانیشت !**

**سەد بارە بوونەوەی هەمان دەمامکی جاری جارانە**

**هەمان .. هەمان**

**هەمان تەقینەوەی ئێوارەکەی "حاجی هۆمەران"ە !!**

1992/1991

# دووکەڵی گوڵگرتوو

مەگەر ڕۆح باڵندەی ئەفسانەو.. وڵاتی خەو نییە؟!
بۆ ئەوەی پێت بگەم، بچمە ناو تەلیسمی چاوتەوە
بۆ ئەوەی کاژی "شوێن" فڕێدەم
وەك سەعات
زەمانیش وردو خاش بکەمو لەوپەڕی گەردووندا
هەواری ڕەهایی هەڵبدەم ..
هەنووکە وام لە پشت گەواڵە هەورێکی نارنجیی شیعرەوە
وەستاوم، کاکۆڵم : گزنگەو تەوێڵم: ئاوێنەی داستانو
بەژنم: تەم.
من پەنجەی خواوەندی گومانو دوودڵی پەنجەمەو
سیحری تۆ دەفتەرمەو
بە نووری عەشقێکی دۆزەخییو
بە نووکی ئەستێرەی مەرگی خۆم ئەنووسم.
ئەوەتا بمبینە: تێکەڵم لە گوڵو خۆڵەمێش
لە بەردو لە دارو ، شنەباو، لە باهۆز
ئاوێتەم: ئاوو ئاگرمو خاكو خۆڵ

**شەختەمو ئەسووتێم.**
**دووکەڵمو گوڵ ئەگرم.**
**ڕقێکم نیانو خۆرێکم تاريكو**
**شەوێکم سپیو سۆڵ.**
**گوناهمو لە نوێژی ئەویندا ئەکوژرێم!.**
**مەگەر ڕۆح باڵندەی ئەفسانەو.. وڵاتی خەونییە؟!**

**مەگەر من دەروونم ئاسمانی مەحاڵو کیشوەری ئازارو**
**چاوانم دووباڵی فڕینی**
**نەهێنیی  شەو نییە ؟!**
**لێرەوە "زمان"ێ ئەڕوێنم**
**یەكو سەد نوێ ببڕێ..**
**لەم کێڵگەی خەیاڵو فەرهەنگە شینەدا،**
**بەرد ڕاکاو باڵ بگرێ**
**لە چاوما مانگ بنوێ**
**لەسەرما بارانی ڕەنگاڵە داکاتو**
**لە ژوورما منداڵییم بە شانی**
**ئیستەمدا هەڵگەڕێ**
**مەگەر ڕۆح باڵندەی ئەفسانەو.. وڵاتی خەونییە؟**
**مەگەر تۆ ڕۆحم نیت؟!**

تەمووزی 1992
هەولێر

# له ناو قەفەزێکەوە

خەمم مەستە و خومارە چاوی تەنیاییم
لە گۆشەیەکی شین باوی ، قەفەزینی
توولْ ئاوریشمی ئەم "بارِ"ەدا
نیشتمانێکی ئاوارەم..
لەسەر کورسیی خۆرنشینو یاد دانیشتووم.
"بادە"یەکی ڕەنگ کەلەپۆ بە پەرداخێ
هێور.. هێور، گڕێکی سەوز، بەرئەداتە
پووشووی هەستم.
بادەیەکی ئەرخەوانیی:
"سەر"ی کردووم بە دەریاچەی
بەربارانی ڕەنگاوڕەنگو
بیرەوەریشم بە کەشتی.
لە هەر کوێوە تێم بڕوانی: بەندەرێکی تەماویمو
هەر تەنیایی لەسەر ڕۆخی تەڕی گیانم دائەبەزێو

هەر تەنیاییش لەگەڵ چارۆگەی خەیاڵما
هەتا ئەودیو سنووری ئاو بەڕێ ئەکەم.
لە گۆشەیەکی شین باوی، قەفەزینی تووڵ ئاوریشمی
ئەم بارەدا، هێشووی دارمێوێکی ژانم
بەسەر حەوزی پڕ لە ماسیی زەردو سووری
خەونەکانما، شۆڕ بوومەوە..
لەولایشەوە، دەستە زەردەکانی پاییز
پەنجەی ڕەقەڵە و درێژی، دەنك ..دەنك
لە تەمەنم ئەکەنەوە.
ئا لەم گۆشە شین باوەدا
من گریانێکی گرمۆڵەی تاراوگەم‌و
بادەی کڵپە ئەخۆمەوە!

★ ★ ★

ـ ئێوارەت باش
ـ ئێوارەت باش..
ئەی تاڤگە قژ زەردەکەی "ستۆکهۆڵم"!
ئەی کیژۆڵەی : لە نۆبەرەی یەکەم ڕێواس ناسکترو
لە پوونگەی ناو گوڵەزەردی
لێوار کانیش، بۆن خۆشترم !
"سەر مێزەکەی پاککردەوەو پەرداخێکی تری دانا"
وەك لە خەونێکی ڕابووردووی شیعرەکانما
ئائەم فریشتە سپییەم، دیبێت وایە.

وەکوو زووتر خۆم لە ئەستێرکی پرشنگی
ئەفسووناویی ئەو چاوانە هەڵکێشابێ وایە، لە کوێ ؟!
لە کوێ ؟! لەکوێ ؟!..
لە "باڵەك" بووم، لەبەرچاوی دارستانو
باڵندەکان دابوومە کێو
گرفتاری عەشقی بەرد بووم.
هەگبەیەکی نانو شیعرم بە کۆڵەوە
هەورازێکی دڕم ئەبڕی
ڕەشماڵێکی دوور ئۆخژنی
تێزانە ناو چاوانمەوە.
لەسەر ترۆپك. کزەبایەك دای لەسەرو ملی داغم
خۆم بووم بە مێرگی کازیوەو
حەرفەکانی ناو هەگبەیشم بوون بە شەونم
من گەیشتمە بەر ڕەشماڵو
هەر ئەم پەرییە بوو دەرکەوت
لەو وەختەدا درەختێکی تۆزاویی بووم
ئەویش ئاوێنەی گۆمێکی مەکسو ڕوونو
تیا حەپەسام !
ـ دیارە ماندوویت ؟!
"مێخێکی تری دەوار بووم .. بە عیشقەوە داکوترا بووم،
شیعرێ بووم لاڵ.. چی ئەبینم ؟!"
ویستم بۆ ئەو مانگەشەوە

ببم بە ڕووباری وشە .. نەم ئەتوانی!
ویستم دەنگم، گەرووم.. بکەم بە هێلانەی
ئەو کۆترە شینکانەی چاوی.. نەم ئەتوانی!.
زوبان وەکوو قەڵەمێ بێو لێم ون بووبێ.. بۆی ئەگەڕام !
من ڕەق بوو بووم
بووبووم بەدار قەزوانێکی تری دەوری  هۆبەو ڕەشماڵ.
ـ دیارە ماندوویت.. گەلێ ماندوویت ؟
ـ وەکوو  ئەسپێکی زۆر شەکەت !
"ئەو پێکەنی"
ئەمە پێکەنینی بەفرە ؟! یان کوردستان
ـ تینووت نییە ؟!.. ئەی دۆت ئەوێ ؟!
ـ هێندەی چەمی وشکی دامێنی ئەم شاخە
من تینوومە !
"جارێکی تر پێکەنییەوە"
ئەمە تریقەی کانییە ؟!
یاخود قاقای دار سنەوبەر ؟!
-هۆ.. هۆکاڵێ.. کچێ کاڵێ !
ئەوە مردوویت ؟! وەرە بەلای
ئەو بەرغەلە شێتانەوە!
(دەنگی قرخی پیرەمێردێ
لەودیو هۆبەو ڕەشماڵەوە
مانگی قژ زەردی داچەڵەکان.

**کاسە دۆکەی دایە دەستمو ڕۆی تێپەڕیو**
**وەکوو، هەورێکی سەرگەردان خۆم مامەوە !)**
**ئەمە هەر هەمان قەڵبەزە قژ زەردەکەی**
**لای باڵەکە ؟! جارێکی  دی ئەڕژێتەوە نێو خەونی من ؟!**
**ئەمە هەر هەمان شەمامەی دار هۆنراوەی**
**ئەو جارەیە.. لە ئازارما ئەڕوێتەوە جارێکی تر ؟!**
**ئەمە گمەی هەمان ئەوینی سپییە**
**هاتۆتەوە و کونەشاخی غەریبیمی،**
**کردۆتەوە بە هێلانە؟!**
**ئەمە هەر هەمان کزەبای**
**دەنگو ڕەنگی ئەو جوانەیە**
**لە دەربەندی ئەفسانەوە**
**هاتۆتەوە و ئەداتەوە**
**لە کەڵە پشکۆی ئەم "سەر"ەو**
**ئەمکاتەوە بە بارانی گوڵاڵەی تر؟!**
**ئەمە هەر هەمان شمشاڵە**
**کە زامەکانم ئەیژەنی؟!**
**هەمان هێرۆی سەر لق سپی بەر ڕەشماڵە؟!**
**هەمان کوێستانی گۆرانیی؟!**
**وا لە گۆشەی شین باوەوە**
**لە نێوان تووڵی ئاوریشمی**
**ئەم قەفەزە زیوینەوە**

کڵاو کوڕڕەیە قەڵەمەو .. سەیری ئەکەم.
ئەو پێستە بەفرە ژیلکەیەو
وەردی هۆنراوەی سپییەو
منیش هەر چینەی تیائەکەم، سەیری ئەکەم
وەکوو شەقامی بەرباران
من تەماشام ئێستە تەڕەو
زەردەخەنەی کراس زەردی
"کاڵێ"ی ئێرەی پێدا ئەڕوا.
من ڕەشماڵی خەیاڵێکی فێنکی ئەم گۆشە شینەم
هەموو جارێ لە بوولێڵدا "کاڵێ"ی باڵەك
ئەبینمەوە، بووە بە گوڵ ئەستێرەیەك
بازن لە دەست ، دێتو سەرێکم لێ ئەدا!.
من ئەو باڵندە غەریبەم
ئازادیم وا لەم قەفەزە شین باوەدا.
هەموو ئاسۆی هەڵفڕینم
لە دوو چاوی جوانێکدایەو
هەرچی ڕووبارو زەریایشمە
وان لە تاقە پەرداخێکدا !..

ستۆکهۆڵم 1991

# یەکانە

پرسەی زیندووانەو ، عومری ژنە دیرۆکێکی[1] نەزۆك !.
ئەوەتا لەم گۆڕستانە بە بژوێن و جوانەدا
تاك تاكو بە كۆمەڵ لەسەر گازی پشت پاڵکەوتووینو
چاومان بڕیوەتە چاوی ئەستێرە بەدبەختەکان.
ئەستێرە خۆڵەمێشییەکانی ئاسمان..
ڕەنگمان، دەنگمان، بوونمان: وەك پۆشاکمان
تۆزو گەردی هەزار ساڵەی
بەهەشتێکی ڕووخاو و تالانکراوی
ئەبەدیی لێ نیشتووە !.
لەم گۆڕستانە بە گوڵزارو جوانەدا
کەس خەون نابینیّ!.
کەس لە پێستی بۆگەنکردووی هەڵناگەڕێتەوە.. کەس.
کەس مێشو مەگەزی سەر برینەکانی خۆی
دەرناکات.. کەس !.
تەنانەت کەسیش وڕێنەیەك چییە

[1] دیرۆك: مێژوو.

به ئاینده‌وه.. ناکات!.

ئاینده نییه. نییه، نی!.

قات‌و قڕیی خه‌ون‌و، قات‌و قڕیی خۆشه‌ویستییه!.

حه‌سره‌تمان.. ئاخ.. حه‌سره‌تمان

له کوێرێکی زه‌لیلی ده‌روه‌زه‌که‌ر ئه‌چێ

له نابینایه‌کی بێ ماڵ،

ئێمه له‌گه‌ڵ باپووسکه‌ی[2] "ڕێککه‌وت"دا

په‌یمانێکی تا هه‌تاییمان به‌ستووه !.

چۆن هات‌و له کوێوه؟.. ئێمه لێره‌ین.. له ڕۆژهه‌ڵات

یان له ڕۆژئاواوه.. ئێمه هه‌ر لێره‌ین!

دێت‌و وه‌ك پووش‌و په‌ڵاشی ده‌م گه‌رده‌لوولێکی شێت

وه‌ك تووکه‌سه‌ری ئاوبردوو

وه‌ك لاپه‌ڕه‌ی ڕۆژنامه‌یه‌کی دڕاو

وه‌ك تاکه گۆره‌وییه‌کی کۆن

وه‌ك دووکه‌ڵی جگه‌ره

ئه‌مانفڕێنێ‌و ئه‌مانبات‌و تێکه‌ڵ به بزربوونمان ئه‌کات.

ئای له‌م گه‌مه شێتانه‌یه

ئێمه خۆمان به لقی شکاوی مێژووییه‌که‌وه هه‌ڵواسیوه

ئه‌وه‌تا له‌ره‌له‌رمانه و هه‌ر ساته ناساتێکیش

لقه‌که قرچه‌یه‌کی لێوه دێ!.

وای له‌م سه‌مای ئێسقانه قرچۆکانه

---

[2] باپووسکه: کرێوه‌ی به‌فر به باوه.

وای لەم ژیلەمۆ ساردو
وای لەم بەستەڵەکە گەرمانە !.
من سەرلەبەری ئازارەکانی خۆم پشکنی.
من سەرلەبەری شانازییەکانی خۆم هەڵدایەوە.
من تەواوی مردنەکانی خۆم ژمارد.
بەڵام لە هیچیاندا خۆمم نەدۆزییەوە
لە هیچیاندا سێبەرو هەتاوێکی ڕاستەقینەم نەبوو
قەت... قەت.. قەت
نە سەرەڕمی شەڕی خۆم بوومو
نە دەنووکی کۆتری خۆم.
نە ئەسپ بوومو
نە حیلە بوومو
نە قریوە قریوی سوار
من پاشبەندێکی بێ سەر بووم، پاشبەندێکی گرمۆڵەی
بەر نووکەشەقی قەشەکانی ڕۆژئاواو مەلاکانی ڕۆژهەڵات.
من ئەو دەوەنەم
ئەو دەوەنە گرگنە خۆهەڵکێشەی
کە نەبووم بە دارو
نەبووم بە دارو، نەبووم بە دار !.
بڕواننە ئەم پێستە کەوڵکراوەم، ئاڵای شەقو پەق بووی
شانازیو سەروەریم
چارۆگەی شیتاڵشیتاڵی بەلەمە سەرگەردانەکەم

ئەو گەمیەیەی کە وەکوو ئەستێرەیەکی خوێن لەبەر چۆڕاوی
مەرگ. گەیشتە سەدان بەندەری تەماویی بە ترس
داپۆشراوی، دوای شەڕوشۆڕی بێئامانی پادشاهانو
سوڵتانان و دوای بە هەپروون بوونی خۆم. ئەو بەلەمەی
گەیشتە چینو ماچینو گەیشتە دوا لێواری بە مردن
ڕازاوەی سەرزەمین.
ئەو گەمیەیەی بارکرا لە کەللەسەر و بارکرا
لە خۆڵەمێشی لەشی عاشقانو بارکرا لە ئێسكو پروسکی
سترانەکانو بارکرا لە زێڕو لە گۆی مەمکی کچانو
لە ئەڵماسو لە گەوهەرو بردمەوە بۆ ئاستانەکان،
بۆ تارانو بۆ بابی عالیو.. ئەو بەلەمەی
مێژووی چڕوپڕی شەپۆلە ڕووزەردە بە هەڵپەکانم
ئەگێڕێتەوە. ناو و ناوبانگی گەورەو بریقەداری سەرکەوتنم
بەسەر ژنو منداڵو پیرەمێرددا پێئەبەخشێ !.
ئاوڕ بدەنەوە ئاوڕ لە جوامێریم
من شمشێری هەڵکێشراوی ڕیزی پێشی پێشەوەی
بەهەشتییەکان بووم. لە ژێر ئاسمانی مسینی
هەزاران شارو شارۆچکەدا، وەك یەکانە دڕەکان
جەنگیم. من دەستێکم لەسەر شوورەی چینو
قاچێکم لەسەر پاردەکانی ئیسپانیا جێمان.
لەویانەوە: چەندین مشت، پڕ بە سکم، پڕ بە
گیرفانە گەورەو پانو پۆڕەکانی شەڕواڵەکەم:

دوڕ و یاقووتو گەوهەرم بردەوە بۆ خەلیفەی ئاخر زەمان.
لەمیشیانەوە: پڕ بە ئاوەڵکراسی ژنەکەم:
بۆنخۆشترین شووشە عەترو، مرواریو مەرجانو
زومردیش بۆ خەلیفەژن !.
من  هەمیشە کۆیلەی تاجە خوێناوییە
پرشنگدارەکانی دراوسێ ئازیزەکانم بووم.
لایەنگری چەقۆی سەرگەردنی شاخە ڕووتەڵەکانم..
من هەمیشە
درێژترین باوێشك بووم لە زاری ئەم سەر زەمینەدا !.
ئاخ! من تەنیایەکی بە نەعلەتکراوم لە ژێر
ئەم قوببە سامناکەداو لەبەر هەتاوی سووری
سزای ئەبەدییم، بەردەوامو بەردەوام بە زمانی
چون پەڵاسم زامەکانی خۆم ئەلێسمەوە.
من کوتو مت لە قەلەباچکەیەکی ڕەشی شەل ئەچم.
قەلەباچکەیەکی بەسزمانو تەمەڵ. هێزی قیڕاندنم
تێدا نەماوە. هەموو جار ملم ئەکەم بە ژێر
باڵە ڕووتاوەکانمەوەو بۆ سەدەیەك و دووان و
سیان ئەنووم. من تەلیسمی بێهودەیی،
جادووی بێ هۆشو گۆشیی، ڕێ نوماییم ئەکەن !.
من ئاوەزم[3]
لەسەر مەشقکردنێکی سەختی

[3] ئاوەز: ئەقڵ: بیر.

بیرنەکردنەوەی درێژخایەن ڕاهێناوە.
بە سەبری تەوەزەللی.
بە چاوەڕوانیی بێکۆتایی.
بە پێشوازیی کوتوپڕی مردنی هەمەچەشن
هەمەڕەنگ.. ڕاهاتووم.
خوویەکی نەگۆڕم بە درووونی کفنو،
داتاشینی تاتەشۆرو، هەڵکەندنی
گۆڕی خۆمەوە گرتووە!.
خوویەکی نەگۆڕم بە لەسەر پشت پاڵکەوتنو
ئەبڵەق بوونو تێڕامانی هیچەوە گرتووە.
من ئەتوانم ئەو چاوەی دامخست
سەدەیەك هەڵینەبڕم !.
ئەو قوڕوقەپەی کردم تا دوو سەدەیش
دەم نەکەمەوە ..ئاخ
من تاکە کەسم گوێم لە پرخە پرخی تاسەنەی[4]
خۆمە و خەبەریشم نابێتەوە !
من ئەم هەموو دابو نەریتە پیرۆزانەیشم
لە باپیرە هەرە گەورەکانمەوە بۆ ماوەتەوە
لەو باو و باپیرە سمێڵ بابڕو کەللەشەکەکانەوە
کەللە بەرانانەوە،..
کە جگەرەی دەم باسقەنە[5] درێژەکانیان

[4] تاسەنە: خنکان.
[5] باسقەنە: سەبیل.

**به ئاگری ماڵە سووتاوەکانیان دائەگیرساندو**

**هەرگیزاو هەرگیزیش**

**چاویان نەئەکزایەوە !**

**من بێباکێکی مەزنم !.**

هەولێر

تەموزی/ 1993

# گڕێ

هەر ئەسووتێم
هەتاکوو ئەم چرکە خوێناوییە بەدبەختەیش ،
هەر ئەسووتێم.
لە ڕۆژی زاوزێی گوناهو تۆبەوە، زاوزێی
تاوانو سزاوە، ئەسووتێمو هەڵئەقرچێم و ئەسووتێم.
لە ئەوەڵ وەرزی کەوڵکردنی هەقەنازدارو جوانەکانەوە
ئاه.. لەسەرەتای ئاهو و ناڵەی پەرییەکانو
گرمەژنی، بەرەژانی ، بارانەوە..ئاه
هەر ئەسووتێمو ئەسووتێم..
تا ئەم چرکەیە،
تا ئەم نووزەیە.
تا ئەم کڕووزەیە.
لە ژێر ئەم ئاسمانە گرژەدا و لە ژێر ئەم گومەزی ترسەدا
من و جەللادەکەم، هەردووکمان بێ وێنەین.
لە وێنەمان نەبووەو نییەو نایشبێ
منو جەللادەکەم، جەللادە هۆگرەکەم

هۆگر بەسەرە ڕووتاوەکەم.

هۆگر بە ئێسقانە سپییەکانم.

هۆگر بە خوێنە ڕۆشنەکەم.

لەم جوگرافیا خڕەدا

لەم مێژووە درێژەدا

لەم سیاسەتە بێشکڵەدا،

منو جەللادەکەم

کەسمان هاوڕێی

وەك خۆمانمان بۆ نادۆزرێتەوە

کەسمان

نە ئەو بۆ شمشێرەکەی و نە من بۆ گەردنم.

نە ئەو بۆ قولاپە بریسکەدارەکانیو

نە من بۆ ماسییە ڕەشەکانم.

نە ئەو بۆ ئاگرە شکۆدارەکانیو

نە من بۆ بەهەشتە بێ ناونیشانەکەم

نە ئەو بۆ دێوجامە ڕەنگینەکانیو

نە من بۆ قەفەزە نەخشینەکانم

نە ئەو بۆ دیوارە ئەستوورەکانیو

نە من بۆ چاوە پەڕاگەندەکانم

لە وێنەمان نەبووە و نییەو نایشبێ

کەسمان لە وێنەی یەکتر بۆ نابینرێتەوە

کەس
کەس
کەس !
نە جەللادێکی مەزن و خوێن ساردی وەکوو ئەو هەیەو
نە قوربانییەکی جوانی دەم بە پێکەنینی لەتو پەت کراوی
وەکوو منیش.
منو جەللادەکەم
ئەم جیهانەمان وەکوو گایەکی لە خم خۆرکدا چەقیو
سەرسام کردووە
قیبلەنماکانی ڕامیاریمان چەواشە کردووە..
سەرمان: لە مێژوو، لە دیالێکتیکی مێژوو
لە قانوونی دژەکان، لە یاساکانی گۆڕان و..
سەرمان لە کلێسە و لە مزگەوت و لە کاتژمێری سەعات و
لە بۆچوونەکانی مارکس و لە نزاکانی پاپایش تێکداوە !
ئەوەتا جەللادەکەم، جەللادە هۆگرەکەم، لە ژێر زەمینە
کۆنکرێتییەکانی خۆیدا، " ئەدۆڵف هیتلەر" پەلکێش ئەکاو
هیتلەریش وەك پشیلەیەکی کێوی مۆمیاکراو لەبەردەم
ئازارەکانما ئەوق بووە ئەوق. جەللادە شەیداکەم،
کڵاوە قووچەکەی "جەنگیزخان"ی پڕ کردووە لە :
داهێنانی نوێ و شانازییە تازەکانی مردنو جۆری مردن،
لە دنیا نەبینراوەکانی دووکەڵ و خۆڵەمێش لە ئەشکەنجەی
تەڕو پاراو، لە فڕو فێڵی دەم بە گوڵ، لە کوشتاری

نەوازە، لە خاپوور کردنی بێ دەنگ ، لە پرسەی
سەوز و سوور، لە مەرگی موفاجاتی خێراتر لە ئەسپی
بۆراق، ئەوەتا منیش:
بە پارچەی پچڕ پچڕی ئاڵ و والآی جەستەم.
بەو ڕووبارە وەنەوشەییانەی کە ڕۆژانە لەبەرم ئەڕۆن.
بە واق و ویقی برینە بچکۆلەکانم
بە ڤیژە ڤیژی دارو پەردووی کارەساتەکانم
بە گاشە بەردی سەرشانمو بە هەورازی بێ کۆتاییم
بە لێکترازانی سەر و لەش و گۆشت و جومگەم
ئازادییم وەك شینەشاهۆیەکی خوێن گرتوو
حەپەساندووە !
من و جەللادەکەم
هەرچی پێشبینی، سیاسەتمەداران و ئابووریی ناسانو
CIA و KGB ی و چەپەکانو ڕاستەکانو
ڕۆژنامەنووسانو سەرخۆشی مەیخانەکانو هۆڵی
کۆنگرەکانە هەر هەموویانمان بە درۆ خستنەوە، بەدرۆ !
ئەو .. بەوەی تا ئەم چرکە خوێناوییە  بەدبەختەیش
ئەبوو.. ئەبوو: خۆڵ، کرم، مارووی، جانەوەرە گوناهەکانو
شارە مێرووولە ژەم بووردەکانی دوای هەشتی شوبات !.
مشكو جرجو گۆڕهەڵکەنە هەژارەکان.. هەموو .. هەموو
دەمیان تێبژەندایەو کەچی تا ئێستەیش
تا ئەم چرکە خوێناوییە  بەدبەختەیش..

ئاخ

هەر .. ماوە، ئاخ!

منیش بەوەی

ئەبوو لەسەر شانی زیوینی (داد)ەوە

ئەستێرەم دابگرتایە و بەژنی ئەم مێژووەم

لە پشتکۆوە هەتا لەك

لە پەلکە گیاو لە گوڵەباخو لە گوڵە گەنمو

لە کازیوەی بەیانەوە بپێچایە

بەڵام تا ئەم چرکە خوێناوییە بەدبەختەیش

هەر بەسەر: وەرینو

هەر بەسەر: سووتانو

هەر بەسەر: ژەهرو

هەر بەسەر دووکەڵدا دابەش ئەبم!

تۆ بڵێی جەللادەکەم "نوح" پێغەمبەر

تەمەنی درێژی خۆی پێ بەخشیبێ؟!

تۆ بڵێی منیش.. منی هەوێنی ئازاریش

تا هەتایە هەر میراتگری

خاچە جوانەکەی عیسا پێغەمبەر بم ؟!

ئێوەش !

ئەی جێ نیشتەکانی پایتەختی تاعوونو شاری فەلاکەت!

ئەی ئەوانەی بەردەوام

له کەرنەڤاڵی مردنی ڕەنگاو ڕەنگی خۆتان ورد ئەبنەوەو
لەسەر لێواری خەرەندێکی قووڵیش دیلانێ ئەکەن
تانەو تەشەر لە برینە سەرکەشەکانی من ئەدەن !
گازندەیش لە خوێنی خەواڵووی خۆتان ئەکەن
ئەی هاووڵاتیانی مەملەکەتی نانی گریاو و
"کۆماری ترس"!
من عومری درێژی جەللادەکەم
لە ئەفسانەی وەنەوزی ئێوەو
لە گۆڕستانی بێ دەنگیتاندا ئەبینم!
ئۆباڵی ئەو تەمەنە لە ئەستۆی زەردی ترسنۆکی و
لە ڕازی بوونی کۆتو زنجیری ڕۆژگارتاندایە.
لە خەونی زڕو نەزۆکتاندایە.
لە ڤایلبوونی برسێتیو
لە بەستەڵەکی ئارامتاندایە.
ئێوەش!
ئەی ئەفسەر و دەرەجەدارانی
شانو ملو سەرسنگ پڕ لە:
نیشانەو مەدالییا نەفرەتییەکانی کوردستان:
پڕ لە: ئەستێرە کوێر و بەدبەختەکانی!
ئێرانو کوێت!
ئەی کەڵەشێر ڕوکنەکان!
ئەی سوپای ـ باسل ـ!

بەرانبەر مریشکە جانەوەرەکانمان‌و
بەرانبەر منداڵە دڕندەکانمان‌و
بەرانبەر ژنە وەحشییەکانمان!
بێ وێنەیی جەللادەکەم‌و تەمەنی درێژی شمشێرەکەی
لەسەر چەپۆکان و حیلەی لە ناکاوی
غیرەتە ئەسپی ئێوە وەستابوو
بەڵام، ئۆە! "بەداخیشەوە نا"
ئەو غیرەتە گوێ تەپانە هەرزوو لە کەلاوەکانی
کوردستانداو لەسەر نوێڵکی قەراغ زۆنگاوەکان
سەگ خواردنی
سەگ خواردنی
سەگ!

هەولێر
تەمووزی / 1993

# هەتاو

**بۆ هاوڕێم کاك جەبار فەرمان**

* بۆ هەموو ئەو جوامێرانەی کە پێشمەرگەی گەورەترین داستانی ڕاپەڕین بوون لە ڕامالینی مێردەزمەکانی تاریکیو عەقڵی چەق بەستوودا، ئەوانەی بوون بە هەتاوی ئازادیمان و شەهیدانیشمان بە شەفەقی سەرکەوتن.

**لەو شەوەدا**
**ئێوە بەوری .. باوبۆران بوون؟**
**یان ئەسپی گڕ ؟**
**دارستانی زەنگ بەدەست بوون ؟**
**یان چریکەی گەرووی چیا؟**
**کە کەوتنە ڕێ ؟**
**لەو شەوەدا ..**
**هەر لەیەکەم پەڵە هەوری سۆراخەوە**
**هەر لە یەکەم بازرەقەوە:**
**حیلەی شاخو**
**هاژەی مێژوو**

گڤەی زامو

گرمە گرمی گۆڕستانی شەهیدانو

بارانی شیعری ئێمەتان لەگەڵدا بوو!

لەو شەوەدا ..

کە کەوتنە ڕێو

ڕیز لە دوای ڕیز

سەروملتان بوو بە چرا

هەر لە یەکەم چەخماخەوە..

هەر لە یەکەم دارژانی هەڵاڵەکانی جەستەوە

تیرێژی چاوەکانمان و تیشکی خوێنو

شەبەقی ڕۆحی ئێمەتان لەگەڵدا بوو!..

لەگەڵ باڵاتانا.. درەخت

لەگەڵ پەنجەتانا .. قەڵەم

لەگەڵ گوللەتانا .. وشە

لەگەڵ باهۆزی قاچتانا

سروودی دەغڵو گۆرانی

بەفرو ژنی

ئەم وڵاتە سپییەتان لەگەڵدا بوو.

★

لەو شەوەدا

کە دار هەناری بەژنتان

بەسەر پشتی ترسو بیمو بەردا سەرکەوت

دوورو نزیك
وەك گوڵ ئەستێرەو ئاگری شوان
دڵۆپ
دڵۆپ
خوێنی "سوڵتان" ورشەو پرشەی
ئەدا لە چاوی چەکتانو
ڕەوەز ، ڕەوەز
پێشتان ئەکەوت.
لەو شەوەدا
دەستەکانی  "عبدالخالق"
وەك گوڵ ئەستێرەو ئاگری شوان
دڵۆپ
دڵۆپ
خوێنی "سوڵتان" ورشەو پرشەی
ئەدا لە چاوی چەکتانو
ڕەوەز، ڕەوەز
پێشتان ئەکەوت.
لەو شەوەدا
دەستەکانی "عبدالخالق"
باسکی هەورو باڕێزە بوون
نزیكو دوور
وەکوو بریسکەی شەپۆلی بەر خۆرنشین

يان پڕيشكێكی ئاگرين
كۆتره سوورەی كتێبەكەی شەقژنی بوو
دەشت له دوای دەشت
بەرد له دوای بەرد
پێشتان ئەكەوت
لەو شەوەدا
سەری "قاسملو" بۆ ئێوه
مانگه شەوبوو
سنگی "ڕانييه" ئەستێركی
گوڵەباخ و
گۆمی پێنج مانگی خنكاو بوو
بۆ سبەينێش
لەو "سەر"ەوەو
لەو سنگەوەو، لەو گۆمەوه
گوێمان لێبوو
وژەوژی مێژوويەكی تازه ئەهات
"دووهەم بەهاری ڕاپەڕين"
كازيوەی گوڵ و كانيی بوو
هات و هەڵهات !.

★

تاريكيی ڕيشی درێژی
ئەئاڵاندە: ملی شيعرم.

ملی گوڵم.

ملی ژنم،

سەدەی بەردیین بە تەورەوە گەڕبۆوە

"سوڵتان سەلیم" هەر بەهەمان عەمامەوە

"سوڵتان موراد" هەمان جبەی لەبەردا بوو

هەمان فەتوا بۆ کوشتنی سەربەستیم‌و

هەمان شمشێر بە دەستەوەو

خوێنی منیش ئاوی سووری دەسنوێژی بوو!.

تاریکیی ڕیشی درێژی

بەردابۆوە سەر پەنجەرەم

بە زامدارییی

هەتاوو

ماچ‌و

جریوە

ئەگەیشتنە  ناو ژوورەکەم.

ڕیشی درێژیی تاریکیی.. جەندرمە بوو

بەسەرسەری قەڵەممەوە ڕائەوەستا

بەسەر سەری.. خەیاڵمەوە

بەسەر سەری.. ڕەنگەکانی جل‌و بەرگ‌و پێڵاومەوە

بەسەر سەری.. ئاوێنەوە، پەرداخەوە، شاییمەوە

بەسەر سەری.. پێکەنین‌و جوانیمەوە

بەسەر سەری.. سەماكانی
جەژنی لە دایك بوونمەوە،
ڕیشی درێژی تاریكیی
جەندرمە بوو، پاسەوان بوو
بەر باخەڵی وشەكانی ئەپشكنیم
بۆ سووراوی لێوی شیعرو
كلی چاوو، سەر ڕوومەتو
بۆ گۆرەوی كورتو شانەو بۆ "ماسكارا" و
بۆ "شانتۆڵ"ی دەزگیرانەكەم ئەگەڕا..
ڕیشی درێژی تاریكیی..
بە زۆر لەچكی بە گوڵاڵەی مێژووم ئەكرد.
عەبای ئەدا بەسەر مانگدا.
پاوپووزی شاری ئەبڕی.
چاویلكەی (بێكەس)ی ئەشكاند.
شیعری خەیامی ئەڕشتو
بەستەو گۆرانیی ئەكوشتو
سەد جەڵدەی ئەدا لە عەشقو
هونەریش بۆ چینی دیوار!.

★

تەوری ڕیشدار
هاتنە ناوبێشەی ئێمەوە.
هاتن دار بەڕووی هەتاوی

دیرۆکی سەوز ببڕنەوە.
هاتن سەر لەنوێ قەڵەمی
"شەرەفکەندی"و
جارێکی تر کتێبەکەی "عبدالخالق" بکوژنەوە.
لە پڕ خوێنی شەهیدستانی هەژدە ساڵ
بوو بە کێوێکی قرمزیو
فوارە.. فوارە هەستایە پیان.
لەو شەوەدا کێوی مێژوو گڕی گرتو
دەوری بەردو
عەقڵی بەردو
شمشێری دەست نەیارانی
ژنو شیعری
کرد بە زوخاڵ!.

★

هاوڕێیان! لەبیرتانە..
زەمانێ بوو دەوارێك بووین تاقو تەنیا
لەناو زوقما وەك باڵمان خەم ئەیبەستو
ڕۆژ ژمێرێ بووین بێکەسو
قەڵەمێك بووین بێ کڵاو و
تفەنگێك بووین بێ هەناو و
تایپێك بووین دەست لەجێچووا.
چادرێ بووین وەك کوردستان تاقو تەنیا

**ئێمە گوڵێکی هەتاومان**

**لە بەرۆکی دوا ڕۆژ ئەدا!.**

**هاوڕێیان!**

**نەهێنیی سەوزێتیی ئێمە لەوەدایە:**

**نە ڕەگەکانی بەستەڵەك**

**دەستو پێی تیشکمان ئەبەستێو**

**نە گوڵجاڕی لوتکەکانی سەرکەوتنیش**

**ئەمانخاتە سەر دوو باڵی**

**سیمرخێکی لەخۆبایی !.**

هەولێر

کانوونی دووەمی 1994

* سەرەتای ناسینو هاوڕێیەتیو تێکەڵیم لەگەڵ کاك جەبار فەرماندا بۆ ساڵانی 1984–1986 ، سەردەمی ژیانی پێشمەرگایەتیو خەباتی نێو شاخو داخ ئەگەڕێتەوە. ئەو کاتە ئەو لە سەنگەری ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕژێمی دیکتاتۆریدا ئەجەنگیو ئێمەیش لە ڕاگەیاندنی شۆڕشی نوێدا کارمان ئەکرد. دیارە دوای ڕاپەڕینو دروستبوونی پەرلەمانو دامەزراندنی حکوومەتی هەرێمی کوردستانیش ئەو دۆستایەتیو پەیوەندییە درێژەی هەبووەو تا ئێستەیش، بەڵام ئەو ڕۆژانەی کە لە هەموو کاتێکی تر زیاتر هەستم بە بەهێزبوونو بە چڕبوونەوەو شەوقدانەوەی ئەو پەیوەندیو هاوڕێیەتییە کردبێ، ئەو ڕۆژانە بوو، کە ئەو و پێشمەرگە دلێرەکان لە چوارقوڕنەو ڕانیە و بێتواتەو قەڵادزێدا هێزی تاریکیو کۆنەپەرستییان ڕاو ئەنا، ئەو هێزەی کە پێشتریش فەتوای حەڵاڵکردنی خوێنی منیان دەرکردبوو، بۆیە شیعری هەتاویش لەو ساماڵی سەرکەوتنە گەورانەدا لەدایك بوو!.

# کۆتایی داستانێ

"بۆ شەهید غەریب هەڵەدنی"

دژوار  ژیاو سانا  کوژرا.
یەك لە دوای یەك
بەناو زنجیرە دۆزەخو گەلیی خوێنو
مێژوویەکی بەردەڵانو
کاروانسەرای ترسو بیمدا
بەناو مردنێکی چڕدا
ڕۆی تێپەڕی و لەو سەرەوە
وەك هەتاوێکی کاکۆڵ سوور
هاتە دەرێ.
یەك لە دوای یەك
چووە گەرووی مەحاڵەوە.
چووە قوڕگی ئەژدیهاوە.
چووە گێژەنی ژەهرەوەو
چووە ناو سکی بەردەوەو
لەو سەرەوە

وەك گژوگیای دەم بەخەندە

هاتە دەرێ.

سەخت ژیاو

ئاسان كوژرا.

یەك لە دوای یەك

خۆی كرد بەناو

كونەدارو كونە گورگو

كونە مەرگاو

توونی باباو ئاوی ئاموونی ئەنفالو

دوای ئەنفالی هەمووی بڕیو

دیسانەوە لەو سەرەوە

وەك گەرداوێكی تەوێڵ سەوز

هاتە دەرێ.

دژوار ژیاو

سانا كوژرا!

بەرد ئەزانێ.. پیرەمەگروون كۆڵی دابوو.

"با" ئەزانێ.. ئەژنۆی چەرماوەند ئەلەرزی.

خۆر ئەزانێ.. هەتاو لە ترسا  خزابووە ئەشكەوتەوە.

عەرد ئەزانێ..هەر لە ترسان

باران لێزمەی تەرك كرد.

هەور چەخماخەی تەرك كرد.

ڕەشەبا گڤەی تەرك كرد.

کێوان دەستیان بە کلاوی لوتکەوە گرت
ـ هەتا بەعس  نەیفڕێنێ ـ
لەو دەمەداو لەبەر باهۆزی ئەنفالدا
کێ ڕای نەکرد ؟!
لەو دەمەدا منیش سەرم لە ئەوروپاو
کلکی شیعرم لە ئێراندا تۆزی ئەکرد !
لەو دەمەدا.. ئەو دەستانەی ساتە وەختێ
لە دەستەکانی کوردستان نەبوونەوە
لە عیشقی ئاوو منداڵو
لە عیشقی مەلو درەختو
لە عیشقی خاکو هەژاران
چرکەیەك جوێ نەبوونەوە
دەستەکانی "غەریبی هەڵەدنی" بوون!.
دژوار ژیا و
سانا کوژرا !.
تۆڕی صەدام.. هەرچەندی کرد
ئەم  ورەیەی بۆ نەگیرا.
ئاگری صەدام.. هەرچەندی کرد
ئەم ئەوینەی پێ نەسووتا.
ژەهری صەدام.. هەرچەندی کرد
ئەم ڕووبارەی پێ نەخنکا
گوللەی صەدام... هەرچەندی کرد

ئەم پلنگەی بۆ نەپێکرا.

کەچی ڕۆژێ

ڕۆژێکی هێمن و سادە

ڕۆژێکی خۆش

بێتەم، بێ ژەهر، بێ صەدام

لە تەختایی  ئازادیدا

لە نەرمانیی ئازادیدا

چەقۆیەکی دەستی خۆمان

چەقۆیەکی ماڵی خۆمان

بە سانایی سەری بڕی

تف

لە خۆمان !!

هەولێر

کۆتایی تەمووزی1993

# هەناسە ساردەکانی گەرمییان!

-1-

ئەگەر بەیانییەك  ڕێکەوت
ئا لەم دەشتەی گەرمییاندا
کەڵێکتان بینی، سەرسنگ سوور،
چوارپەل سپی،
چاو ئاگرین.
هیچ دەنگ مەکەن، دەسیش بگرن بە سنگەوە.
ئەوە: "حەمەڕەشە" کەی  خۆمانەو
بەسەردانێ هاتۆتەوە بۆ لای "حەمرین"!.
ئەگەر نیوەڕۆیەك ڕێکەوت
ئا لەم دەشتەی گەرمییاندا بازێکتان بینی، گەردن سەوز،
باڵ خوێناوی،
پەڕ ئاڵۆزکاو..
بازێکی بێ ماڵو هەوار
هیچ دەنگ مەکەن.. ڕێگە بەردەن

ئەوە "مەلا ئەحمەد"ی خۆمانەو
بە سەردانێ هاتۆتەوە بۆ لای هەردوو
جووتە خوشكی كفریو كەلار!
ئەگەر ئێوارەیەك ڕێكەوت
ئەسپێكتان بینی تەوێڵی كلێپەدارو
یاڵ نارنجیو
كەللە بچووك.
هیچ دەنگ مەكەن، دڵتان خۆش بێ
ئەوە "مامە ڕیشە"كەی خۆمانەو
بەسەردانێ هاتۆتەوە بۆ لای كەركووك!.

-2-

هەموو ساڵێ لە ناوەڕاستی شوباتدا
لە ناوەڕاستی سەرمادا
لە پانزەوە هەتا هەژدە
بانگی شێوان، وەكوو دەربەندی باسەڕەو دڵی كێوان
دەرگای حەوشەی ماڵەكانتان بكەنەوە.
لە ژوورەوە تەدارەكی جەژنێ ڕێكخەن:
چرا هەڵكەن، ئاگر خۆشكەن ، چایی دەمكەن
ئالای سەوزو سوور هەڵواسن،
سەرینی پەڕ ، جاجمی نوێ، پێخەفی تازە دەربێنن

مۆمو بوغورد  بسووتێنن.
تاقە کەڵەباب سەر بڕن.
بۆ میوانێ لەش خۆڵاویی‌و
برسی برسی ئەگاتە جێ
بۆ عاشقێ لە ئەشکەوتی  "داری خلە"[1]ی
ئەنفالەوە کەوتۆتە ڕێ
بۆ ئازیزێ وەکوو کلووی بەفر و پرشنگ
وەکوو کزەی دەم سیروان‌و
بۆنی گڵی باوە شاسوار
لەم ناوەدا پەیدا ئەبێ
هەموو ساڵێ لە ناوەڕاستی سەرمادا
لە پانزەوە هەتا هەژدە
دەرگاکانتان بکەنەوەو چاوەڕوان بن
"مەلا ئەحمەد" ئەگاتە جێ!.

-3-

ئەی کیژانی ڕەنگ ڕێحانەیی
ئەم مەڵبەندە

---

[1] ئەشکەوتەکەی داری خلە: ئەکەوێتە ناوچەی کەلارەوە. لە ڕۆژگاری تاریکی ئەنفالدا، دەستەیەك پێشمەرگەی قارەمان بەڕێبەرێتی مەلا ئەحمەدی جوامێر بۆ کاری پارتیزانی لەم دەڤەرەدا مابوونەوە. لە شەوێکی زستانی 1990 دا ڕێیان ئەکەوێتە ئەم ئەشکەوتەو لەنیوە شەودا ئەشکەوتەکەیان بە سەردا ئەڕوخێ و هەر حەوتیان پێکەوە شەهید ئەبن.

ئەگەر چوون بۆ ڕێواسانو
پیشۆکانو سێوی بن عەرد
هەر بنەیەك لە شوێنێکدا
ژمارەیان گەیشتە حەوت
بۆ موفەڕکی سەبری ئەوین هەڵیان بگرن.
ئەی کیژانی ڕەنگ ڕێحانە!
ئەو "حەوت"انە:
حەوت لەشەکەی
حەوت براکەی
ئەشکەوتەکەی
"داری خلە"ی گەرمییانە!.

-4-

سەرم گردی شەهیدانەو
قژم ئاپورەی ژنانی عەبا بەسەر
سەرم گردی شەهیدانەو
هەر شوێنێکی هەڵبەنەوە
لەمپەڕەوە هەتا ئەوپەڕ:
پەنجەی مانگێ یان دەمو لێوی کانییەك
یان گەردنی قەسیدەیەك
یان کاکۆڵی گوڵە گەنمی منداڵێکی
گەرمییانی لێ دێتە دەر !.

-5-

**ئەوە "مانگ"ە یاخود سەری "حەمە ڕەش"ە ؟**

**لە بانێژەی ئەو هەورەوە**

**ئەڕوانێتە خوێنی "حەمرین" ؟!**

**ئەوە ڕیشاڵ ڕیشاڵی ئازاری ناو کەرکووکە؟**

**یاخود ڕیشی مامە ڕیشە**

**وەکوو لاولاو ئالاوەتە،**

**دار فرمێسکێکی "خانەقین"؟!**

**ئەوە حەوت پەڕەی گوڵێکی ناو ئەنفالە؟**

**وەکوو حەوت  دەنکە گێلاسی چاوی کەلار**

**لەسەر مێژوومان ڕووان؟!**

**یان حەوت پەنجەی  حەوت ئەستێرەی**

**ئەشکەوتەکەی داری خلەی ژمارە چوار ؟!**

بەهاری
1994

# ماڵ

ئەو پەنجەرەیە  دامەخەن!
نەبادا گەر لێرە نەبووم
لە پڕێکدا ڕۆژێ.. شەوێ
لە سەردانێکی ناوەختا
"باد"ی خۆش مروری نالی
بە کەنەفتی
لەبەردەمی ژوورەکەمدا پەیدا بێت‌و
دابمێنێ‌و چاو بگێڕێ‌و ڕێگەی نەبێت بێتە ژووری !.

با ئەو قەڵەم‌و کاغەزە
هەر لەسەر ئەم
مێزە بن‌و لایان مەبەن!
ئەمە دنیایە و نەبادا لێرە نەبووم
لە ناکاودا، خەیاڵێکی ئاونگاویی

"مەولەوی" بێتە ژوورەوەو
بییەوێ لەبەر چراوگی
گریاناویی مانگەشەوێ
بۆ چاوەکانی هەڵەبجە
شیعرێکی تازە بنووسێ!
با ئەو شووشەی بادەیە هەر
لە جێی خۆی بێو هەڵنەگیرێ
نەبادا گەر لێرە نەبووم
ئێوارەیەك، لە ناکاودا
(بێکەس) خۆی بکا بە ماڵدا.
با هەر لەسەر ئەم کورسییە
دابنیشێو بەدەم خوێندنەوەی شیعرەوە
قوم قوم خەمی سپیو خەستی
بێکەسییەکەی خۆی بنۆشێ!.

با ئەو گیتارەیش هەر لەسەر
چرپاکەم بێ
هیچ کەس دەستی تێوە نەدا
نەبادا گەر لێرە نەبووم
لە ناکاودا
"ئازاد هەورامی" بێ بۆ لام
با بیبینێو هەڵی بگرێو

تا دێمەوە هەر خۆی تەنیا
ئاوازە زۆر غەمبارەکەی
"مرابیوس"ی پێ لێدا!

با ئەو کتێبەی "حەللاج"یش
دیار بێو هەروا لەسەر ئەم تاقە بێ
نەبادا گەر لێرە نەبووم
لە ناکاودا
"عبدالخالق" بێتە ماڵێ
با ببینێو تا دێمەوە
تەماشایکا و چاوەکانی
لە دێڕی خوێندا نوقوم کا!

با وێنەی ئەو منداڵانەیش
کەروێشکە بێ لانەکانی شاری کەرکووك
لەم دیوارە نەکرێتەوە
نەبادا من لێرە نەبمو لە بەغداوە
لە پڕ "فەرەیدون عەلی ئەمین" بێتەوەو
نەیانبینێو چیرۆکێکی
ئێسك سووکی منداڵانمان لە کیس بچێ!
با ئەم دوو سێ ڕۆژەیش دەرگای
حەوشەکەمان لەسەر پشت بێ

**نەبادا گەر لێرە نەبووین**

**ـ لەم جەژنی ڕاپەڕینەدا-**

**لە شەهیدانی نەناسراو**

**لە شەهیدانی بێماڵو بێ ناونیشان**

**گەڕانەوەو ڕێیان کەوتە ئەم کۆڵانە**

**با بیبینن و گیر نەخۆنو**

**دەم بە خەندەو**

**خوێن بە خەندە**

**یەکە یەکە بێنە ژووری!**

مارتی 1994

# یادداشتی کۆترە کێوییەك

له ناو ڕیشی  دەوەنێکدا خۆم شاردەوەو
گوێم گرت لە بەردی ڕەوەزێ
تاقە خەمی بەرد ئەوەبوو:
ئێستەو دوارِۆژ
لەو شاخەدا هیچ ڕەوەزە بەردێ نەبێ
لە ئاست ئەودا سەر هەڵبڕێو
لەو بەرزترا
لە بەرۆکی ئێوارەدا خۆم شاردەوەو
گوێم گرت لە جۆگەلە ئاوێ
تاقە خەمی ئاو ئەوەبوو:
ئەم کەی ئەبێ بە لافاوێو
لەم وەرزەدا
ڕۆژێ زووتر
جۆگەکانی تر قووت ئەدا!

لەناو قژی تەم و مژدا خۆم شاردەوەو

گوێم گرت لە ڕازی بولبولێ:

تاقە خەمی ئەم بولبولەیش هەر ئەوەبوو

لە وڵاتی ڕەنگاوڕەنگی گۆرانیدا

ئێستەو دواتر

هەرگیز دەنگێ پەیدا نەبێ

لەخۆی خۆشتر!

لە پشت ملی کەنتۆرێکدا خۆم شاردەوەو

گوێم گرت لە ئاوێنەی جوانێ

تاقە خەمی ئاوێنەکە هەر ئەوە بوو:

کوێر بێ و بشکێ و

وردو خاش بێ و

بەڵام ئەو ڕۆژە نەبینێ

لەبەر ئەودا

لە پەریخانی شاژنی

ژنێکی تر هەبێ جوانتر!

لە دواییدا، ویستم بچمە پاڵ سنووقە فیشەکێک و

لە سێبەریا خۆم حەشاردەم..

گوێ لە خوێنی مێژووم بگرم

کە هەر مێژووی خۆم کوشتوویێتی و بۆتان باسکەم!

گوێ لە گەردنی پەڕیوی خۆم ڕابگرم

کە هەر دەستی خۆم پەڕاندی و بۆتان باسکەم!

گویّ لە سێدارەی دەنگی خۆم ..

کە هەر خۆم بووم بە سێدارەی..

گویّ لە زیندانی خەونی خۆم

کە هەر خۆم بووم بە زیندانی و بۆتان باسکەم!

بەڵام تفەنگ..تفەنگ.. تفەنگ..

پێی زانیمو فریا نەکەوتم هەڵفڕم

بە دوو باڵی شکاوەوە..

لە بەردەمی ئەودا کەوتم!.

1995

# بەڵێن

خاتوو چیللەر هەمووساڵێ لە زستاندا
بەڵێن ئەدا بە بەفرو با
ئەمجارەیان دەستەکانی دیاربەکر
بکا بە کۆتەرە داروو
کەرت کەرتیکاو
بیهاوێتە کوورەی ئاگر!.

خاتوو چیللەر هەموو ساڵێ لە بەهاردا
بەڵێن ئەدا بە گژوگیا
ئەمجارەیان سەری دەرسیم بکا بە تاجە گوڵینەی
زرێپۆشو
فڕێی باتە بەر پێی سوپا!
خاتوو چیللەر هەموو ساڵێ لە هاویندا
بەڵێن ئەدا بە دڕك و داڵ
ئەمجارەیان (وان) کوێر بکاو

**خەجو سیامەند نەهێڵێ‌و**

**لەبەرماڵی ئەتاتورکا**

**بیکا بە کەرنەڤاڵی ساڵ !؟**

**خاتوو چیللەر هەموو ساڵێ لە پاییزدا**

**بەڵێن ئەدا بە خەزان‌و گەڵا ڕێزان!**

**سوێند بەسەرە ڕووتاوەکەی "وەتەن" ئەخوا..**

**سوێند بەسەرە بێ ملەکەی عەدالەت‌و حوڕییەت‌و**

**سوێند بەسەرە خوێناوییەکەی ئەستێرەو مانگ..**

**ئەمجارەیان دوا بارەگای دەنگمان بگرێ‌و**

**دوا مێژوومان بووەرێنێ‌و**

**دوا ڕووبارمان بخنکێنێ‌و**

**دوا دۆزەخیش بۆ شاخ داخا!**

**خاتوو چیللەر .. تاقە ژنە**

**سێ مانگ جارێ**

**ساڵی چوار جار**

**لە درۆ پیاوی عەسکەرتار**

**کوڕ و کچی**

**کەڕو کوێر و لاڵی ببێ!!**

1995

# وێنە

وێنەی مەلێکم ئەکێشا:
وشەیەکم کرد بە سەری
نووکی قەڵەم بە دەنووکی
چنگە گڵمتکێ بە لەشی
ژێ بە ملی
دەنکە زەیتوونێ بە دڵی
گیا بەکلکی
بەڵام نەفڕی
تا پەڕەمووچی "ڤان کوخ"م
بۆ نەکرد
بە باڵ !

1991

# مزگێنی

تەنیاییم نارد بە شوێن شەودا
کە هاتەوە لەگەڵ خۆیدا
باوەشێ خەرمانەی: مانگو
سێ جریوەی زەردە خەنەو
هەندێ تریفەی ئەوینی
بۆ هێنا بووم.
هەورم نارد بە شوێن شیعردا
کە هاتەوە لەگەڵ خۆیدا
گوڵدانێکی پڕ لە وشەو
ڕستێ بازنی ناوازەو
چەند ئاخێکی ڕەنگاوڕەنگی
بۆ هێنا بووم.
شیعرم نارد بە شوێن ئاواتا

**که هاتەوە لەگەڵ خۆیدا**

**سێ تاڵ لە قژی ئازادیی و**

**مزگێنییەکی چاو سەوزو**

**چەپکێ ماچی**

**کوردستانێکی بێ (بەعسی)ی**

**بۆ هێنا بووم!**

سلێمانی

مارتی – 1992

# ڕاسپاردە

دوێنێ شەقامێ پێی وتم:
ئەبم بە تابووتی  هەتاو
ئەبم بە کەلەبچەی دەستی گوڵو
ئەبم بە ڕیزە گوێزانی ژێر پێی بەهار
ئەبم بە ڕووباری گڕو
بە خەڵووزی خەونی ئێوە
گەر ڕێ بدەن جارێکی تر
شمشێرەکەی کوڕی "عۆجە"
بێتەوە شار.
لە ماڵەوەیش نان پێی وتم:
ئەبم بە  تەڵاش و بە بەرد
ئەبم بە خۆڵ
ئەبم بە پارووی مانگرتوو
ئەبم بە تیکەی گریاوو
بە قوڕقوشم
بە قوڕگتانا ناچمە خوارێ

**تا چاوێکی  بەعسیانەم  لێوە دیار بێ.**

**ئەمڕۆیش دەفتەرێ پێی وتم:**

**ئەبم بە کفنی قەڵەمو**

**فاقەی حەرفو**

**بە گۆڕستانی گزنگ و**

**بە زیندانی ئینفیرادی بۆ ئەستێرە**

**گەر ڕێ بدەن جارێکی تر**

**کەڵبەکانی قادسییەو**

**قەعقاع بێنەوە بۆ ئێرە !**

1992

# بەندەر

سەدو پێنج کورسیی ڕەنگاوڕەنگ
پەنجای سەوزو
پەنجای زەردو
پێنجی مۆرو
ڕووبە ڕوویشمان :
هەزارو یەك .. کێشەی ڕەش‌و
ترسی تەڵخ‌و
گێژی پرسیار!.
بەڵام هەموو
لە ناو ئەم کەشتیی هۆڵەدا
لەگەڵ سەوڵی زیوینی دەس
بیست‌و پێنج ملیۆن دار بەڕوو
ڕوومان کردۆتە بەندەری
ئایندەیەك

وەکوو گەنم

پرچ زێڕین و

وەکوو ئاشتیش

بەژن سپی !

هەولێر

ئابی 1992

# کلیل و دەرگا

دەرگای گەنم
دەرگای شەکر
دەرگای شاخ و
دەرگای دەشتو
دەرگای زاممان
وەکوو سروودی "ئەی ڕەقیب"
هی ئەو خەڵکەن!.
بەڵام کلیل
هەموو هەموو کلیلەکان
وان لە گیرفانی شەرواڵی
دزە قارەمانەکانی کوردستاندا !!

هەولێر
ئابی 1992

# دز

هەر بەیانییەك  هەڵ ئەسم
لەم ماڵەدا ، شتێ ، ئەندامێكی لەشم
دیار نەماوە:
پەردەی ژووری گوێچكەیەكم
سیمی دەمارێكی دڵم.
كلاوزەڕی ئەژنۆیەكم.
ڕادیۆی قوڕگم.
پەنجەرەی ناو باڵاخانەی سییەكانم.
بەردی مەڕمەڕی ددانم.
تەلی ڕیخۆڵە باریكەم.
دارتەلێكی قاچەكانم.
تا دواجاریش  مرواریی چاوێكیان دزیم.
هەر بەیانییەك هەڵئەسم
لە م ماڵەدا ، شتێ ، ئەندامێكی لەشم
دیار نەماوە

کێ ئەیانباو بۆ کوێوە چوون؟!
ئەمڕۆ شەبەقیی دزم گرت
لەسەر چرپاکەم گرتمن
دزەکانیش، وای کارەسات، دزەکانیش
هەر دە پەنجەی دەسم   دەرچوون!.

1992

# شیعرێکی لاڵ

سەدو هەشتا و دوو هەزار.. خەم

سەدو هەشتا و دوو هەزار.. دەم

سەدو هەشتا و دوو هەزار.. خەو

خەم بە دەنووك گەرمیانی کوناودەر  کرد

کوردستانم بوو بە شمشاڵ

مێژوویشم نای بە لێویەوەو

وەرزی پێنجەمی ئەنفالو

ئەڵلاَوەیسی ڕاگوێزراوی  لێ کەوتە خوار.

ئیتر منیش لەو ڕۆژەوە

شیعرێکم لاڵ

ئیتر منیش لەو کاتەوە

مەملەکەتی خۆڵەمێشو خەونەکانم

بووە بە شەوی گەنمو جۆی

شوێن بزری

هەزاران چاڵ !.

1992

# سیٚ کورسی

کورسیەکەی  بەرگەڵۆ
کورسیەکەی ئەوروپا
کورسیەکەی پەرلەمان
لەسەر یەکەم سەرم بوو بوو
بە چەتری گوڵە کێویلە و
ژووری ژووانی باڵندەو
جۆلانەی خەونی سەردابان.
لەسەر دووەم سەرم بوو بوو
بە سەماگەی نیوەشەوی
لەش‌و لاری شیعری ڕووت‌و
ئەپارتمانی شووشەبەندی ڕەنگاوڕەنگ و
حەوزی مەلەی پەریستان‌و
قەوانی جاز.
لەسەر سێهەم سەرم بووە:

**به بازگەی گومرگی دزیی‌و**

**سایلۆی خاڵیی لە گەنم‌و**

**تەنەکەی نەوتی بەتاڵ و**

**تایەی قاچاغ!**

هەولێر

ئابی 1992

# جیمس جۆیس

سەر ئەوەندەی
گوێزی هیندی.
عەینەکێکی بازنەیی
لەشێك هەر تۆزێ لە قامیش
بە خۆوەتر.
لەو گوێزەدا زەریا ئەژیا.
لە بن عەینەکدا دوو خۆرو
لە قامیشدا سیمفۆنیا!

1992

# بەڵام !

من ئەزانم ئەگەر ئێستە
گوڵە گەنم بێتە قسە .. بێتە دووان
بە خەرمان داخ هەڵ ئەڕێژێ
لە دەست ئێمەی
گەورە کورسی و
گەورە چەك و
گەورە گیرفان..
من ئەزانم لەتاو  هاربوونی نان و ئاو
لەتاو دزی دەستو پەنجە
لەتاو بەرازی سیاسیو
لەتاو قرژاڵی قاچاغچیو
لەتاو  ڕووخساری "موزەوەر"
ئەگەر شەقام  ببزوێت و دەستکاتەوە و
هەڵسێتە پێیان

ڕەنگە درەختمان تێبگرێ
ڕەنگە عەموودمان تێبگرێ
ڕەنگە پەیکەرو پێپلیکە و
چەتری پاس و
ڕەنگە شۆستەمان تێبگرێ
بەڵام من ئەوەیش ئەزانم
ئێستە.. ئێستە
کە بێ دەنگیی گوڵەگەنم و
کە بێ دەنگیی شەقامەکان
بە تەنها هەر
لەبەر چاوانی ئازادیی و
نەهاتنەوەی
ئەژدیهاکە و کوللەی بەغدا و
قاچی بەعسە!

1992

# داری ژاڵە

هەر ئەڵێی  داری ژاڵەیە
بە کراسێکی سوورەوە
لە سووچێکدا ڕاوەستاوە.
ئەمڕۆ ئێرە
سەراپای ئەم "ئەنقەرە"یە
بۆنی چەکمە
بۆنی قەمە
بۆنی ئەتاتورکی لێ دێ!
من سەر بەرەو ژوور بوومەوە
چارەکێك و گەڕامەوە
کراسی سوور
داری ژاڵە
چاوەڕوانیی
دیار نەمابوون

**لە جێگەی ئەو ، ڕۆژنامەکە**

**لەناو خوێنێکی تازەدا**

**(با) پەڕەی هەڵ ئەدایەوە و**

**لە پەناوە**

**چاوی منو شەقامی چۆڵ**

**ئەیخوێندەوە !.**

ئەنقەرە

1992/9/1

# لێره

ئەمشەو لێره:
شاخ شاعیره و
دار قەڵەم و
دەشت کاغەز و
ڕووبار دێڕ و
بەرد نوختەیە و
منیش: نیشانەی سەرسووڕمان !.

هەولێر
ئابی 1992

# له گۆڕستانێكدا

له ژوور سەری گۆڕەكاندا
یەكە یەكە مۆمەكانیان كوژاندەوە
ژنەكانیش وەكوو پۆلە پەڕەسێلكە
بەرەو دامێن‌و ڕووەوشار شۆڕ بوونەوە.
ئێستە گۆڕستان خامۆشە
بە تەنها مۆمێك و دایكێك
لە نێوان دوو  بەردە كێڵدا
بە یەكەوە ئەسووتێن‌و
پێكیشەوە ماونەتەوە.
دایكێك بەهەشتیش ناتوانێ
ڕۆحی شاد كات.
دایكێك نامۆی ناو دایكانە و
غەریبی زامی خۆیەتی ..
دایكێك ئەزانێ كوڕەكەی

له ناو تانكێكدا  كوژراوه
كه ئەژدیها و.. جەهەننەمی
بەعسیانی لەگەڵ خۆیدا
بۆ ئەم مەڵبەندە هێناوە !!

1992

# گفت و گۆیەکی ساکار

لە بازاڕدا

لە مێرد منداڵێکم پرسی

ـ نوقڵت ئەوێ  یان شیعرێکی

ترش‌و شیرین!

-نوقڵ

"کرێکارێك سەری هێنابووە پێشەوە"

"دەم و چاوی هەر لە پەنجەکێشی ئەچوو"

ـ ئەی تۆ  نامیلکەیەکی  سیاسی تازەو گەرم

یان  کولێرەیەك لە دەمی مردوو ساردتر؟

ـ کولێرەیەك.

-ئەی تۆ دایکە ڕەشپۆشەکە؟

ئاگردان‌و نێڵە نێڵی تەندووری ناو

پەیڕەوی هەموو حیزبەکان !

یاخود تەنەکەیەك نەوت؟

**ـ نەوت.. نەوت!**

**دوایی بە هەرسێکیانم وت:**

**نوقڵی تاڵ و**

**سەرمای تاڵ و**

**نانی تاڵو**

**ئاوی تاڵ و**

**یاخود عەزیا و چاوی بەعس و**

**پێکەنینی "ئەبو نەدا" ؟!**

**"وەختێ لێیان ورد بوومەوە"**

**وەکوو برسییەتی گرژ بوون**

**وەکوو بازاڕ سارد بوونەوە و**

**بەدەم ڕۆیشتنەوە وتیان**

**ـ بڵێ مەرگ و زەهری مار و**

**هەر ئەوان نا !**

هەولێر
ئابی 1992

# چاڵ

ماوەیەکە
"گۆڕهەڵکەنە"
هاوڕێمە!.
شەو درەنگان
کە زەویی نووست، ئەگاتە لام
دەست بە کلکیەوە ئەگرم‌و
ئیتر ئەمبا
بەرەو قاقڕ؛
وڵاتی خۆڵ..
کیشوەری لم،
گۆڕهەڵکەنەی تیژتر لە "با"
ئەمبا و ئەمبا
هەتا نزیك باسکی "سعود"
ئەژنۆی "سعود"

لەوێ یەك یەك ئەمباتە سەر:
گۆڕی بە کۆمەڵی: باخ و
گۆڕی خەون و
گۆڕی چاوم و
هەزار
هەزار
هەزار
چاڵی جەرگی "ئەڵلاۆەیسی"و
چاڵی مەمکی "کراس زەردێ"و
چاڵی شیعری سەر بڕدراوم
نیشان ئەدا !.

سلێمانی
مارتی 1992

# خەون

**من ئێستاکە**

**هەموو شەوێ گوڵە گەنم**

**دێتە خەوم**

**ئەمکا بە دەغڵ بۆ خۆیی و**

**بۆ بەیانیی کە هەڵ ئەسم**

**نە ئەو دیارە و**

**نە من دەغڵ و**

**برسیتر بووە تەمەنم !.**

1992

# مەملەکەتی سیحر

لە سەرانسەری خەیاڵما، گەر بگەڕێی
بۆ بستێ سێبەر و هەتاو
بۆ قولانجێ شپرزەیی
بۆ جێ پێیەك لە مێرگی خەم
بۆ تۆزقاڵێ لە ئارام و
بۆ زەرڕەیەك لە پێکەنین
تۆی تیا نەبی ؟!
بەدیی ناکەیت
ئیتر من چۆن
مەملەکەتی سیحری تۆ نیم!.

1992

# سیحر

هاتە ژووریٚ ، لە پڕێکدا
گەمیەی چاوی هەر هەموومان
کەوتە ناو سیحری چاویەوەو
تیا نوقوم  بووین.
- شیعری جوانیش سیحری قەڵەم
وەکوو ئا ئەو شۆخە وایە !.
ئەو وەختەی دێت هەر کوت و پڕ:
ئەتکا بە ماسیی گۆمی خۆی ،
ئەتکا بە ئەڵقەی پەنجەی خۆی
ئەتکا بە باڵندەی بەژنی.
ئەتکا بە سێبەری وشەی
ئەتکا بە ژێی گۆرانیەکەی
ڕەنگە گۆمەکەیش لە (چین) بیٚ
ڕەنگە پەنجەکەیش لە (ئۆسلۆ) و
بەژنیش لە دوورگەی "کریت" و

وشەیش
خەڵکی ئەفریقاو گۆرانییەکەیش
باڵندەی باخی "لاتین" بێ!.

1992/8/9

# شاكير فەتاح

پەیژەیەك بوو  باریك درێژ
هەشتا پله.
سمۆرەی كورتە چیرۆكی ئەم زمانە
بەسەر پلەی ئەودا سەركەوت.
ئەم پەیژەیە
پلەی شكاویشی هەبوو
خۆیشی ئەنا بە دیواری كارتۆنەوە
بەڵام دوا سات، بەڵام دواجار
ئەم پەیژەیە
خۆی ڕاتەكان
لە قاچی بەغدا  یاخی بوو
 كە وەختێكیش بەلادا هات
سەری پەیژە گەیشتبووە  "گەلاوێژ" و
شاكیر فەتاح لەسەربانی
هەموو ماڵێكی ئەوینی
ئەم كوردەوە دەنگی ئەهات!

1992

# ئاخێك

هەراسانم مەکە .. زریان !
با نەتدەمە دەست هەڵبەستێکی هەللاجی
شێتو توورەم
بێتە سەرت و
شیتکاتەوە و
بتکاتەوە:
بە لۆکەی شنەبایەکی
ترساوی پاڵ گردۆڵکەکان !
هەراسانم مەکە .. باران !
با نەتدەمە دەست دۆزەخێکی ئەوینی
غەریبیمو بێتە سەرت و
ئاگر پرژێنت بکات و
بتکاتەوە
بە پۆپەشمینی هەڵمێکی

**شیتاڵ شیتاڵی گوێ سیروان !**

**تۆیش ئازاری نا ئومێدی و لێك دابڕان!**

**ئەمشەو هەراسانم مەکە**

**با زریانو با بارانت**

**بۆ نەهێنمەوەو نەتدەمە**

**دەست هەڵبەستێکی سوورە هەتاوی ڕۆحمو**

**نەتکەمەوە:**

**بە ئاخێکی**

**زۆر بچکۆلەی**

**قژ زەردی تەمەن پێنج ساڵەی**

**بە جێماوی .. ئەنفالەکان !.**

نیسانی 1992

# دوو جار

پەڵە هەورێ دائەبەزێو
پەڵە هەورێ سەر ئەکەوێو
"سەفین:: ئیستگەی پۆستی بارانی ڕەوەندە و
مۆزەخانەی گژوگیایە و
نامەخانەی مانگەشەوەو
ئارشیفی بەردەو، پەناگەی عاشقانی بەفرو بایە.
پەڵە هەورێ دائەبەزێو
پەڵە هەورێ سەر ئەکەوێو
منیش سەرم: باڵۆنی خەم، گۆمی هەتاو
زەنگی دەستی دارستانو
دەفتەری بوومەلەرزەیەو
چەمی هەستاو
لەلای منیش:
وشەیەکم هەڵئەفڕێتو
وشەیەکم هەڵئەکوڕمێو

لەم بەینەدا، من دڵنیام، ئەمشەو شیعرم
دووجار ئەزێ
جارێك لەگەڵ پەڵە هەوری سەر "سەفین"دا و
جارێکی دی
کە خۆم تەنیا ئەمێنمەوەو
"سەفین" ئەنوێ!

هەولێر
تەمووزی 1992

# ناسینەوە

بە ڕێکەوت  لەناو هەولێرا
"قەڵا"م  بینی  لاواز .. لاواز
ڕیشی هاتوو
دەستێکم خستە سەر شانە خۆڵاوییەکەی
- ئەمناسیتەوە ؟! لێم پرسی.
- ئەی تۆ نەبووی هەموو جارێ
حەزرەتی نالیی  ئەیناردی و
کە ئەگەیشتی .. بەرامبەرم
لە دوکانی
"عبدالخالق"ی گلێنەم
دائەنیشتی!

1992

## کیژ

- ئەو شمشاڵە ژان ئەیگرێ
- خۆزیا کیژێکی ببوایە
وەك تەنیاییم چاوی ڕەش و
ئەوەندەی دەنگی "فەیروز" یش
سپی بووایە!.

هەولێر
ئابی 1992

# هۆ

ئەم خوڕەی ئاوە ئازاری
سەرچاوەیە وەختێ ئەگریی
ئەم وژە وژی  بێشانە
زریکەی لق، هاواری چڵو گەڵایە
وەختێ کە بەهار جێ دێڵن
ئەم پێکەنینی گۆمانە
وەختێکە هەتاو ختووکەی شەپۆل ئەدا
ئەم لەنجەو لاری باخانە
وەختێکە گوڵان شوو ئەکەن
ئەم سوورهەڵگەڕانی گردانەیش
وەختێکە گشت شەهیدانمان
برینەکانیان هەڵ ئەکەن !

1992

# چیرۆكی خۆشەویستییەك

دوو دڵدار و
دوو باڵقۆنی بەرامبەر یەك
هەموو شەوێ شیعر و شەپۆل
گوڵو ماچ ئەگرنە یەكتر
هەموو شەوێ
"با"ی نێوان ڕەنگو ڕەنگ ئەكەن
هەموو شەوێ
ئەچنە بەر بارانی عەشقو
هەتا سەر ئێسقان تەڕ ئەبن.
بەڵام ئەمشەو باڵقۆنێكیان هەر تاریك بوو
كچ لارەمل ،
ماچ بێ باڵو، گوڵە مێخەك چاوەڕێ بوو
لە پڕێكدا شەو شڵەقا و
گوڵە مێخەك كەوتە خوارێو

**لە باڵقۆندا  کچ ئاوا بوو**

**کوڕ هاتەوە**

**بە ڕاکشاوی هاتەوەو**

**ئەمجارەیان  لەسەر سنگی**

**خەنجەرێکی سوور  ڕوا بوو!.**

هەولێر
ئابی 1992

# شیعر و ئارد

چاوەڕێی کرد
"مەمو زین" نەبوو بە گەنم
"دیوانی نالی" بە ئاردوو
شیعری تازەیش
بە یەك قووتوو شیری منالْ
دەم بوو بە گورگ
سك بوو بە گورگ
پرسی نەکرد
نە بە خانی
نە بە نالی
نە بە گۆران
پرسی نەکرد بە سوجادیو
هەموو مێژووی ئەدەبی دا
بە یەك هێلْەك ئاردوو ئێستە

چاوم لێیە:
لە نهۆمی یەکەمینی
ژوورێکی "ئەمنە سوورەکە"
دانیشتوونو شیعر بووە بە هەویرو
ئەیبرژێنن و
بەردەوامیش
چاویان هەر وا
لە دیمەنی هەڵواسراوی (شۆڕیجە)ی سەر
دیوارەکە !

1992

# له سێ گۆشەیەکدا

کچ

سروشت

شیعر

ئا لەم سێ گۆشە نەمرەدایە

بازنەی خەونم ئەسووڕێتەوەو

لاکێشی دەنگم دائەگیرسێتو

چوارگۆشەی بیرم

پەنجەرەی عەشقی هەر پێنج قاڕەکەی

هەموو دنیایە!

1992

## نووسین!

ئاسمان هەردەم .. ڕێژنە باران  نانووسێ.
باران هەردەم .. ڕووبارو جۆگە نانووسێ.
ئاویش هەردەم .. باخ نانووسێ.
باخیش هەردەم .. گوڵ نانووسێ و
منیش  شیعر !

1993

PDF 4 KURD

## نەژاد

لە گوێ ئۆقیانوسی "ئارام"
گوێچکە ماسییەکم هەڵگرت
نام بە گوێوە
گوێچکەماسی
سەربوردی خۆی گێڕایەوە:
دەرکەوت ئەویش
لە خێزانو بنەماڵە ئاوارەکەی
"ماسییە ڕەشە بچکۆلەکەی"
"بەهرەنگی"یە !

1993

# سییانە

زەریاو سێکەس

لەو شەپۆلانە پەستترو توورەترم

کە سەر ئەکێشن بە ڕۆخی بەردەڵاندا

شەو و سێکەس

لەو کورسییانەیش تەنیا ترم

کە کەس ناچێ بە لایاندا.

مێزێك، سێکەس

لەمبەرەوە پەرداخێکم سەرەونخون

لەوبەرەوە بەجووت یەکتری نۆش ئەکەن

زەریا و سێ کەس

شەو و سێ کەس

ڕقم لە سییانەو سێگۆشەو

سێ ڕیان‌و

هەموو ژمارە سێیەکە !

"بێئەوەی مۆڵەت وەرگرم"

منی تاك و منی زیادەو

منی دووکەڵ

هەستام ڕۆیشتم !

1993

# دیدارێکی کورت

– ئەو پێکەنینی درەختە بۆ کوێ ئەبەی؟
– بۆ لای ئەو مەلە دڵ تەنگە.
– ئەو قەڵەمی برووسکەیە
ئەدەی بە کێ ؟
– بەو مێرگە تا: دیوانێکی گوڵەهێرۆی
تازەترمان بۆ بنووسێ.
– ئەی دەفتەری ئەو پەڵە هەورە سپییە؟
– ئەیدەم بە منالێکی ئاوارە
هەتا وێنەی دەمو چاوی
کوردستانی تیا بکێشێ.
– ئەی ئەو پەلکە ڕەنگینەیەت
بۆ لەسەرتەوە پێچاوە ؟

– ئەچم بۆ شایی ئەو گۆمەی
ئەستێرەیەکی هێناوە.
– ئەی ئەو موستیلەی گزنگە
نیازت وایە بۆ کێی بەری ؟
– ئەیکەمە پەنجەی ئەو سەروە شۆخو شەنگە.
– ئەی ئەو ملوانکەی تەرزەیە ؟
– ئەیکەمە گەردنی کفری.
– ئەی ئەو چەتری هەورە نزمە
ئەدەی بە کێ ؟
– ئەیدەمە دەس ئەو چنارە کەڵەگەتەی
زۆر دەمێکە لەبەر ئەو خۆرە وەستاوە .
– ئەی ئەو ئاوێنەی هەتاوە ؟
– ئەوە ئەیبەم بۆ ئەو ڕەزەی
لە دوای چاوی هەڵەبجەوە
قژی خۆی دانەهێناوە.
– ئەی ئەو هەموو گوڵە ژاڵەو
ڕەشە ڕێحانە و مۆردانە بۆ کوێ ئەبەی؟
– ئەیانخەمە سەر تابووتی ئەو شەهیدە.
– ئەی ئەو هەموو زەردەخەنەی
منداڵانە بۆ کوێ ئەبەی ؟
– بۆ بەر بارانی دوا ڕۆژێ
کە خۆشەویستیی زیاترو

گوڵەبەڕۆژەی زیاترو

شیعرێ جوانتری تیا بڕوێ.

– ببوورە ! ناوی بەڕێزت ، بۆ گوێگران:

– من ئازادییم

ئەی تۆ

– شەهیدێکی پەیامنێری

ڕێگەی خۆتان !!

1993

# نیوە

ئازادییم ئەوەندە برسییە
لەتاو نان
ئامبازی (مانگ)ی ناو شیعرم بوو
فڕانی و کەرتی کرد
لەوساوە شیعری من
شەوانە کە هەڵدێ
کەل بووە و نیوەیە !

1993

# دەسکەوت [1]

بەرلە پێنج ساڵ
"گمۆ" ڕیشی نەئەتاشی.
"سیروان" ڕادیۆی ناشناڵی یابانی هەڵنەئەگرت.
ئازادیی جگەرەکێش نەبوو،
هەتا جگەرەی بەغدا بکێشی.
شەقام جامانەی نەئەبەست.
"هەڵۆ" کوا کڵاوی لەسەر ئەکرد.
"توونی بابا" خوێندەواریی نەبوو
تا کتێب بخوێنێتەوە.
کاولاشەکان عەتریان لە خۆیان نەئەدا .
ڕەشەبا کەی جیهازی ڕاکاڵی هەبوو.
بەرد کوا مەتارەی هەڵئەگرت.

---

[1] وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کردبوو، دوای دۆزینەوەی تەرمی شەهیدان مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانی لەو ئەشکەوتەدا کە بەسەریاندا ڕووخا، هەر لەپاڵ خۆیاندا ئەو کەل‌و پەل‌و شت‌و مەکانەیش دۆزرانەوە، کە لەم شیعرەدا ناویان هاتووە.

**ئەستێرە كتلی بۆ چی بوو!.**

**دەوەن كوا تاكێك گۆرەوی لەپێ ئەكرد.**

**ئاسك مقەستی بۆچی بوو!.**

**باران كەوچكی بۆچی بوو !.**

**هەوریش شیعری بە قەڵەمی پاركەری جاف**

**نەئەنووسی**

**بەڵام ئەمانە هەموویان یەكە یەكە**

**لە دەسكەوتەكانی ئەشكەوتی (داری خلە)**

**یەكی شتێكیان فڕاند و،**

**لەو ڕۆژەوە ئیتر گۆڕان !!.**

1994

# كورتيله چيرۆكه شيعرىَ

هات ڕاوەستا
تەريك لە ژێر
دار نارنجێكدا ڕاوەستا
سەبەتەی پووشی پڕ گوڵێش
لە باوەشدا
تەنها سەيری ڕۆژهەڵات و
سەعاتەكەی دەستی ئەكرد..
هەتا شەمەندەفەر گەيشت.
هەموو پياوەكان دابەزين
هەموو ژنەكان دابەزين
هەموو منداڵان دابەزين
تا شۆفێرەكەيش دابەزی

ئەوەی دیار نەبوو هەر (ئەو) بوو !
غەمگین .. غەمگین
تەماشای گوڵەکانی کرد.
بۆ هاتنی نۆرەی دووەم شەمەندەفەر
یەکێکی تر هات ڕاوەستا

ئەویش بەتەنها  هەر سەیری ڕۆژهەڵاتو
سەعاتەکەی دەستی ئەکرد
ئەوسا ئەم چووە لایەوە
بەبێ دەنگیی سەبەتەکەی دایە دەستیو
ئینجا ڕۆیشت !

1993

# سەعاتی قامیش

**ئێستە لەو زۆنگاوانەدا**
**لە خوارەوە**
**خەم لە قامیش**
**هەموو ڕۆژی**
**بە هەزاران سەعاتی خوێن دروست ئەکات**
**بۆ ئاپوورەی هەژارانیْ:**
**نەدەستیان ماوە تا بیکەنە دەستیان‌و**
**نەچاویان ماوە تاکوو سەیریان بکەن‌و**
**نەماڵیشیان ماوە تا هەڵیان بوواسن**
**ئەو سەعاتە قامیشییانە**
**لە زۆنگاودا**
**بە تەوقیتی جەللادەکە**
**هەر کاتی مەرگ نیشان ئەدەن!**

1993

# گەردن

**گەردنی شیعرێ**
**گەردنی دایکم**
**گەردنی وڵات**
**هەورم پێچایە یەکەمیان**
**بوو بە هەفتەی ئاواز بارین**
**عومرم پێچایەوە دووەمیان**
**بوو بە مانگی ئەوین بارین**
**مێژووم پێچایە سێهەمیان**
**بوو بە ساڵی**
**خەمبارینو**
**زامبارینو**
**شەهیدبارین !**

1993

# کەرکووکنامەیەك

ئەگەر باڵدار بم .. یەك باڵم
ئەگەر بەڕوو .. ئەگەر قەڵەم
یان کڵاوکوڕەی شیعریش بم
بێکڵاوم
گەر ئەسپ بم.. خاوەنی تاقەیەك چاوم
ئەگەر "با" بم بێ گڤەو
ئەگەر ئاو بم بێ خوڕەو
ئەگەر هەنگوینی وشەیش بم
لەناو زاری ئازادیمدا
تفت تفتو هەر بێ تامم.
من کوتو مت بە بێ کەرکووك
مرۆڤێکی کەم ئەندامم !

1993

# بازنەی ئاگر

بۆتان بێ عشقی "مەمو زین" ئەبێ چی بێ ؟!
مەمو زین بێ شیعری خانی ئەبێ چی بێ ؟!
خانی بێ شەوقی  زمانی کوردی چییە؟!
کورد کە کوردستانی نەبوو ئەبێ چی بێ ؟!
کوردستانیش
بێ ئاگرەکەی
شاری کەرکووك
ئەبێ چی بێو
ئەبێ چی بێو
ئەبێ چی؟!!

1993

# نەهێنیی

قەت بە پاییز نەڵێن لە کوێم
ئەگەر بە جێگەم بزانێ
گەردەلوولم ئەکاتە سەر
دێتو هەرچی خەمی جوانمە
دێتو هەرچی ئازاری چاو ڕەشمە
ئەیفڕێنێ..
لە دواییشدا.. منی عاشق
چۆن بەبێ ژان بباریێمو
تەڕتان بکەم تا سەر ئێسقان !
قەت بە زەریایش نەڵێن لە کوێم
ئەگەر بە جێگەم بزانێ
ئێرەیی ئەکاتە سەرمو

دێتو بە زۆر، سیحری ڕەنگی
چاوانی ئەو کچە شۆخەم لێ ئەسێنێ
لە دواییشدا .. منی شاعیر
چۆن بێ سیحری ئەو چاوانە
چۆن بێ قووڵیی ئەو چاوانە
شیعر ببێتە ئاسمانم ؟!
شیعر ببێتە ئەو گڕەی
ئەو دۆزەخەی
درێژە بات
بە سووتان و هەڵقرچانم ؟!

1993

# چواردە چرا

(1)

## چیرۆکی پیاوێ

فەرش چنێ
هەتاکوو مرد
فەرشی چنیو گوڵی چنی.
بەڵام ئاکام:
نە فەرشێکی هەبوو بۆ خۆی
نە کەسێکیش
گوڵێکی خستە سەر قەبری !

(2)

## سواڵ

لەبەر قاپیی کتێبدا من
هەموو ڕۆژێ
سواڵکەرێکم

بۆ  وشەیەك و دووان و سێ
سواڵکەرێکم بەردەرگانەی
ئەم پرشنگانە بەرنادەم
هەژارێکم
خێری ڕووناکی و بیری نوی
هەتا مردن
بە من ئەشێ !

( 3 )

**ئارامیی**

لەوێ زەمین زۆر ئارامە.
لەوێ هەوا زۆر ئارامە.
لەوێ هەتاو زۆر ئارامە
لەوێ هەور زۆر ئارامە
بۆیە نە گڵ ژان ئەیگرێو
نە گەواڵە هەور ئەزێو
نە بەستەڵەك ئەتوێتەوەو
نە شیعریش ئەتەقێتەوە !

( 4 )

**ئەفسەرێکی ئاسایی !**

کە یەکەم ئەستێرەی وەرگرت

ئەستێرەیەکی کوشتبوو.
کە بوون بە دووان،
هەردوو دەستی بوون بە پەتی سێدارەکان
کە بوون بە سیانو بە تاجو بەرەو ژوورتر
بە یانییەك
وەختێ مێژوو لە خەو هەستا
ولآت بووبوو بە ولآتی بێوەژنان!

(5)

**بەهرە**

ئەی خواوەندی بەهرەی گەورە!
تۆ "بیتهۆڤن"ێکی کەڕو
یەك "دستۆیفسکی" فێدارو
"ئەبولعەلا" یەکی کوێرم
پێببەخشەو
ئیتر هەموو بەهرە ساغە نیوە ناچڵو گچکەکان
بۆ دیوانی خۆت ببەوە !.

(6)

**ڕوانین**

لەو کەلەوە
جوانوویەکی سپی دەرکەوت

له شاخ زا یان
له بەفرو یان له کازیوه ؟
من نەمزانی.
لەوکەلەوه
هەلۆیەکی سوور هەڵفڕی
له ئاگر زا یان له خوێنی خۆرنشین یان
له نیشتمانی هەلاڵە ؟
من نەمزانی
لەو کەلەوه
باڵای نیوەسپیو نیوه ئەرخەوانیی
دوکتۆر "قاسملوو" بەدەرکەوت
ئەوەی زانیم:
ئەو له بەفرو
ئەو له خوێنو
ئەو له شاخ زا
ئەوەی زانیم !.

(7)

## ئەوینت

له جیاتی چاوت دوو گوڵی
به جریوەی ڕەشم بینی.
له جیاتی باڵات – پرشنگێ.

له جیاتی دەمت –زنەیەك.
له جیاتی قژت – گزنگێ
له جیاتی دەنگت – چرپەی ئاو.
له جیاتی بۆنت – بۆنی خاك
له جیاتی ڕەنگت – خەونێکی
سەوزم بینی
بەڵام له جیاتی ئەوینت
من هیچ شتێکم نەبینی !.

(8)

مەرج

له هەڵبژاردنی یاردا
شیعر گوێ ناداتە تەمەن
عومری "ڕامبۆ"ی هەبێ یاخود
عومری "دانتی"
شووی پێئەکا!
بەڵام بۆ خۆی
شیعر ئەو جوانە ژنەیە
یەك مەرجی ئەزەلیی هەیەو
زەمان _ زەمان
هەر دووبارەی ئەکاتەوە:
کامە قەڵەم

پیری ناکاو

له بیر جوانیی ناباتەوە ؟!

(9)

## یادداشت

کاتی یادداشت نووسینەوەم

خەریکە نزیك بێتەوە

وەختی گێڕانەوەی خەون و پەندەکانم

کاتی خۆ بەدەستەوەدانی نەهێنیو

گشت گوناهە جوانەکانم.

کاتی یادداشت نووسینەوەم خەریکە نزیك بێتەوە

ئای خودایە ! چەند ستەمە

بۆ قەڵەمێ

بەرەو دوا بگەڕێتەوەو

لە بەرایی بەردەمیشدا

ئەوەی مابێ

ڕێگایەکی تەماوی بێ

بەرەو مردن !

(10)

## فڕۆکە

فڕۆکەکە لە ئاسماندا خولی ئەخوارد

لە خەیاڵی منداڵێکدا

وەکوو یاریی لەگەڵ "با"دا بکا وابوو
وەکوو گاڵتە لەگەڵ هەورا بکا وابوو
بەڵام
فڕۆکەکە یاریی نەکرد
کە دانەویی و هەستایەوە:
هەبوو _ نەبوو
شارێك بوو مرد !

(11)

## کراس

ئەو تەمە سوورە کراسی ئاو دامانەو
بۆ فرۆشتن
بە جامخانەی ئەو شاخەوە هەڵواسراوە
تۆزێکی تر
بالیسانێ ، سێوسێنانێ، وەسانانێ
یەکێکیان هەر پەیدا ئەبێ
دەستی لەرزۆك بە گیرفانی برینی قوڵدا بگێڕێ‌و
بە دوو هەزار گەڵا ئاخ‌و _
یان تۆ بڵێ:
بە سێ هەزار کسپەی تەڕ تەڕ
کراس بکڕێ‌و
هەر لێرەداو بەدەم ڕێوە بیکاتە بەر!.

(12)

## ئەلیزابیت وای وت

پەردەیەك هەیە لە نێوان
من و تۆدا
نە لە بەرد دروست کراوەو
نە لە خشت دروست کراوەو
نە لە قوماش
نە لە ئاسن.
پەردەیەکە ئێجگار تەنك
بەڵام نە بە دەست ئەبڕدرێو
نە بە پاچو
نە بە گوللە
پەردەی نێوان دوو ئاوەزە
کە سەدان ساڵ دوورن لەیەك !

(13)

## پێکەنین

گزنگ ئەیدا لە ڕووبارێ
بەستێن وتی: لەم پێکەنینە جوانترم
قەت نەدیوە.
زەردە ئەیدا لە باخچەیەك
مەلیش وتی: لەم پێکەنینە جوانترم

قەت نەدیوە.

تریفە دای لە بەفری سەر هەڵەمووتێ

شاخیش وتی: لەم پێکەنینە جوانترم

قەت نەدیوە

کە شیعریشم دای لە شەوی

ئەوچاوانە

ژیان وتی:

لە گشت پێکەنینێ جوانتر

پێکەنینی دڵدارانە !.

( 14 )

نوور

ئەوەندە تەماشای نوورم کرد

چاوانم نوور بردی

نووری تۆ چارشێو بوو، پەردەبوو

لەمپەر بوو

نەی ئەهێشت ڕۆچمو

قوڵایی نەهێنیت ببینم

من ئێستا بە ڕووکەش کوێرێکم

وا دەستم ئەگیرێو

وەکی تر

بە چاوی "باطینم"

له جاران جوانترو چڕترو
قوڵترت ئەبینم !

هەولێر
کانوونی دووەمی 1994

# درەختی مرواری

بۆ "سەلیم بەرەکات"

(1)

دێیتە ڕۆحمەوە و تیشکیش نیت.

دێیتە لەشمەوە و خوێنیش نیت.

دێیتە چاومەوە و ڕەنگیش نیت.

دێیتە گوێمەوە و دەنگیش نیت.

تۆ نەهێنیی

خۆشەویستیت !.

(2)

مەستم بە گوناه.

مەستم بە تۆبە.

مەستم

کە نەمزانی

بۆچی گوناهو تۆبەم کرد !

(3)

**هەر لەبەر چاوی ئاسمان خۆی**

**هەوریان دزی.**

**بە بەرچاوی هەوریشەوە**

**"با" یان دزی.**

**هەر بە بەرچاوی "با"یشەوە دلۆپە بارانیان دزی**

**هەر لەبەر چاوی بارانیش**

**خاکیان دزیو**

**لە خاکیشدا**

**ئەو چاوانەیان شاردەوە**

**کە دزەکانیان بینیبوو !**

(4)

**ڕیزێك مۆمو ڕیزێك شیعر.**

**کە مردن هات فووی لێ کردم**

**- یەکەم ڕیزم دووکەڵێکە**

**پەرت پەرت ئەڕوا و بزر ئەبێو**

**ئەچێتەوە ناو دڵی خوا.**

**ڕیزێك مۆمو ڕیزێك شیعر**

**- دووەم ڕیزم**

**ئەو وشە و دەنگو ڕەنگانەن**

**وەك پرشنگو خوڕەی ئاوو سەوزیی چیا**

نه هەرگیز ئەكوژێنەوەو
نه دەمیان لە گۆ ئەكەوێ‌و
نه ئەچنەوە.
ئەمێنن وەك كوردستان‌و
ئەژین وەكوو ئاووهەوا !

(5)

زریان گەڕایەوە ئەشكەوت.
ئەو ئێستاكە
شەكەتەو ڕەنگە زوو بنوێ.
بەڵام دەربەند
دەوری چۆڵەو سەری سووكەو
خەریكی چیرۆك نووسینە:
لە گەردو گوڵی بەیاندا
سوارێك خۆی كرد بە گەرروومدا
سوارێكی ڕەش..لە پاشكۆیدا
پەرییەكی هەڵگرتبوو
تیژ ئەهاتن
سوارە و پەری گەیشتنە ناو ڕووبارەكەم
لە پڕێكدا لە پشتەوە
تەنها شریخەیەك  بیسترا
پەری كەوتە ناو ئاوەوە و

بۆچەند ساتێك
وەكوو ڕووبار دڵنیاییم
سوور هەڵگەڕا !

(6)

هەڵتكردم
من تاریكیم پێ خۆشتر بوو!
كوژانتمەوە، من ڕووناكیم پێ خۆشتر بوو!
تێم ناگەی .. تۆ !
من لە بەینی هەڵكردن و
كوژانەوە و مەرگی خۆمدا
گومانێكم
سنوورەكان
نامگرنە خۆ !

(7)

مێژوویەك بوو.. ئەمووستەچاو
هەر "مودیری ئەمن"و مشك و
چەكمەجەیەك
فاییلی تۆیان ئەبینی !
ئێستە دەستە سپییەكانی هەتاو
باهۆزی سەوزی "ڕاپەڕین"

پەڕە.. پەڕە
وشە.. وشە
زەرد نامەیان
ڕەش نامەیان
مەرگ نامەیان
بردۆتە لای:
ئەو خێڵی گیاو گوڵ ومەل و
کازیوانەی
کە بەدەمی قەڵەمەکەت
سەرت بڕین !

(8)
زەنگی کڵێسا و لێدانی
سەری  مەسیحە ئەو کاتەی
دائەباری ژانەکانی ،
خەمی کەرکووک و سووتانی
سەری کوردە لەو کاتەدا
بوون بە مەسیح
شەهیدانی !.

(9)
لە ناو هەموو ئەو  وشانەدا کە ئەمشەو
سەریان لە منی نەخۆش داو

هاتبوونه  ژوور سەرینم
تەنها وشەیەکیان تیا بوو
دەستی خستبووە دەستمەوەو
تا بەیانی لەگەڵ لەرزما
لەرز ئەیگرت و
لەگەڵ "تا"م دا
"تا" ئەیگرتو
جێی نەهێشتم
ئەویش وشەی: "یادگار" بوو!

(10)

عاشق قەت ڕەوانبێژ نابێ
چونکە سۆزی گڕستانێ
لە هەناوی ئەو بەربووە
مەگەر تەنها
هەر بێدەنگی
باسی بکا و
هەر بێدەنگیش
دەنگەکانی ئەو دەربڕێ!

(11)

خۆڵەمێشەکە وای ئەوت:
مشتێکی من .. درەختێ بوو.

پیاڵەیەکم منداڵێ بوو.
فنجانێکم.. کۆترێ بوو.
خۆڵەمێشەکە
گردێکی هەڵدراوەی
مێژووی جەستەو
خەونی من بوو!

(12)

خۆرنشینێ
شیعرێکی مەستم هەڵفڕی.
نەهاتەوە.. دەنگی نەبوو
کە سۆراخم
گەیاندە لای
ساقیە چاوڕەشەکەی "حافظ"
ئەو پێی وتم
بەدەم خوێندنەوەی رەزنامە و
لەبەر بارانی بادەدا
کەوتە خوارێو
لەسەر مەزارەکەی "خەیام"
ڕۆحی دەرچوو!

(13)

تۆ ئەو ساتە
دار هەرمێیەکی سپی بوویت ئەڕۆیشتیتو

شاڵێکت دابوو بە شانتا
شاڵ پڕی بوو لە پۆلە وێنەی باڵندە.
وەختێ گەیشتیتە ماڵێو شاڵت داگرت
باڵندەکان
هەڵفڕینو
ئەمجارەیان تەماشام کرد لە ئاسماندا
بوون بە پۆلێ لە قەسیدەی
دەم بەخەندە!

(14)

لەبەر ڕووناکیی تاریکیم
خۆشەویستیت ئەخوێنمەوە.
لەبەر بارانی تینوێتیم
خۆشەویستیت ئەنووسمەوە.
لە سووتانی غەریبیشدا
خۆشەویستیت : نیشتمانی
گزنگ دانو
هەڵهاتنمە !..

(15)

لەو شەوەدا
لەو کەژەدا
هەرچی کرمی ئاوریشمینە

لە قۆزاخە هاتنە دەرێ و
بە چوار دەورا
بوون بە چرا:
لە ئاهەنگی ڕێزلێنانی ئەو بەردەدا
کە ئەستێرە برینێکی سلێمانی
لە گیانی خۆیدا
حەشاردا !

(16)

لەو خەوەدا دوو ماسی بووین
بە شوێن گۆمێکدا ئەگەڕاین
"مانگ"ی تیا بێ.
پرسیارمان کرد لە ڕووبارێ
ئەو پێی وتین:
لەبەر ئەوەی مانگ گیراوە
ئەبێ ئەمشەو چاوەڕێکەن
تا بەر ئەبێ.
بەڵام ئەفسووس
ئەو وەختەی مانگ بەرەڵڵا بوو
بەخەبەر بووین!

(17)

هەنووکە تۆ بەلەمی یان

مەرافیێکی درێژکۆڵەو
منیش ڕووبار؟
ئەمێستا تۆ لاولاوی یان
ئازارێکی پێچاوپێچو
منیش دیوار ؟
تۆ خۆرنشینی وەرامی ؟
یان زریانو تۆفی پرسیار ؟

(18)

تۆ کتێبی و
هەروەها ئەویش کتێبە
جیاوازییەکتان ئەوەیە
تۆ کتێبی یەك ژووریتو
ئەو کتێبی هەموو وڵات.
تۆ شەپۆلی و
ئەویش شەپۆل
جیاوازییەکتان ئەوەیە
تۆ شەپۆلی جۆگەیەکیو
ئەو شەپۆلی ئۆقیانووسێ.
تۆ مۆمیتو
ئەویش هەر مۆم
جیاوازییەکتان ئەوەیە

**تۆ ڕووناکییەکەت چەقیوەو**
**ئەو ڕووناکییەکەی گەڕیدەی**
**هەموو جیهان !**

(19)

**دوای بۆردومانی ئەو کەژە**
**هەندێ دارگوێز هەر بە پێوە مابوونەوە**
**ئەیانبینی**
**سەرو ملیشیان بائەدا و**
**دەستیشیان  ئەجووڵانەوە!**
**بەڵام نە گوێیان لە هاژەی چەمەکە بوو**
**نە لە قریشکەی ژنانو**
**نە لە زریکەی  منداڵو**
**نە لە زرمەی تەقینەوەی**
**دینامێتی ناو گوندەکە !**

(20)

**پیرۆزن ئەو دەستانەی لەم بنارەدا**
**خانوو بۆ خەونی منداڵان دروست ئەکەن.**
**پیرۆزن ئەو دەستانەی لەم پێدەشتەدا**
**ژوور بۆ وشەو**
**شەقام بۆ قاچی ڕووناکیو**

پلیكانە بۆ پاشەڕۆژ دروست ئەكەن
بەڵام پیرۆزترین باسك و
ئازاترین دەستو پەنجە
ئەو دەستانەن لە پێش دەستەكانی تردا
هەموو ساتێ
لەگەڵ مەرگا ڕووبە ڕووی یەكتر ئەبنەوە
ئەو دەستانەن یەكە یەكە
مینی چێنراو ئەچننەوە!

(21)

كەوان وتی:
كە پشتی خۆم ڕاست كردەوە
یەكەم شتێ كە من بیكەم:
لە سێدارەدانی تیرە.
مەگەر تەنها خۆم بزانم چی پێ كردووم!

(22)

ئا ئەم دیجلەو فوراتە چین
ئەگەر ئاون
ئاو بێ ڕەنگەو كەچی ئەوان هەر بەردەوام
ئەرخەوانین!
ئاو بێ تامەو كەچی ئەوان هەر بەردەوام
تامی مێژوویەكی سووتاو ئەدەن!

ئاو بێ بۆنە و کەچی ئەوان هەر بەردەوام
بۆنی قژی
کچ‌و کوڕە کوژراوەکانی ئێمەیان لێ دێ!

(23)

لەم کەژەدا دار دوودڵە
بڕوات؟ یاخود هەر وا ڕاوەستاو بێ؟..
لەم چەمەدا ئاو دوو دڵە
ببێ بە شەختە یان هەڵم‌و بوخار؟!
لەم ڕێیەدا قاچ دوو دڵە
بگەڕێتەوە یاخود هەر بەردەوام بێ؟!
لەم باخەدا مەل دوودڵە
هەڵکورمێ یاخود هەر بفڕێ؟!
لەم ساتەیشدا وشەکانی من دوو دڵن
ئەم قەسیدەیە تەواو کەن؟!
یاخود بۆ ئێوەی جێ بێڵن؟!
با جێی بێڵم؟..

(24)

وردبوونەوەی وشە لە وشە.
وردبوونەوەی خەیاڵ لە خەیاڵ.
وردبوونەوەی چاوم لە چاوت.

وردبوونەوەی لەشم لە لەشت.
کردیانم بە زەریاو
کردیانم بە ئاگر.
دوورکەوتنەوەی وشە لە وشە.
دوورکەوتنەوەی خەیاڵ لە خەیاڵ.
دوورکەوتنەوەی چاوم لە چاوت.
دوورکەوتنەوەی لەشم لە لەشت.
کردیانم بە شەختە و
کردیانم  بە قاقڕ!

(25)

هۆدەیەکی ڕووت و ڕەجاڵ
پیرێژنێ.
پشیلەیەك.
تۆزێکی تر پیرێژن چاوی لێك ئەنێ و
بە ڕێی "با"دا
ئەچێتەوە بۆلای خوای خۆی.
تۆزێکی تر پشیلەکەیش
تا مرِ ئەبێ
دەم ئەنێتە ڕزقی خوای خۆی!

1994-1992

# گوڵەجەرگێ

له ڕۆژهەڵاتی گەلاڵە
له خەمهەڵاتی کوێستاندا
لەو شوێنەدا  کە خۆرەتاو  وەك مێژوومان
وەك بەژنی با
لەناو بەفرا هەڵئەلەرزی.
لەو شوێنەدا
کە شەڕی هەردوو دەسی خۆم
سەری خۆمو
سەری شیعرو
سەری مانگەشەویان ئەبڕی.
لەو شوێنەدا
کیژێکم دی سپی.. سپی

**وەکوو گوڵی چواله و هەرمێ**

**مل بە هەوریی**

**کە لێم پرسیی:**

**ئەی کیژۆڵەی ناو خەونی شاخ**

**لەم هەرێمی گوڵانەدا**

**لەم دەریاچەی ڕەنگانەدا**

**تۆ عاشقی کام چاویانی؟!**

**وتی: تەنها تاقە گوڵێ:**

**گوڵەجەرگی ناو بەیانی**

**زامەکەی حەسەن کوێستانی !.**

1994

# گەڕانەوە

ئەم شەهیدانەی شەقلاوە
تەنها هەر لەهاویناندا
لەگەڵ هاتنەوەی شەمامەو
لەگەڵ دەرکەوتنی خێڵی گوڵەباخو
گەڕانەوەی چاوەکانی دار گێلاسدا
سەر لە ئێمە ئەدەنەوە.
تەنها هەر لەهاویناندا.
کە دێنەوە
وەکووو قۆخ و سێوەلاسوورە و گوڵ هەنار
هەموو پێکەوە دێنەوە..
هەر لەدوور ڕا..
وەکوو بزەی گوڵ خەندەران

ئێمە ئەیانناسینەوە:
باڵایان داری ژاڵەیەو
دەمو چاویان هێشوە ترێی سەر قوڵکەیەو
دەس و قاچیان لقو چڵی بەلاڵووکە و
قژیان چیمەن!.
شەهیدانی ناو شەقڵاوە
کە دێنەوە بۆ لای ئێمە
وەکوو خەونی گوڵ ئەستێرە
لەسەر شانی سەفینەوە یەك یەك هەڵدێن.
ئەڵێی ڕیزێ مۆمی سوورنو
بەرەو ماڵانی بن بنار دائەگەڕێن.
قوربانییەکانی شەقڵاوە
وەك سنەوبەر بەرگیان کەسکە
چاویان کانیو سنگیان باخو
خەمەکانیان بەر سێبەرێکی فێنکە
کە گەرما هات..
شەهیدانی ناو شەقڵاوە
سەریان کەپری ئازیزانە
هەناسەیان کزەبایەو
زامیان هاوینەهەواری
گشت زامێکی کوردستانە!

1994/4/11

# ئەسپ و چرا و مانگ !

-بابە بۆچی ئەسپەکەی "شێخ"
لە بناردا کەوتو گلا و
نەبوو بە "با"و
بە بروسکەو
سەرنەکەوتە سەر ترۆپکی
پاشەڕۆژ و
شاخی هەتا و؟!
- کوڕم.. ئینگلیز.. داوی ئینگلیز
ئینگلیز.. خستی
ئینگلیز..گرتی
ئینگلیز.. کوشتی!

- ئەی بابە بۆ چرای ئالآی
ناو بەفرانباری مەهاباد
لە تەمەنێکی زۆر کورتدا
کورتتر لە گوڵی دار چوالە و
کورتتر لە خەونی پەپوولە
پرشنگەکانی هەڵوەری و
دڵی وەستا؟!

- کوڕم! فووی ڕووس
فووی "ستالین " و "سەڵتەنە" و
گۆڕینەوەی خوێنی کوردستان بە نەوت و
مەزاتە گەورەکەی دنیا!
- ئەی بابە ئەم "مانگ"ەی ئێستا
کە لە ئاسۆی خوێنمانەوە بوو بە خەونی
گۆیژە و مەتین وسەفین‌و
لە ناو سەری مێژوویەکی شەهیدەوە
خەرمانەی دا؟!
بابە..بابە ئەی ئەمەیان
ئەم مانگەیان
کێ ئەی کوژێ؟!

ـ کوڕم.. کورد خۆی.. هەر خۆی و خۆی

**کەسی تر نا**

**ئەمجارەیان خۆی ئەیکوژێ**

**خۆی ئەیکوژێ**

**خۆی!!**

کۆتایی 1994

# لەو شەوەدا

قەت لەو شەوەی
"ئەشکەوتەکەی داری خلە"
شیعرم تەنیا تر نەبووە.
قەت لەو شەوە
ڕۆحم تاریك تر نەبووە
قەت لەو شەوە
مەرگم بێکەس تر نەبووە.
لەو شەوەدا، کەس. کەس. کەس. کەس
کەسم نەبوو.
لەدە پەنجەی هەردوو دەستما
هەشتیان جاش بوون؛

برۆم بەسەر چاوانمەوە جاسوس
قاچێکم جەیشی شەعبی بوو.. قاچەکەی تری ئەگرتم
دەستێکم ڕەفیق "حیزبی " بوو،
دەستەکەی تری ئەکوشتم .
قەفی سمێڵم.. نەصیر بوو
شەدەم.. نەصیر موتەقەدیم
گیرفانیشم.. موستەشار بوو
لەو شەوەدا.. "با"یش بەعسی بوو
"بەرد" بەعسی بوو
باران بەعسی و
بەفر بەعسی و
دارو دەوەنیش بەعسی بوون
ئەوەی تەنها لەو شەوەداو لەو شوێنەدا
ڕەگ و ترووسکە و شاگوڵو پێشمەرگە بوون
حەوت خەونی سەوزی ژێر گڵی
گەرمێنی گیانی ئێمە بوون!

1994

# حەسەن کوێستانی

**لەم شیعرەدا بەفر ئەبارێ و**

**سەرم شاخە**

**لەم شیعرەدا گوڵ ئەبارێ و**

**لەشم خاکە**

**لەم شیعرەدا کچێکی جوان**

**ئەجریوێنێ و**

**منیش شەوم.**

**لەم شیعرەدا خەم باڵ ئەگرێ و**

**منیش ڕێگای کۆچ و ڕەوم.**

**لەم شیعرەدا ..من درەختی**

**سپی پۆشی سەر ئەزمەڕی سلێمانیم..**

**لەم شیعرەدا.. ئێستە زستانێکی سوورە و**

**من نمە نمەی بارانی**

**سەر گۆڕی حەسەن کوێستانیم!**

پاریس
1994

# پەیکەر

بۆشەهید جەباری حاجی ڕەشید

لە سەرەوە تا خوارەوە
باڵای بەرزی پیرە مەگروون دائەتاشم
ئەیکەم بە پەیکەری پیاوێ:
کە جێ ئەشکەنجەی سەر لەشی
شەوانی ئەمنە سوورەکەی
لەبەر بارانی "باوەڕ"دا
پەڵەیان داو . ئیتر ئەوسا
مێرگی برین و سروودی "مەشخەڵان" ی بەر
سێدارە..
زرەی ئازار
خەونی ژووری ئینفیرادیی..
وشەی ژێر زەمینی ئەنفال..

خوێنی قەڵەم، کێڵگەی نامە، عەشقی پ.م
عەشقی شەمام، چاوی هەرسێ منداڵەکە
بوون بەکانی و بوون بە دەغڵی زەردەخەنە و
بوون بە مێژووی خۆرەتاوی ئەم وڵاتە.
پیرەمەگروون!
من پێت ئەڵێم:
وا هاتووم و پەیکەر تاشی ئازادییم و
ڕازیی بیت و ڕازیی نەبیت
دات ئەتاشم و من تۆ ئەکەم:
بە "جەباری حاجی ڕەشید"

سەرەتای مارتی 1994

# شەست قوربانی

لەم مانگەدا
لە باڵەییان لەبەر دەمی هەر ماڵێکدا
گوڵێك ئەڕوێ.. گوڵی واسەیر نەبینراوە !
شەست چاوی کەسکی پێوەیە و
شەست خاڵ وا بە ڕوخسارییەوە و
شەست ملوانکەی لەملدایە
لە ڕەنگی خۆر.
لەم مانگەدا
لە باڵەییان  لەناو حەوشەی هەر ماڵێکدا
دارێك ئەڕوێ.. داری وا سەیر نەبینراوە:
شەست دەستی سووری پێوەیە و
شەست گەردن و

شەست پرچی مۆر.
لەم مانگەدا لە باڵەییان
لەو دۆڵەدا زەماوەندە:
شەست ئەستێرە هەڵئەپەڕن و
شەست دەغڵ نان ئەکەن و
شەست کانی ئاو ئەگێڕن و
شەست لوتکە تەقە ئەکەن و
شەست مەل گۆرانی ئەڵێن و
شەست باخ میوە ئەبەخشنەوە
لە کۆتایی ئەم مانگەیشدا
لە پێدەشتەکەی سۆراندا
باڵەییان و بالیسانم پێك ئەگەن و
هەر شەست بە شەست
بووکی خوێنیان ئەگۆڕنەوە!

1994

# دوور و نزيك !

هەر ئێستە لێرەوە بەرەو ژوور باڵ ئەگرم
ئەو هەورە ڕیش لۆکە، ماندووە، ڕائەگرم
پێی ئەڵێم: ببورە چاوەکەم! تۆ نامەی
بارانێ یان بەفرێ یان بۆنی ئێوارانی غەمناکی
شارەکەی (بێکەس)ت پێ نییە؟. بمدەیتێ و
لەباتی ئەو ئەرکەیش
سەد ماچی پەڕو باڵ سوتاوی
غەریبێ، وەرگری!
هەر ئێستە لێرەوە، من ئەبمە ، باپووسکە و
ئەگەمە ئەو مانگی سەر کەلە و
پێی ئەڵێم: ببوورە گیانەکەم ! تۆ شیعری چاوڕەش و
خەرمانەی تەنیایی کچێکت پێنیە؟

**ڕاسپێر، لەگەڵ خۆت**

**بۆ منت هێنابێ و**

**لە باتی مژدانەیش**

**سەد گوڵی کوژراوی**

**دووچاوم وەرگری!**

**هەرئێستە خۆم ئەکەم، بە ماسی باڵدار و**

**ئەو ئاسکی شەپۆلەی پێشەوە ڕائەگرم**

**پێی ئەڵێم: گیانەکەم ببوورە! .. تۆ لەگەڵ هەناسەی پرژەتا**

**تۆ لەگەڵ زایەڵە و گریانی هاژەتا**

**لە چۆمی چریکەی (دیلان) و**

**ڕووباری شیوەنی دایکانی شارەکەم**

**دوا ناڵە و کڕووزەی**

**بەهاری خوێناویی ئەم کوردەت پێ نییە**

**بمدەیتێ و**

**لەبری ئەو ئەرکەیش**

**هەرئێستە: هەزار ئاخ**

**هەزار ئۆف**

**هەزار داخ**

**لە ڕۆحی بێزاری ، شاعیرێ**

**وەرگری!**

پاریس
1995/3/31

## لەناو سەری هەڵەبجەدا

لە هەناوی هەر بەردێکما گوڵێك هەیە.
لە دووکەڵی هەر زامێکما خۆرێك هەیە.
لە ئاسمانی هەر خوێنێکما مەلێك هەیە و
لە ناو سەری هەڵەبجەیشما
گوڵ و خۆر و مەل و یاری
خۆشەویستی گەلێك هەیە.

1995

# نان و ئاسمان

مەلی  ووشەم
نە بەبێ نان پێ ئەکەنێ
بۆ ئاسمان و
نەبێ ئاسمانیش گۆرانیی
ئەڵێ بۆ نان!

1995

# لەشەوێکدا

"با" یەك دای لەسەرو قژم
سەرو قژم ، بوون بە لق و پۆپی دارێ.
دار هەنارێ گوڵێکی خۆی گرتە سنگم
سنگیشم بوو بە گوڵجارێ.
کچێك قومێ ماچی دامێ و
دوو لێوم بوون بە ڕووبارێ.
کە منداڵێکی (ڕواندا)یش، سەری خۆی و
مەمکی دایکی و
دەستی باوکی
لەڕێی (T.V)ەوە بۆ ناردم
دارم کوێر بوو
گوڵجارەکەم کۆچی کردوو
ڕووبارەکەم شینی کردو
من ئەو شەوە هەڵبەستێك بووم
تا بەیانی تەم دایگرتم!

1995

# شیعر

شیعر، گمەی
ئەوینێکی سپی و ، باڵی
پەپوولەی وشەیە و
چاوی باران.
شیعر تۆوی ئەستێرەیە و
لە دەشتی ساماڵدا ئەڕوێ
شیعر پەنجەی منداڵانە و
لە دۆزەخی کوردستان و ڕواندەدا
چی لە دەست دێ ؟!

1995

# ئافیش

لەسەر ئەم کورسی پاییزە
خەریکە چاوم هەڵوەرێ
بەرامبەریش
هەر وەکوو خۆم
کۆنە ئافیشێکی دیوار
لاشان بەربوو
بەدەم (با) وە هەڵ ئەلەرزێ و
وا خەریکە
وردە..وردە
ئەخزێتە خوار !

1995

# تەنیایی

تەنیایی یەك
ساردتر ، لە كرێوە خوێنی ئێوارانی
ئێستەی وولات
دەوری داوم..
تەنیاییەك جارێك ئەمكا
بەو گەڵایەی، چڵەكەی خۆی :
فڕێی بداتە بەر قاچی گەردەلوول و
جارێكی تر بەو باڵدارەی
لە شەوێكی بەفرانباردا
هێلانەكەی خۆی دەریكا!

1995

# ئاوی شیعر

من هەندێ جار
کە ئاو لە وشەم ئەبڕدرێ و
ئەبمە کاغەزێکی قاقڕ.
کارێزکەنێکی خەیاڵم
دائەهێڵمە ناو قووڵایی مێژوومەوە:
خەم هەڵکەنێ و
خەم هەڵکەنێ
تا ئەگاتە ئاوی شیعر !

1995

# سوورەتی ئەوین

لەسەر بەردە نوێژی لەشت
من نوێژی شیعر و
شەراب و
بارانە ماچ ، دائەبەستم
کەسوجدەم برد
بۆ قیبلە قوببەی مەمانت
دەمم گەیشتە کەوسەری بەر گەردنت
من ئەزانم هەڵناسمەوە و
بەدەم خوێندنی سوورەتی ئەوینەوە
ئیتر ئەمرم !

1995

# نیشتمانی ئاگر

دەروونم دارستانێ بوو
هێندەی شەوانی تەنیاییم پان و بەرین
وەك مەراقیشم چڕو پڕ
ئێوارەیەك.. لە پەناوە
تیلەی چاوی شۆڕە ژنێ
پریشکێکی تێهاویشت و
من لەوساوە
بەهەشتێکم ئەسوتێم و
بووم بە نیشتمانی ئاگر!

1995

# حیلە و گرمەژن

ئەوە ئێوەن، ئەمێستاکە ، دیسانەوە
ڕەوە تیشك و ڕەوە زامی
ئەو پێ دەشتەن !
ئەوە ئێوەن، ئەمێستاکە،دیسانەوە..
"بای"ی سروودی مەشخەڵانن و لە پێشەوەن
بەڵێ ئێوەن، ئەمێستاکە، بەدەستەکانی گەرمیان
بە هاواری باوە شاسوار
بەسەری پردێ و کوڵەجۆ
لە دەروازەی سینەی ڕەشی کەرکوك ئەدەن
زۆرتان لەوێن.. ئەتانبینم:
مامەڕیشە بە چل گەزی پشتێنەوە
حەمە ڕەش و کاسکێتەکەی

مەلائەحمەدو ڕادیۆکەی
مەلائاراسو هەگبەکەی..نازم و کۆڵە پشتەکەی
هەموو لەوێن.. ئەمێستاکە
تەنها حیلەی ئەسپەکانی شیعری من و
گرمەژنی هەوری دەنگی
فەرهاد سەنگاویتان کەمە!

1995

# دوو برین

بڕینێکی شەڕی ناوخۆم
بووبە گەڵای هەناسەم و
زوو هەڵوەری
بڕینێکی شەڕی بەغدام
بووبەگوڵ و
گوڵ بوو بە مانگێکی چواردە و
بەتریفەی سوورمەچنی
هەموو مێژوومی داپۆشی!

1995

# دیاریی

لە هەکاریی
پێنج سەد مەترێ لەوبەرەوە
وەك چاوی گوڵەبەڕۆژە
ئازادیی چاوی خۆی پیشان ئەدا .
بۆ ئێوارە
دەستی ڕاست و قاچی چەپی
لەسەنگەرا
بەجێهێشت و
بۆ چاوانی خۆشەویستی کرد بەدیاریی.

1995

# جوانە دڕندەکە !

تانسۆچیللەر !
تابلۆیەکە لە قژی زەرد
دووچاوی مەست
لە گەردنێکی کافووریی‌و
سنگێکی بەرز.
تانسۆچیللەر !تابلۆیەکە
لە ئاسمانی لەشێك سپی
ورد بەرەوە !
لەو قژەدا تەلبەندی دڕکاویی شەوو
لەو چاوەدا  نووکە سوونگی‌و
لەو ملەدا ئەڵقەی پەت‌و
لەو سنگەدا نارنجۆك‌و

گولله تۆپو

سەری براوم ئەبینی!.

باش گوێ بگره

له ئاسمانی ئەو لەشەیشدا

قیژەی ئاوەو

قیژەی دایکەو

زریکەی مێژووم ئەبیسی!.

1995

# مــاچ

دووباڵدار بوون
دوودڵدار بوون
لە ئاسۆیەکی نارنجیی ئێوارەدا
بەدەم فڕینی عەشقەوە یەکیان ناسیی.
بۆ یەکەم ماچ
نزیکترین وێستگەی ئەوین
تاقە هەواری نیشتنەوە
دوو دارتەلی کارەبا بوو
بەرامبەر یەك..
گمە گمیان گۆرانی بوو بۆ یەکەم ماچ
گمە گمیان هەڵقرچان بوو بۆ یەکەم ماچ
بەرامبەر یەك..

**مل درێژ بوو**

**له یەکتری چوونە پێشێ**

**پێشتر.. پێشتر..**

**هەتا دەمیان گەیشتە یەك**

**هەرئەوەندەو**

**تەزووی بازنی کارەبایش هاتەوە یەك**

**هەر ئەوەندە و عاشقانی بۆ ماچ تینوو**

**بەدەم ئاگری ماچەوە**

**کەوتنە خوارێو**

**بوون بە ڕەژوو!**

بوراگ
1995/3/23

# زەماوەندی دوا ڕۆژ

بۆ قادر دیلان

مالێك.

مۆسیقارێك.

بوخچەیەك نۆتە !.

ڕۆژێك دێت.. پیرێتی

دەستی مەرگ ئەگرێت و

ئەیهێنی بۆژووری خەوتنی مالەكە.

ئەوساكە مۆسیقار ئەبێتە

پەپوولە پایزەی سەر ئاوو

وەك خەونی ناو تەمی چنارێ

لە چاوان ون ئەبێ!.

هەروەها ڕۆژێك دێت لێرە نا

لە دوور دوور ، ولاتی مۆسیقار

بە پەنجەی بەفر و با

كە بوخچەی كردەوە

**نۆتەکان وەك پۆلە ئەستێرەی باڵ گرتوو**

**لەسەری کێوان و**

**لەگەرووی مێژوودا**

**وەك شایی وشەو گوڵ**

**دەست ئەکەن بە سەما!**

1995

# ئەوینی سپی

من وامزانی تەوقەیەکە ڕاگوزاری و
ئیتر دەستم دەستەکانت بەجێ دێڵێ.
من وامزانی سەرنجێکە ڕێبوارانە و
ئیتر چاوت چاوەکانم بەجێ دیڵێ.
من نەمزانی و بەختەوەر بووم کە نەمزانی .
ئەوا ئێستەیش
دەستەکانت بوونە هێلانەی هۆنراوەم .
من نەمزانی و بەختەوەر بووم کە نەمزانی .
ئەوائێستەیش
چاوەکانت بوونە پرشنگی سەرچاوم
ئاه.. گیانەکەم!
لە ڕێ و بانی ئەم ئەوینە سپییەدا
ئێمە ئێستە بووین بە دەستێك
ئێمە ئێستە بووین بە چاوێك

**ئێمە ئێستە بووین بە دڵێك**

**ئاه.. گیانەکەم!**

**دووکەس بووین و**

**لە جیهانی ئەم عەشقەدا**

**بووین بە کەسێك!**

1995

# نامە

سبەینێ هەر لە ڕێی پۆستەوە
هەورێکی بچکۆلەت پێ ئەگات
کە وەختێ کردتەوە
ژوورەکەت پڕ ئەکات
لە بۆنی دایکت و
لە نمەی بارانی چنارۆك!.

1995

# تۆ

تۆ ئەگەر درەخت بوویتایە
دار هەرمێی گوڵ سپی ئەبووی.
تۆ ئەگەر کانی بوویتایە
لە بناری کەکۆن ئەبووی.
تۆ ئەگەر چرا بوویتایە
چرای سەر شاعیرێك ئەبووی
ئەگەر شارۆچکە بوویتایە، کۆیە ئەبووی.
ئەگەر کتێبێك بوویتایە، مەم و زینی خانی ئەبووی .
ئەگەر تاڤگە بوویتایە، بێخاڵ ئەبووی.
ئەگەر قەڵەمیش بوویتایە،
قەڵەمەکەی شێرکۆ بێکەس ئەبووی!.

1995

# مەهێڵە

**نەء مەهێڵە ، ئەی گیانی من ، تۆ مەهێڵە**
**لە باوەشی پڕ پرشنگ و لە بەهاری ئەو سنگەتا**
**زریانی زەرد بمفرێنێ**
**نەء مەهێڵە و بەهەردوو دەست**
**وەکو کەوێکی کەسیرە**
**سەرم بگرە و**
**لە ژووری گەرمی مەمانتا**
**لە بێزاری و**
**لە وەڕسی و**
**لە پیرێتیم.. بشارەوە!**

1995

# بەرد

لەسەر تەوقە سەری ئەزمەڕ
وەختێ زەردە.
لەو ئاستەدا کە شار وەکوو باخی نارنج
یان ئەستێرکی کەڵە پشکۆ ، دەرئەکەوێ!.
لەو ئاستەدا بەردێك هەیە
وەکوو مێژووم تاق و تەنیا .
وەك مەزاری (نەجم الدین)ی کەشتییەکەی نووح
تاقو تەنیا.
بەردێ جێ پەنجەی حەزرەتی نالی و سیمای ئەوی لەسەر
نەخشە
بەردێ وەکو جەستەی شیعری (فایەق بێکەس)
هەمووی ڕێ ڕێ.
بەردێ تەنها چەند مانگێکە
دوا تەڵزمی کۆستێکی نوێ
لە دەستەکانی بۆتەوە و

**ئێستە مەرگ و ئێستە شەوو ئێستە خوێنی**

**لەسەر ئەڕوێ.**

**بەردێ، بەردێ کە بینیتان لائەدەن و**

**دەوری ئەگرن**

**یەکە یەکە یان بە کۆمەڵ ئەچنە سەری و**

**بۆ یادگار لەگەڵ شاخ و لەگەڵ هەور و**

**لەگەڵ خەم و لەگەڵ یەکدا**

**وێنە ئەگرن!..**

**بەردێ..بەردێ**

**ئازیزینە! خۆم گۆڕیوە خۆ دەرناخەم**

**من لەسەر دەم پاڵ کەوتووم و**

**سەرم دێشێ و پشتم دێشێ و**

**دەنگیش ناکەم**

**ئەو بەردە**

**منم**

**من!**

1995

# هەڵبژاردن

له نێو هەموو کتێبخانەی شەودا
من یەك کتێبم هەڵبژارد:
ئەویش یادداشتی تەنیایی
ئەستێرەیەکی غەریب بوو!.
له نێو هەموو گۆرانییەکانی چیادا
من یەك گۆرانیم هەڵبژارد
ئەویش گۆرانی! ئازادیی
دار بەڕوویەکی شەهید بوو.
له نێو هەموو خەونەکانی یادگاردا
من یەك خەونیانم هەڵبژارد
ئەویش خەونی زەردوو سووری
منداڵیی بوو.

**بەڵام من خۆم**

**نە ئەوینی خاکو خۆڵی**

**کوردستانم هەڵبژاردو و**

**نە ئەوینی چاوی دایکم**

**کەچی هەردوو، لە گشت ئەوینێکی دیکەی**

**دنیای گیانم**

**ڕووناکتر و**

**گەرمتر و**

**گەورەتر بوون!**

1995

# تەماشا

ماوەیەکە من خۆم فێری
زمانی زەریاکان ئەکەم
هەتا ڕۆژنامەی شەپۆل و
گۆڤاری تەم بخوێنمەوە و
لە گفت و گۆی : نێوان هاژە و
کەنار بگەم !.
ماوەیەکە من خۆم فێری
نۆتەکانی باران ئەکەم
تا گیتاری (با) بژەنم و
پیانۆی ڕێژنە لێدەم و
لە کۆنسێرتی جۆگەکان و
لە کۆڕاڵی ڕووبار بگەم!.
ماوەیەکە من خۆم فێری
مەلەی ناو بێدەنگی ئەکەم

**هەتا گێژەنی پرسیارم قووڵ بێتەوە و**

**بچمە ژێر وشەکانەوە و**

**دەستبەم لە بنی نەهێنی و**

**لە گومان و**

**لە مردن و**

**لە خوا بگەم.**

**ماوەیەکە من خۆم فێری**

**هەڵگەڕان ئەکەم بەشەودا**

**هەتا چاوی ناو مەترسیم تیژ بێتەوە و**

**بچمە سەر دوندی تەنیایی و**

**لەوبەرزەوە**

**سەیری جیهانی خەم بکەم .**

1995

# توانەوە

کە تۆ ڕۆیشتی .. کورسیەکەت و
تەڵێ گوڵ و
پەرداخەکەت
لام مانەوە
یەکەمیانم کرد بە تەختی شاشیعرێکم .
دووەمیانم
لە کەنار ڕۆحما ڕووانەوە
سێهەمیشیم
پڕکرد لە ماچی ئەو دەمەو
هەڵم بڕی بیخۆمەوە
کەچی من خۆم
تیا توامەوە!!.

# قژ

قژت خەمێکی درێژە و شەوی شیعرە
منیش چرای کورتە باڵاو
قەڵەمێکی بە وەنەوزم
نە ئەو خەمەم پێ ئەبڕدرێ و
نە ئەیگەمێ و
نە ئەشتوانم ئێشکی سیحری
زەریا بگرم!

# ڤینتسییا

ئۆها! دیدەنی
ڤینتسییا
لە ماچی عاشقان ئەچێ:
نە ژمارەی
ئەو ماچانە
تەواو ئەبێ و
نە گیان هەرگیز
تێر ئاو ئەبێو
نە دەم
تاقەتی لێی ئەچێ!

1995

# تاقەجار

ئەو سەرنجەی گرتتە چاوم
هێندەی نەبرد، وا هەستم کرد:
چاوانم بوون
بە دوو زنەی گوڵ و شیعر و
لە بناری نێو چاوانما هەڵ ئەقوڵێن .
ئەو دەستەی خستتە دەستمەوە
هێندەی نەبرد وا هەستم کرد
دەستەکانم
بوون بە شەقامی تریفە و
(مەم و زین)ی پێدا ئەڕۆن.
بۆ تاقە (ماچی خوداییش)[1]
من چی بڵێم؟!
هەتا ئێستەیش وا هەست ئەکەم

---

[1] ماچی خودایی: وەك (هێمن)ی شاعیر ئەڵێ.

**هەر ئەوجارە**

**تاقە جار بوو**

**لە توانەوەی ئەو ماچەدا**

**من کێوی توورو**

**من مووسا و**

**خودام دیوە !**

# دەنگدانەوە

لە دەنگدانەوەی بێ دەنگیی .. خەمەکانتا
لە دەنگدانەوەی بێ دەنگیی..زامەکانتا
لەدەنگدانەوەی بێ دەنگیی ..جوانیەکەتا
زرنگەی ڕەنگی زەریایەك ئەبیستم و
زریکەی بۆنی مێژوویەك ئەبیسم و
گوێم لە هاواری سووتاوی تەماشات و
قیژەی چاوتە!

1995

## مەحوی

ئەم بەردەوام گومانێ بوو
یەخەی گەردوونێکی ئەگرت.
پرسیارێ بوو
لەناو پرسیارێکی تردا
پرسیارێکی دیکەی ئەکرد!

1995

# مەولانە خالید

مەولانە نمەی وەجدی خوای
وەکوو فرمێسك
لە پێڵودا هەلگرتبوو.
بۆیە وەختێ کە بەسەر شەودا ئەگریا و
لە دوو ئاوانی ئیشراقا ئەتوایەوە
دڵۆپەکان
لە خەڵوەتا
ئەبوون بە ڕیزە چرای نوور!

1995

# بۆ دوومیوان

لەسەر بەردێ
بەیان پرچی بارانێکی ئەهۆنیەو .
لە دەفتەری مێرگێکیشدا
بارانیش جۆگە شیعرێکی ئەنووسیەوە.
لە جۆلانەی شەپۆلیشدا
شیعریش بەدەم سەمای وشە و درەختەوە
بۆ دوودڵداری میوانی
دیوانی باران و کەژ و
خەونی بەرد و
ئاسمانێکی ئەخوێندەوە.

1995

# سێ زمان و چوار قامچی

لەناو ئاپوورەی مەراقی گشت دنیادا
هەر لە دوور ڕا
مەراقی خۆم ئەناسمەوە
مەراقی من :
قژی سەوزەو
ڕیشی خوێناوی و
چوار خاچی وا بەکۆڵەوە و
مەرگیش بە سێ زمانی جیاو
چوار قامچی بە دوایەوەو
تەوق لە گەردن
کەچی نەچۆك دائەدات  و
نە بێ دەنگی ئەکات مردن!

1995

# باران

**کە ئەگریایت**

**لەو ساتەدا هەورێ بووم و لە چاوتا بووم**

**کە دارژای، گەرم.. گەرم**

**دڵۆپێ بووم لەخەمەکانی ئاسمانت**

**وەختێ گەیشتمە سەر لێوت**

**جارێکی تر هەڵم بووم و**

**هەناسەی ساردت لێی دام  و**

**دیسانەوە من بوومەوە**

**بە بارانی نیگاکانت!**

1995

# کوا تۆ تەنیای

کوا تۆتەنیای! تەماشاکە
هەر چوار دەورت ، سەر چرپاکەت، ژێر چرپاکەت
سەرلێواری پەنجەرەکەت ، ناو گیرفانی جلەکانت
ناو جانتاکەت
خانەخانەی کەنتۆرەکەت
ژاوەیان دێ و
جمەیان دێ و
هەموو پڕن
لە فرمێسکی جوانی دایەو
لەشیعری من !
کوا تۆ تەنیای؟!

1995

# تەنیایی

تەنیاییت ژوورێکە بۆ شیعری غەریبیم
لە ناویا، ئەبارێم ، دائەکەم ، شەست ئەکەم
سەرتاپای کەژانی خەمانت تەڕ ئەکەم.
ئەی کچی نامۆیی و هەڵقرچان !
تەنیاییت هەروەکو تەنیایی کوردستان
بە هەردوو
کردوومیان بە چاوی زستان و
بە داری گریانی
دوای خەزان!

1995

# هاتنت!

به بەیانیان پەپوولەیت و
لەگەڵ گزنگدا دێی بۆ لام.
به نیوەڕوان پرژەی ئاوی و
لەگەڵ شەماڵدا دێی بۆ لام
به ئێواران گوڵ هەناری و
لەگەڵ ڕەنگی خۆر نشیندا
ئەگەیتە لام
به شەوانیش
هەتاوەکو گزنگ دێتەوە
ئەستێرەیت و
گۆرانیت و
دواشیعرمی و
لەناو خەوما ئەجریوێنی.

1995

# زەرفی تابوت

تۆ هەورت نارد
باراننامە بداتە دەست
ئەم کاروانسەرای غوربەتەم.
تۆگوڵت نارد
باخچەنامە بداتە دەست
ئەم بیابانی غوربەتەم.
تۆ تیشکت نارد
گزنگنامە بداتە دەست
ئەم تەم تومانی غوربەتەم
بەڵام لەناو سلۆپیدا
بەیانییەك لەسەر شەقامی ئەتاتورك
هەوریان کوشت و
گوڵیان کوشت و
تیشکیان کوشت و
لە دواییشدا

# خەم و خەم

ـ بەیانیت باش بەفری هاوڕێ !
بۆ تەنیاییم چیت هێناوە؟!
ـ خەمێك سپی!
ـ نیوەڕۆت باش نمەی بارانی غەریبی!
بۆ تەنیاییم چیت هێناوە؟!
ـ خەمێکی تەڕ.
ئێوارەت باش؛ (با)ی بێ داڵدە!
بۆ تەنیاییم چیت هێناوە؟!
خەمێکی تیژ.
ـ شەو باش؛ باڵندەی تاریکی!
بۆ تەنیاییم چیت هێناوە؟!
ـ خەونێ، نەبەفری تیا ئەنوێ و
نە باران ونە(با)و
نە تەنیایی و
نە چاوەکانی شاعیرێ!

1995

# خەیاڵ

بێ ئەوەی لای هیچ ڕووبارێ خوێندبێتم
بە زمانی ئاو ئەنووسم.
نەچومەتە قوتابخانەی هیچ کەژێك و
درەختەکان ئەخوێنمەوە
نە هەور مامۆستام بووەو
نەچومەتە هیچ کۆرسێکی زستانەوە و
بەڵام هەموو قەسیدەکانی باران و
بەفر و باڕێزەم لەبەرە..
لە پەیمانگای باڵای زریان و گەردەلوول
هاژەو گڤە ، دەرنەچووم و
بەڵام لە باندی مۆسیقاو سیمفۆنیای
هەموو وەرزەکان تێ ئەگەم.
من خەیاڵی ناو گەردوونی
شیعرستانم!

1995

## لەبری من!

من ناتبینم بەلاَم گۆیژە ئەت بینێت و
ئەویش چاوی منی تیایە .
من ناتبینم
بەلاَم هەزار مێرد ئەتبیسێ و
ئەویش گوێچکەی منی تیایە.
من ناتگەمێ و لاتەوە نیم
بەلاَم خەم ڕاکشاوی تەنیشتەو ئەویش :
بۆن و ئەویش پەنجە و
ئەویش هەموو ماچەکانی یادگار و
کزەی شیعری منی تیایە!

1995

# ژەنەڕاڵ

ئەی ژەنەڕاڵی پیرەڵۆك
ئەو ڕۆژەی تۆ لە بەرۆكو لە گیرفانی
ناو زاخۆدا بۆم ئەگەڕێی
من ئەوكاتە لەناو گەرووی دەرسیم دام و
بووم بە تیشك و
بووم بە باهۆز.
ئەی ژەنەڕاڵی پیرەڵۆك
ئەو شەوە تۆیش
لە ماڵەكانی دەرسیمدا بۆم ئەگەڕێی
من ئەوكاتە وەكو هەور
چوومەتەوە
چیای جوودی و
بوومەتەوە
بە باران و بە برووسكە و
بە هەڵۆكەی ئاگری نەورۆز
ئەی ژەنەڕاڵی پیرەڵۆك!.

1995

# ئێوارەیەك

هەزار ڕێکەوت، بوون بە هەزار
شەوی مقەست
باڵیان کردم .
هەزار ڕێکەوت، بوون بە هەزار
دەستی کۆست و
قفڵیان کردم
هەزار ڕێکەوت، بوون بە هەزار
دارە مەیت و
هەڵیان گرتم.
بەڵام تاقە ڕێکەوتەکەی تۆ بوو
ئێوارەیەك
بوو بە ئاسمان
بوو بە کلیل
بوو بە لانکە و
بووم بە شیعرێکی نوێ تر و
دەم بە گۆرانیی هاتمەوە!

1995

# گـا

من هەموو ڕۆژ
لەسەرە ڕێی هاتوو چۆمدا
گایەکی کەتە ئەبینم
بە شێوە . بە ڕەنگ، بە بۆڕە
هەر ئەو گایەیە باپیرم
بۆی باس کردم
هەمان کەللە و
هەمان قۆچ و
هەمان کلك و
هەمان تەوێڵ
ئای
دیمیرێڵ!!

1995

# بەردەوام خۆشەویستی

به پەلکە گیایەك ئەنووسم و
دارستانێك
ئەخوێنمەوە.
دڵۆپێ باران ئەبینم
گوێم لە هاژەی
زەریایەکە.
دەنکە گەنمێ لەسەر دەستمە و
خەرمانێ وا
لە گیانمایە!.
تاڵێ قژی یارم پێیە و
خۆشەویستیم
لە پاڵدایە.
من ئێستاکە
یەك دێڕ شیعری (نالی)م لایە و
کوردستانم
لەگەڵدایە!.

بە ڕێبەرێتی مەراقی شۆخو شەنگ بوو.
بە ڕێبەرێتی مەراقی کەڵەگەتتر لە زریانی چیاکانو
چاو گەورەتر لە دۆزەخو، سەرنج تیژتر لە تەنیایی

گەیشتیتە سەر ترۆپکی ئەم "زمان"ەو
ڕەشەبات کرد بە جۆلانەو
زایەڵەت کرد بە برووسکەو
باران بە پرچی گۆرانیی.

تۆ ئەوینی ناو ئاگر بووی.. تا نەسووتای باڵت نەگرت.
تۆ ئەوینی ناو بەفر بووی.. هەتا نەتبەست هاژەت نەکرد.
تۆ ئەوینی ناو برین بووی.. تا نەوەریت ڕەنگت نەگرت.
تۆ درەختی بەر باهۆزی کارەساتو مەرگەساتو
ڕێی نەهاتو
سەر کەناری ئاوی ڕەش بووی
هەتا ئازار ڕاینەژەنیت..
هەتا باڵندەی گومانو تەیری ترسو
تا کۆست لە سەری نەخوێندیت
چرۆت نەکرد
دەنگت نەگرت
باڵات نەکرد.
تۆ هۆدەیەکی بێوەژن.. نیشتمانی یەکەم ئاخو
مێرگی یەکەم گریانت بوو.
تۆ کراسە قەترانییەکەی بەری دایکت
یەکەم شەوی گەشانەوەی خەمانت بوو.

**من ناوم خەونە.**

**خەڵکی وڵاتی ئەفسوونم.**

**باوکم شاخەو**

**دایکم تەمە.**

**من لە ساڵێکی مانگ کوژراوو، لە مانگێکی هەفتە کوژراوو**

**لە ڕۆژێکی سەعات کوژراودا**

**دوای شەوێکی ئاوس بە "با"**

**دوای شەوێکی پشت کۆماوەی هەوراز بە کۆڵ**

**بەرەبەیانێکی زامدار**

**لە شەفەقێکی کەسکەوە**

**وەك گزنگێکی خوێناویی کەوتمە خوارێو**

**داگیرسامو بووم بە مۆمێك**

**گڕ بە ملو**

**بووم بە پرسێك**

**دەم بە هاوار.**

**تۆ لە گەڕەکی گاوراندا بووی بە تۆو و لە دایك بووی.**

**ژنە دیانێکی هاوسێ، مریەمێکی گوڵەهێرۆی،**

**ڕواو لەناو تاریکیدا، گەنم ڕەنگێ وەکو گۆیژە،**

**ناوکی بڕیت. هێشتا لەناو کاسەدا بووی،**

**مریەم بە کڵۆ خەڵووزێ، لەسەر تەختی نێوچەوانت،**

**وێنەی صەلیبێکی کێشاو تاجەدڕکی کردە سەرتو**

**لە باوەشی نامۆیی خۆیو عیسادا، وەك کارژۆلەیەکی تازەزاو،**

ماچی کردیو هەڵیگرتیت. ژنە دیانێکی هاوسێ
نەفرەتێکی نێو شارەکەت، چارۆگەی یەکەم قوماتەی
ئەم سەفەرەو یەکەم خاچی ئەم ژیانەی بە تۆ بەخشیی.
لەو ساتەوە، من گوناهی ڕووتو قووتی دەرکراوی
ئەو بەهەشتەم کە نەعلەتی کرد لە بوونم.
کە نەفرەتی کرد لە بێشکەم.
لەو ساتەوە من ئەو "پرس"ە ئاوارەیەم
ئەو سۆراخە شێتو وێتەم ئەگەڕێمو
ناگەمە خواو ناگەمە تۆو ناگەمە خۆم.
لەو ڕۆژەوە من تەوێڵم چوار ڕییانی
خەونی چوار پارچە کراومەو
لەو ساتەوە سەرم پاشای
مەملەکەتی شپرزەییو قەڵبەزەی دڵەڕاوکێیەو
گلۆڵەی سەر ئەسپی ئەجەل.
لەو ساتەوە ناوچەوانم چارەنووسم ئەسووتێنێو
لەگەڵ مەرگا بووم بە هاودەم.

باوکت دەوەنی شاخێکی بەر بارێزەو ڕەهێڵە بوو
لە ئەنگۆرەی زستانێکدا، کە ئەفسانەی پیرەمەگروون.
زاوو زێی کرد بە ڕەوە جوانووی ئازادیو بە کەوێڵو
بە ئەشکەوتی هاوارەوە. هەر ئەو کاتەیش چەخماخە
ئەوی نووسییەوەو ڕەشەبا کردی بە ئەسپو برسێتیی

کردی بە دەغڵو شەو بە چرا. باوکت بەستەی
نائومێدیو پێکەنینی ئەشکەنجە بوو. دەنگی باوکت
دەنگی بەفرو دەنگی گڵو دەنگی گوڵ بوو
سەرزەنشتی کلیلێکی دەربەدەر بوو. باوکت گەرووی
برینداری سەربەستیی بوو. لەو قوڕگەوە هۆن هۆن
وشەی یاڵ خوێناویو تنۆك تنۆك مەراقی کاکۆڵ
زێڕینو، نمە نمەیش سەرگوزشتەی مێژوویەکی مەستو
سەرخۆش، دائەباریو دائەچۆڕا. باوکت زیندان کردی
بە مانگ. ئاوارەیی بە نیشتمان. بوومەلەرزە بە
سروودو، کۆتو زنجیر بە مامۆستا. باوکت زەنگێکی
بێکەسیی ژێر چوخمەکانی بێ هۆشییو کەڕەواڵەی ئەم
شارە بوو، هاوارێکی گلاراو و قیژەیەکی سەربڕاوی
ئەو خەڵکە بوو، هەر لێی ئەداو، هەر لێی ئەداو،
نە ئەبیسترا. ئەو داخێ بوو بە داخی خۆیدا ئەچزا.
ئەو لە پەرداخی بادەدا، دیرۆکێکی سەرماوسۆڵی
بەفرانبار بوو، کلوو کلوو ئەتوایەوە. ئەو لە پەرداخی
بادەدا، سەری خۆیو سەری مێژووی کاسو وڕی
ئەم غوربەتەی نوقم ئەکرد. ئەو لەوێدا جێی بۆ برینی
بێ دالدەی خۆی دائەخست. ئەو لەوێدا ئەم جیهانی
بێهوودەییو ئەو دووکەڵی پرسیارانەی بە "با" ئەداو
تیایدا ئەنووست. ئەو قەڵەمەکەی بەورێکی فەرەنگی بوو.
چنگی ئەدا لە شوورەکانی تاریکییو چڕنووکی ئەگرت لە پێستی

خورافاتو ئەچۆوە بە گژ شمشێری ناو مەرگدا.
ئەو ساتەی تۆ کەوتیتە ناو کاسەکەوەو خاچ بوو
بە یەکەم لانکەتو بە سێ بزماری دەستو پا،
هەر ئەو ساتەیش ئەو لە ناو کاسەی بادەدا، مەراقێکی
سپی تازەی ئەخواردەوەو جنێویشی بە سوڵتانو
بە حاجی تووتن فرۆشو بە وەفدی میللەت فرۆشو
بە دنیایەکی پیس ئەدا!

گەورە بوومو خاچیش لەگەڵما گەورە بوو
باڵام کردو دڕکیش کەوتە بەژنو باڵا.
ئەمە کۆچی ئەزەلیی نائارامییەو، کۆچی چاوەو
ڕەوی هەستم.
ئەمە گەشتی جەستەیەکی پەرشەو
هەڵوەدای ڕۆحێکی بەندو
هەڵفڕینی پەنجەکانی هەردوو دەستم.
ئەمە چیرۆکی کانییە.. لە سەرەتای شلوێ بووندا
"ڕێبوارە با، بۆ ئێوەی ئەگێڕێتەوە"
ئەمە چیرۆکی ماسییە، لە سەرەتای بەر قولاپو پێوەبووندا
"وردە شەپۆل، بۆ ئێوەی ئەگێڕێتەوە".
ئەمە فامی گوڵاڵەیە، لە سەرەتای تێکەڵبوونی
گەشانەوەو هەڵوەریندا
"تەمو مژێ، بۆ ئێوەی ئەگێڕێتەوە"

ئەمە یادداشتی بەردێکە، لە سەرەتای خلبوونەوەی
خەونەکانیا..
"مانگەشەوێ، بۆ ئێوەی ئەگێڕێتەوە".
ئەمە چیرۆکی ونبوونی پەلکەگیایەکی وشەیە
لە ناو بێشەڵانی پرسا..
ئەمە چیرۆکی ونبوونی.. کچە شیعرێکی ئازایە
لە کیشوەری پیاوو ترسا..
ئەمە دووکەڵە ئەو وەختەی
ئەبێ بە جۆگەلەی ئاسمان.
ئەمە زووخاوە ئەو وەختەی
ئەبێ بە ڕێژنەی باران.
ئەمە زیندانە ئەو وەختەی
ئەبێ بە هەموو نیشتمان.
ئەمە ژانە وەختێ ئەبێ بە گزنگو
ئەمە مەرگە وەختێ ئەبێ بە ژیانو
ئەمە پەنگخواردنەوەی گومانی ناوسەری هەورو
سەری منە
وەختێ ئەیکا بە باوبۆران!

تۆ نە خەونو نە سێبەری خەونی بناری "زەردیاوا" و
نە پەنجەرەکانی هەتاوی تەڕی "قۆپی" و نە ماڵانی
باوەش پڕ لە گوڵەزەردی "قەرەداغ"ت لە بیر نییە.

تۆ کۆنترین ئاگردانی ئەم "زمان"ە و بەردەنوێژی
ڕوو لە خۆری ئەم مێژووەت لە بیر نییە. تۆ جێ قوربانیی
کیژانی ئاهورامزدات لە ئاتەشگەی بەرپێیەکانی،
زەردەشتا بۆ: خواوەندی ڕووناکییو ڕەزو گوڵەگەنم
لە بیر نییە. تۆ ئەودەمە بەچکە شیعرێکی سێ ساڵ بووی
زەڕ نەفووتەی کونەشاخو ویزەویزی هەنگێکی تازە
باڵگرتووی، شانەکانی ناو کلۆری پیرەدار بووی.
تۆ خەون بووی لەناو خەونا.
تۆ ئەو دەمە لە تای خورجێکی پارسەنگی هەندێ
کتێبی باوکتا، سوار ئەکرایتو دائەبەسترای.
قۆڵی چەپتیان بە سرکەییو سەربەستێکی مۆری
دایکت ئەجەڕانو گرێ ئەدا. ئیتر ئەم شاخ،
ئەیدایتە دەستی ئەو شاخو جۆگەیش پڕ بە
گوپەکانی، زیوی ئاوی، پرژەساردی پیائەکردی.
پەنجەی دەستە شۆڕەکانی درەخت، لە پێچی لاڕێو
پلەدا، لە دواوە قژیان ئەگرتی.
تۆ ئەو کاتە جانتایەکی بچکۆلانەی سەفەری
نێوان بێداریو بێ ئاگایی وێستگەکانی ناو سروشت بووی.
تۆ تۆپەڵێ قوڕەسوورەی لەشی گۆیژەو پیرمەسوور بووی:
گڵەزەردە لەناو دەستیا بە هێواشی
ئەیشێلایتو ئەیکردی بە گوڵی سپی دارهەرمێیەك.
یان ئەیکردی بە گوڵۆنکەی بەرگەردنی ئەستێرەیەك.

یان بە گوارەی گوێی چرپەیەك.
ئەزمرڕ لەناو دەستەکانیا بە هێواشی ئەیشێلایتو
ئەیکردی بە گۆزەڵەکەی، فێنکەئاوی،
ناو چیغەکەی هاوینە شەوی "پیرەمێرد"
یان ئەیکردی بە پەپوولەی
ئالاو لە ڕیشو لە قژی "مەحمود جەودەت"،
یان ئەیکردی بە مرواری زیخو چەوی بن کانیەکەی
گیانی "گۆران"
مامەیارە لەناو دەستیا بە هێوری ئەیشێلایتو
ئەیکردی بە گەڵایەکی دارمێوەکەی ماڵی قودسی.
یان ئەیکردی بە کڵۆیەك لە سەهۆڵی
ناو بادەکەی ڕەفیق حیلمی.
بازیانیش لە ناو دەسیا ئەیشێلایتو
لە دواییدا ئەیکردی بە:
مشتووی خەنجەری بەرقەدی داریکەلی.

تۆ خەون بووی لەناو خەونا.
تۆ پیاوانی "قەرەداغ"ی وەك "نارامسین" کەللەکەڵو
وەکو هەرێز سنگ تووکنو وەکو دەربەندی باسەڕە
چاوقایمت لەبیر نییە. تۆ خەون بووی لەناو خەونا.
تۆ ژنانی "قەرەداغ"ی پەلکەڕەنگینە لە دەستو
گەواڵە هەور بە سەرو

چەمی دێوانە لە دڵت لە بیر نییە.

تۆ خاچێکی سێ ساڵان بووی

هەر لەوێ بوو، بەیانییەك، لە پڕێکدا تەمێ بەرماڵانی داگرت

لە تەمەوە شاخەخاچێکی سووریاوی بریقەدار، لە ئاسۆوە،

هەستایە پیان. لە خاچ زیاتر، چاوێ نەبوو چاو ببینێ،

چوارپەلی خاچ چەپۆکانی ئەهاوێشتو ئەیکرد بە ناڵەو برووسکە.

لە پڕێکدا تەم ڕەوییەوەو لە بەر دەرگای حەوشەتاندا،

جادووگەرێ، ژنە قەرەجێکی ڕەشی غەزێم لە لووت،

وەك سێبەری ئەفسانەیەکی (لۆلۆ)کان بەدەرکەوتو

دایکت بانگی کردە ژوورێ. دایکت پێی وت:

-تۆ بەختی خۆم بەرە دەست" با".

من خەوت بۆ ناگێڕمەوە.

دوێنێ هەر لەم ژوورەدا بوو..

زەردەپەڕێ چووم بۆ کانیی

لەسەر کەوڵی ئەم گامێشە

ئەم کوڕەم بەجێهێشتبوو.. هەر خۆی تەنیا

کە هاتمەوە.. بینیم مارێ

لە تۆ ڕەشتر، لە زووخاوی باوکی ڕەشتر

درێژ وەکوو باسکی شەیتان

درێژ وەکوو دارەڕایەك..

ئاڵاوەتە کوڕەکەمو سەری خستۆتە سەرشانی

سەری خستۆتە سەرشانیو ماچی ئەکات!

به یەکەوە گەمە ئەکەن.
به یەکەوە پێئەکەنن.
وەك به چرپەیش نەهێنییەکی پێ بڵێ..
هەر ئەوەندەو بەربوومەوەو بوورامەوە
که وەختێ چاوم کردەوە
مار دیار نەبوو
مار ڕۆیشتبوو!

ژنه قەرەجی جادووگەر بەردەمۆری هەڵدایه سەر
کەوڵی گامێش، بەردەکان بوون به خاچێك‌و دوایی وتی:
-ئازار به دوای کسپەی خۆیدا
ئەم تەمەنه وەك ڕێچکەخوێن ڕائەکێشێ.
مار ژەهری خۆی به عاشقی خۆی بەخشیوە.
مار ئاڵاوەته ئەوینی هەڵبژاردەی.
مار نەهێنیی زمانێکی پێ بەخشیوە
که گەورە بوو
وشه ئەکات به ئەفسوونێ
خەون خۆی دێ‌و لەسەر ڕانی
نەهێنیی دڵی یەزدان‌و پێغەمبەرانی یەزدان‌و
ئەم گەردوونەی بۆ ئەنووسێ.

من خاچی مار تێئاڵاوم.

من نەفرەتێکی یەزدانیم.
من سێ بزماری ڕواوم!

من لە ئەلفو بێی بەردەوە.
لە ئەلفو بێی کلووی بەفرو، لە ئەلفو بێی ئاونگەوە،
لە ئەلفو بێی ئاگرەوە، من لە هێلکەی ئەفسانەوە
سەرم جووقا.. من سەرەتا لە کێوی چەرماوەندەوە.
کەوتمە سەرپێ. لە ڕستەی قژبژی دارو،
لە پیتی گڵمتکو حەرفی گڤەو لوورەی ئەشکەوتەوە،
هاتمە دەرێو بووم بە گەردەلوولی سەما.
من سەرەتا چاوم بەخشی بە گەوەی شاخ
شاخیش کردی بە زنەی خۆی.
من سەرەتا چاوم بەخشی بە دارستان
ئەویش کردی بە خەونی خۆی.
من ڕوانینم لەسەر ماهیو لە قڵێشە بەرددا چاندو
لە دواییدا بووم بە ڕێگەی تەلیسماویو داستانی "با".
من عەشقی خۆم کرد بە تەمو مژی گومان.
لە دواییدا بووم بە پرسیار، بووم بە خولیای
دارکونکەرەی گەردوونو خوا.
من سەرەتا ئەم سەفەری ناو گومانو ڕاڕاییەم
لە کەوێڵی بەر ئەشکەوتی هۆمەرقەومو جاسەنەوە
کرد بە تەونی

سۆراخێکی بێ کۆتاییو بە هاودەمی مەراقێکی تاقو تەنیا.
منداڵێك بووم ڕاماو لە قودرەتی شاخی ترسو سەرسوڕمانو
ڕاماو لە ماسولکە ڕەقەکانی مەرگو لە بلێسەی دەم خۆرئاوا.
ڕاماو لە جادووی باڵگرتووی نێو دەربەندو
لە پۆلە قیژەی سەر لوتکەو
ڕاماو.. ڕاماو
لە دەنگدانەوەی بێدەنگیو
لە ڕەنگدانەوەی بێڕەنگیو
لە حیلەی ئاو.
منداڵێك بووم خەونەکانی دارستانم ئەخوێندەوە
بە چاو بۆنی تیشکی ئاڵۆزکاوم ئەکرد.
گوێم لە زرنگەی کاروانی ڕەنگەکانی سروشت ئەگرت.
من ڕۆیشتنی گردو شاخو دار بەڕووەکانم ئەبینی.
زریکەی گۆمو ئەستێركو خۆڵم ئەبیست
هەناوی ئەستێرەم ئەدی
من بە ڕووتی، ڕووتو قووتی، پەریەکانی خوام ئەبینی.
من بە ڕووتی، ڕووتو قووتی، نەهێنیەکانم ئەبینی.
یاریم لەگەڵ (مانگ)دا ئەکرد.
یاریم لەگەڵ پەنجەکانی شەودا ئەکرد.
من هەموو جار لەسەر ڕانی گاشەبەردێك ئەنووستمو
لە دواییدا لە دەنگی ئەستێرەشوانێ دائەچڵەکیم.
من هەزاران پرشنگی زامدارم بینی،

که چۆن سەری خۆیان ئەکرد بە ناو کۆشی پەڵەهەورا.
وەك خەیاڵم من قەڵبەزەم گرتەباوەش.
سواری جۆلانەی کازیوەو کۆڵی تەم بووم.
من زمانی بنچكو بەردو خۆڵەمێشو باخان فێربووم.
من لە دەفتەری بەفردا یەکەم هەڵبەستی خۆم نووسیی.

من خاچی مار تێئاڵاوم.
من نەفرەتێکی یەزدانییم.
من سێ بزماری ڕواوم.

لە بنباڵی چەرماوەندا، "سورداش" ئەتوت کەروێشکێکی
قوڕاوییە. ئەهاتیتەوە ماڵەوە، وەکو جوانوویەکی یاڵ تەڕ،
لەگەڵ خۆتدا، لەگەڵ کۆڵە گژوگیاو ڕێحانەو گوڵەحاجیلەو
مێخەکدا، کۆڵێکیش پرسیارت پێبوو، ئەم کۆڵەیان قورستر بوو،
ڕۆت ئەکردنە بەردەم باوکت. ژوور پڕ ئەبوو لە بۆنی
گیاو لە بۆنی ترسو پرسیارو لە بۆنی قەوزەی گومانو
لە بۆنی قژی سۆراخو لە بۆنی مەرگ.. ژوورێك هەر جێی
دوو سێ چوار خشتەکی شیعرو غەزەلێکی تیا ئەبۆوە،
باوکت شانی دائەدایە سەر بالیفێو تەماشای ڕێچکەی
مێروولەی وشەی ئەکرد، تۆیش لێی ئەچوویتە پێشەوە،
تۆ ئەتپرسی:
خوا گەورەترە یاخود تۆ؟!

**خوا گەورەترە یاخود شاخ؟!**
**تۆ ئەتوانی بمبەیتە لای؟!**
**دەرگای ئاسمان لە کوێوەیە؟!**
**کەی ئەتوانین بە یەکەوە خوا ببینین؟!**
**وەرامەکان پرسیارەکانیان دەرئەکرد.**
**وەرامەکان سیسەڵە بوون.**
**وەرامەکان هیچیان کلیلیان پێنەبوو.**
**وەکو ختە لە پشیلەو وەکو کشە**
**لە مریشکی بەژوورکەوتوو**
**ئاوایش پرسیارەکانیان دەرئەکرد!**
**ئیتر ئەوسا خۆت گرمۆڵەی ناو خۆت ئەکرد!**
**تۆ سیحر بووی لەناو سیحرا. تۆ مات بوونت**
**لە تەمەنت گەورەتر بوو. تۆ لە هەور**
**کوللەو پەردەو کەژاوەت بۆ خەیاڵی خۆت ئەخستە ڕێ.**
**ئەچوویتە ناو ئەستێرەوەو یاریت لەگەڵ تیشکا ئەکرد.**
**سواری شانی مانگ ئەبوویتو سواڵەی خەرمانت**
**دائەگرت. لەسەر بەرزترین لوتکە، کورسی بەفرو**
**پاڵتۆی بەفرو شیری بەفرت بۆ خواکەی خۆت دروست**
**ئەکرد. خۆت گرمۆڵەی ناو خۆت ئەکرد. ئەبووی**
**بە ژیشکی پرسیار. تۆ پرسیار بووی لە پرسیاردا،**
**تا ئەوکاتە تۆ دۆڵپای ترست نەدیبوو، تا ئەوکاتە**
**نەتئەزانی ترس لە کوێیە. تۆ دەموچاویت نەدیبوو،**

تا ئەوکاتە ئاگرەکانیت نەئەناسی. جەهەننمیت
نەئەناسی. تا ئەو ڕۆژەی نەنکت هاتو دایکت
هاتو بەرامبەرت:
شمشێری سوورەتی گڕو مەنجەنیقیان بۆ ڕاگرتی.
نێڵەنێڵی بلێسەکەی جەهننمیان پێ نیشان دای.
ئەژدیهاو عەزیاو درنجیان هێنایە ژێر لێفەتەوەو،
لە سەد لاوە قفلێیان لێ دای!
لەو ڕۆژەوە ئیتر تۆ بووی بە لانەی پرسیاری ترساو.
لەو ڕۆژەوە ئیتر تۆ بووی بە سێبەری وەرامێکی سەر داخراو.
لەو دەمەوە.. بوی بە ئاوێ لە هاژەت بسڵەمێیتەوە
لەو ڕۆژەوە.. بووی بە دەنگێ لە گەرووت بسڵەمێیتەوە.
لەو ڕۆژەوە تۆ ئیتر بووی:
بە هیوایەکی دەستەمۆ
بە پرسیارێکی دەستەمۆ
بە ڕوانینێکی شەرمنو
بە ڕووبارێکی دەسخەڕۆ..

ئەمجارەیان ئەچوویتە سەربالی سیمرخ، ئەگەیشتیتە
کاروانکوژە. دەرگای بەردیان ئەکردەوە، کۆشکی
بلوورین دەرئەکەوت. فریشتەکان وەك هەڵقولێن
لەناو بیرێکی قووڵەوە یەکە یەکە ئەهاتنە دەر،
هەموو خاچی ئاگرینیان بەدەستەوە. هەموو مار

لە قەدیان ئالاو. ئەهاتنو ئەیانبردی لە
ئاوێکی سەوزو سووریان هەڵئەکێشای. وەکو
ماسی پشتت ئەبوو بە پوولەکە. ئەیانبردیو
هەر دووراودوور نێڵەنێڵەکەی دۆزەخی ناو قورئانیان
نیشان ئەدای، دێوو درنجو ئەژدیهاو دۆڵپای خوایان
نیشان ئەدای.. ئەترسایتو ئەتۆقیتو بۆ خۆرئاوا
دایکت لەبەر دەرگای حەوشە هەڵئەتروشکاو
لەسەر سەرت کەڵەپشکۆی ئەکوژانەوە..
هەتا ترسەکانت ڕاونیێ!..
بەڵام ترس دیوارێ بوو.. نەئەڕۆیشتو
چیایەکی قورقوشم بوو ڕاونەئەنرا
تازە ترس.. وەکو کۆڵەکەی بەر هەیوانو
منارەکەی سلەیمانی داچەقیبوو..
تازە ترس بووبوو بە خەڵوزانی ناو دەروون
وەکو هەوا هەڵئەمژرا..
بووبوو بە برۆو بە جومگەو بە چەناگەو
یەکە یەکەی پەراسوکان!
ترس.. ترس.. ترس
لەماڵەوە لەگەڵ ئاودا ئەخورایەوە
لەگەڵ هەویردا ئەشێلرا
لەناو لۆکەی لێفەدا بوو
لە دەرەوەیش تازە ترس وەکوو حەسحەس وەك پاسەوان

ڕائەوەستاو پرسیارەکانی تەوق ئەکرد
ڕێگاکانی ئەپشکنیو دەست بە چەقۆ
وردودرشتی گومانی
لە خەیاڵیشدا سەرئەبڕی!

من خاچی مارتێئاڵاوم
من نەفرەتێکی یەزدانیم
لەسەر ئەم جەستە کۆچەرە
من سێ بزماری ڕواوم!
وەکو باڵام خاچ هەڵکشا، من عاشقەو،
مار ماشقەی تێکئاڵاوی سەر ئەم خاچەین.
هەموو ساڵێ کۆچی باوکت، کۆچی پەڕەسێلکەی شیعرەو،
کۆچی "با"یەکی تووڕەیەو، کۆچی ژانێکی سەرسەختو
سەفەری زام. هەموو ساڵێ ئەم برینە ئازارێ بوو
خوێ بە کوڵو پرسیارێ بوو بە بێ ئاکام.
ئەو زێ بوو. تینووی بوو.
خەون بوو، نەئەخەوت.
کڵپەیش بوو سەرمای بوو.
گەنم بوو.. برسیی بوو.
خۆرێ بوو ئەو وەختەی ئەگیرا هەڵئەهات.
هەموو شەو پەرداخێ بادە بوو مەست ئەبوو سەرخۆش بوو
هەتاکو خەمانی بەریبات!

ژوورێكو چرایەك.. دایكتو حیكایەت.
لە بەینا تۆ گمەی كۆترێ.
زستانو بەفرانبار.. ئاگرو حیكایەت
لە بەینا تۆ جوانووی گوێ گرێ.
وەنەوزو خۆڵەمێش.. مێوژو حیكایەت
لە بەینا تۆ كەوی سەفەرێ.
هەڵەبجە: هەناری هەڵوەریو لە كۆشی شنرویێو گوڵاندا.
هەڵەبجە: پرسیاری سیروانەو سۆراخی شارەزوور
لە كۆچی بێ وادەی باڵندەی گریاندا!
ڕووناكیی زەردباوی پەنجەرەی تاقانەو،
لە سەمای بەفردا پرووشەی تێكئاڵاو
لە یەكتر. زریكەی "با"ی دووری گیرخواردوو
لە داوی چیادا، بۆ "هەبوو یان نەبوو"، بۆ
ڕاوی گردی ڕەش، ترسێكی چەتەوڵ ڕاوەستاو
لە بەردەم دەربەندی ئەژدیهاو وەرزێكی نەهاتدا.
مرۆڤی بچكۆلە ئەوەندەی پەنجەیەك، مرۆڤی چوار
چاوو، مرۆڤی قۆچدارو، فریشتەی باڵداری
كەژاوەی لوتكەیەك، كوڕێكی كەچەڵەی ئازاتر
لە درنج، ئازاتر لە دەشتی ئاگرو لە بێشەی
سوژنو لە مەرگ!
سەرەتا چوارمشقی ئەبوویتە گوێ قوتی
بەردەمی دایكتو پاش تۆزێ سمۆرەی بزێوی

هەڵگەڕاو بە ڕانو بەر سنگو گەردنو
ڕوخساریا، دواتریش کە سەرت ئەکردە
سەر ڕانی ئەبوویتە وشەیەك لە بەستەی زیوینی
ناو دەمیا.

کۆشی ئەو کۆشی گژوگیاو کۆشی باخ بوو
وەختێ ئەچوویتە ناوێوە..
ئەبووی بە گوڵەمێخەکێ.
سنگی ئەو سنگی هەڵەبجەو باخی میر بوو
وەختێ ئەچوویتە ناوێوە ئەبووی بە کانی عاشقانو
گوڵ هەنارێکی شنروێ.
دەستی ئەو دەستی زەڵم بوو
وەختێ ئەیهێنا بەسەرتا
لە کوێستانی سەروڕیشی مەولەویدا ئەڕوایتەوەو
هەڵئەتۆقیت، ئەبووی بە پەلکی قارچکێ.
ڕانی ئەو ڕانی شیعر بوو وەختێ سەرت ئەکردە سەر
لەسەر مەزاری وەلیو شەم
سەرت ئەبوو بە گومەزێ.
ئەوکاتەیش تۆ چاوی نەهێنیی شیعر بووی
لە زاری دایکتا، کە (لاس)ێك بە ڕێگەی
ئەویندا ئەڕۆیشتو لە شەوێك هەڵئەنووت.
ئەو کاتەیش تۆ گەرای هاواری عەشقێ بووی

لە سنگی دایکتا. کە (خاچێك) بە ڕێگەی
یاخیدا ئەڕۆیشتو لە خەمێك هەڵئەنووت.
کە چرایەك بەسەر پەتێکی باریکی تاریکیدا
ئەپەڕییەوە ئەوبەر چەمێ
تۆ لێرەوە ئەبووی بە کەناری ئاوو
بە مزگێنی دەم شەپۆلێ.
کە بولبولێ لەسەر دەمی تیژی شیرێ
ئەنیشتەوەو سەمای ئەکرد
تۆ لێرەوە ئەبووی بە ڕەنگاڵەی
شپرزەیی‌و ئەکەوتیتە باڵەفڕێ.

ئەتپرسی: چۆن بڕوێم لە نێوان مەمانی
پەریداو گەورەبم وەك مەمێ؟! چۆن
هەڵکەم وەکوو "با" و گەورە بم وەك شاخ‌و
دەستخەمە ناودەستی کرێوەو سەرکەمە
سەرشانی نارنجیی ئاگرێ؟!
کەی ئەبم بە پەیژەی شیعرێکی درێژو ئەچمە سەر
سەربانی کۆشکی خواو؟! کەی ئەبم بە ئەسپی
فڕیوی دووکەڵێ؟!
ئەتپرسی: چۆن ئەبم بە کوڕی دەربەندی بازیان؟!
چۆن ئەبم بە یاری مانگەشەو؟!
ئەتپرسی: من چی بکەم.. بۆئەوەی

وەك دایكم چۆن ئەدوێ
ئاوەهایش لە ڕۆژی نەورۆزدا
گوێم لێبێ.. ئەستێرەیش بدوێتو
گوێم لێبێ.. بارانیش بدوێتو
ئەو هەورەیش سترانێ ببێژێ!

بەیانییەكی سپیو سۆڵ. یەكەم ڕۆژ بوو، بای "عەبابەیلێ" بردیتیو وەكو پەپوولە پایزە بەرەو مەكتەب خل بوویتەوە. بۆ یەكەمجار یەكەم پیتو یەكەم وشەو یەكەم ژمارەی سەر تەختە. سەروملی نە ناسراوو ڕەقو تەقی خۆیان بۆ لەقاندیو دیمانە بەخێریان كردی. لەم ماڵەدا تۆ كەروێشكێكی غەریب بووی. لەم هەوارە تازەیەدا تۆ بنچكێكی غەریب بووی. لەم گۆماوە تازەیەدا تۆ ماسییەكی غەریب بووی. ئەو گەرایانە تازەبوون ئەو زەنگیانانە تازە بوون. ئەو چلەدارو پەنجەرەو مراویو عەینەكو دارلاستیكو پردو مەنجەڵو گۆچانی: حەرفو وشەو ژمارانە، یەكەم جار بوو بیانبینی، یەكەم جار بوو بیانناسیی، لەم ژوورەدا ئەتوت چۆلەكەی عاسیی بووی، ئەمدیو شووشەی پەنجەرەكەی. تۆ چاوێكت هەر لای دارتووی حەوشەكە بوو. ئەم ژوورەیان، ئەم ماڵەیان سی سەری تازەتاشراوی گوێچكەڕەپی لەناو خۆیدا ڕیز كردبوو. ئەفەندییەكی داربەدەست،

حەیزەرانی بریقەدار، ئەفەندییەك باریکەلە وەك
مارماسی، هەر خەریکی هاتوچۆ بوو، زەردەزیڕەیەك
لە قژی چەوری ئەفەندی ئالأبوو، لانەئەچوو، تۆ
تۆ چاوێکت هەر لە لای زەردەزیڕەکەو موستیلە گۆپکە
زلەکەی پەنجەی دەستی ئەفەندی بوو!

لە کەناری ئەم ژوورەوە
لە کەناری لەو چەوی ئەلفو بێوە
پێت خستە ناو تەنکاوێکی زمانەوەو
ئیتر چوویتە ئەو دەریاچەو زەریایەوە
کە تا ئەمڕۆیش تۆ ئەباتو خاچ ئەباتو
مار ئەباتو سەری ئەوسەری دیار نییە.
هیچ بەندەرێکی دیار نییە. تۆ لەوێوە
لە یەکەم وشەی "دار"ەوە، یەکەم زریزەی
ڕستەوە هاتیو هاتی
بووی بە کەوو بۆ چیات خوێند.
بووی بە چیاو بۆ بەفرت خوێند.
بووی بە بەفرو بۆ گوڵت خوێند.
بووی بە گوڵو بۆ ئاوت خوێند.
بووی بە ئاوو بۆ خاکت خوێند.
بووی بە خاكو بە سنەوبەر
شیعرت نووسی!

هەڵەبجە ڕیشی تەمگرتووی مەولەوی بوو.
پاوانەی پێی هەورامانو پاڵتۆی بۆرەقنەی
مێژووی شارەزوور بوو.
هەڵەبجە: زڕەی بازنی دەستی کچە جوولەکە بوو!
کیژانی جوولەکەی هەڵەبجە. ڕەنگاڵەی زمانی
شیرینی گەڕەك بوون. ڕەنگاڵە وەك گوڵی تێکەڵی
هەنارو دارهەرمێ. ڕەنگاڵە وەك هەورو بارانو
هەتاوی گورگەزێ. کیژانی جوولەکە، لە سیلەی
عەشقدا، پرسیاری جوانیی بوون، پرسیاری
سەرسامیو پرسیاری دوودڵی نیوەی ڕێ.
کیژانی جوولەکە لاولاوی خوێنگەرمی گەڕەك بوون.
سەوزەڵە: وەك کەپرە شینکەکەی بەردەرگای
ئێوارەی بەهەشتێ. ژنانی جوولەکەو پیاوانی جوولەکەو
منداڵی جوولەکە، لە بەردەم شمشێری مەلاداو،
لە بەردەم جەڵدەکەی خەلیفەو لە بەردەم بەردەکەی
کەعبەدا، یان پۆڕی ترساو بوون، یان
ڕیشی سووتاو بوون، یان ئاوی لەرزیوو
یان جانتاو دەفتەری دڕاوی سەرەڕێ!
هەر لەوێ خاچی تۆ
پەلوپۆی برینی هاوێشتو
سێبەری فامێکی چڕتری بۆ کردی.
هەر لەوێ خاچی تۆ

بزماری سەر جەستەی سەفەرو کۆچی تۆ
زمانی پشکووتو
بوو بە دەم، بوو بە گوێ.
هەر لەوێ ماری تۆ
قایمتر ئالآیە گەردنی گومانتو
وەك پرسیار لە ناوتا پەپکەی خوارد
بۆ کاژی نوێترو
گێنگڵی سۆراخی سەرلەنوێ.
هەر لەوێ زستانێ
یەکەم جار ڕووبەڕوو
من سەری قوپاوی برسێتیم بەدیکرد ئەوکاتەی
بە پەیژەی ماڵماندا هەڵگەڕا بۆ سەربان. من
جاری یەکەم بوو دوو چاوی کلۆری هەژاریی ببینم،
بە پەیژەی ماڵماندا بێتەخوار بۆ حەوشەو بۆ هەیوان.
من جاری یەکەم بوو لە گونیەی خەت سووردا
کلۆڵیی ببینم بە تەڕیو
من جاری یەکەم بوو
زیندوویەك ببینم ئەپروێ.
ئازارێ ببینم خووساوە.
ناسۆرێ ببینم لە قوڕدا نوقم بێ.
من جاری یەکەم بوو سەرنجی شیتاڵی بانگوشێ
بە قایم زللەیەك لە بن گوێی

هەستم با و
پێی بڵێ: ڕاچڵەکێ!
هەر لەوێ
خاچ ئەیوت:
باوکی تۆ هەر ئەڵێی ڕووباری ماندووە،
ئەوەندە شەپۆلی خنکاوی هێناوەو بردووە.
باوکی تۆ هەر ئەڵێی ڕووباری ماندووە،
ئەوەندە گۆرانیی کوژراوی هێناوەو بردووە.
باوکی تۆ هەر ئەڵێی شەوگاری ماندووە،
ئەوەندە واگۆنی تاریکیی هێناوەو بردووە.
پشتی ئەو هەر ئەڵێی شەقامی هیلاکە
ئەوەندە ئاپوورە مەراقی نامۆیی بەسەردا ڕۆیشتووە.
دەستی ئەو هەر ئەڵێی پەلکێکی شەکەتە
ئەوەندە لە هێشووی حەسرەتی گرتووە.
گەردنی هەر ئەڵێی گەردنی قەسیدەی "کوردی"یە
ئەوەندە ئەم بەردی کێوانەی لە ئەستۆ بەستووە.
ئەو ئەیوت:
من وشەم بۆچییە وەك مامز باز نەداو
وەکو ئاو ڕانەکاو لەناکاو خۆی نەکا
بە هۆبەو هەواری خەڵکدا!
من وشەم بۆچییە وەکوو دار لەسەر خۆی
دیلانێ هەڵنەخا بۆ سەمای گۆرانیو

چاوێکی هەر لە لای دوو کەوە سپییەکەی مەمان‌و
دڵێکی هەر لە لای کۆچەکەی یار نەبێ!
من وشەم بۆچییە شوو نەکا بە گڵ‌و
شوو نەکا بە بەردو
منداڵی پەلکەگیاو وەنەوشەی لێ نەبێ!
من وشەم بۆ چییە..
گرمۆڵەی نێو تاقی ژووری بێ‌و
کە قەقنەس گڕی گرت
کە نالی گڕی گرت
نەجووڵێ‌و هەڵنەسێ‌و پێی نەبێ!
ئەو ئەیوت:
من وشەم بۆچییە.. بە دەنووك ئاو نەکا
بە دەمی دڵۆپی تینووداو
من وشەم بۆچییە
کە خەمی قەڵەمی شەهیدو
کە خەمی کاغەزی کوژراوی
قەت نەبێ!

"چەند پەندێکی باوکم کە خاچی باڵام
لەسەر خۆی هەڵیکەندوون"
**یەکەم:**
ئاسمان دائەگرمە خوارێ

خوایش بانگ ئەکەم بۆ سەر زەوی
تا پێی بڵێم:
دۆزەخ ئەوەتا لێرەیەو
بەهەشتیش لێرە دێتە دی!
**دووەم:**
شیعر بەرزە، شاخ پیرۆزە،
سروشت جوانە
بەڵام لە شیعر بەرزتر
لە شاخو کێویش پیرۆزتر
لە سرووشتیش گەلێ جوانتر
قوربانییەکانی ئینسانە!
**سێیەم:**
ئەنووسم بۆئەوەی
شتێك لە وەڕسی زمان
شتێك لە بێزاربوونی خۆم کەم کەمەوەو
بەڵام شتێك لە خۆشەویستیی ئەو خەڵکەو
شیعر زیادکەم!
**چوارەم:**
من ئەم زمانەم کردووە
بە کێڵگەی گوڵەبەڕۆژە
تەماشاکە لە سەد لاوە
خۆر تەماشای بالآی ئەکا!

من ئەم زمانەم کردووە
بە غارگەی کوڕژنو ناڵە
تەماشاکە لە سەد لاوە
یاڵی شیعر با ئەیباتو
لە سەد لاوە سمکۆڵانی بەردوشاخە!

**پێنجەم:**

لە ئاسۆی بادەدا
ئەستێرەی سەرخۆشم
تێم بگە
من مەراقی ئاڵی دەمەو خۆرنشینەو
چوڕەی سپی کازیوەکەی
شەشی ئەیلوولە ئەینۆشم!

هەر لەوێ!
هەر لەناو دەربەندی سەهۆڵو ناو گردی
کرێوەو، پێدەشتی تەرزەوە.
ڕۆژێکیان بەیانیی زستانێ
سروشتی یاخیبوو.. لە کێوی شێتگیری قافەوە
لەودیوی وڵاتی ئەفسانەو دێوەوە
بە سواری ئەسپێکی چەمووشی قەترانیی تۆفانێ
بە خۆیو شمشێری زریانو

بە خۆیو مێژوویەك لوورەوە.
بە خۆیو سەرخێڵی مەرگەوە
هاتە سەر هەڵەبجە.
ئەو ڕۆژە دەنگ ئەیبەست.
ئەو ڕۆژە گڕ ئەیبەست.
ئەو ڕۆژە دەستو پێی پەنگریش ئەتەزی.
ئەو ڕۆژە.. ڕووباری سەعاتو
دەریاچەی دەقیقەو
ئەستێرکی سانییە
وەك خوێنی ڕژاوی گێلاسو
دارژاڵەو دارهەنار ئەمەیی.
ئەو ڕۆژە بەیانی سەعات حەوت
دوای ئەوەی خڕۆکە سپیەکان، خڕۆکە سوورەکان
لە ڕاستە شەقامی ناو دڵیا
مانیان گرت لە ڕۆیشتن
باوکت مرد!

کرێوە هات وتی:
من هاتووم
غەریب نیم بەم پیاوە
شەختەکەی عومری ئەو لە منە!
بارێزە هات وتی:

من هاتووم
غەریب نیم بەم پیاوە
ئەم پیاوە ڕێژنەی زووخاوی
لە منە!
گڤەی بایش هات وتی:
من هاتووم
غەریب نیم بەم پیاوە
دەربەندی دوو لوولەی نامۆییو برسێتیی
سینەی ئەو لە منە!
تەرزەیش هات پێی وتین:
من هاتووم
غەریب نیم بەم پیاوە
ئەم پیاوە زۆر وشەی
باریوی ناو سەرو ناو شیعری
لە منە!
تۆ خاچی مار تێئالآوی
تۆ گوناهێکی پیرۆزو
تۆ شەفەقێکی تاریکو
تۆ مژدەیەکی ڕەشپۆشو
تۆ فڕینێکی گیراوی!
هەر لەگەڵ تەرمی ئەو شاخەدا.
هەر لەگەڵ تەرمی ئەو باخەدا

هەر لە تەك تابووتی ئەو تیشکەو
هەر لە تەك تابووتی ئەو مانگەو
هەر لە پاڵ لاشەی ئەو هەورەدا
وەکو چوار فرمێسکی بێ هەنیەو وەکوو چوار
دووکەڵی پەرتپەرتی خێزانی ئاگرێکی کوژاوە.
وەکو چوار قوتیلکەی بێ ماڵو چوار شەوی
ئاوارە. بە ئاسۆی بووڵێڵدا تەم بووینو
چووینەوە بناری ئەزمڕو چووینەوە ئەو شارە:
کە هەر زوو، یەکەم سات، وەك ئێستام،
ئەو خاچی بە باڵای بێشکەمو بە بەژنی
دوارِۆژما داکوتی. وەك ئێستام
ئەو ڕملی کۆچێکی درێژی ناو قوڕگی
نەهەنگو سەفەری وڵاتی خەڵووزی بۆ لێدام.

من ئێستاکە
باوکم نییەو
شاخی گۆیژە لە جێی باوکمە!

بەم ڕۆژگارە گۆیژە چاوم بانگ ئەکاتو
وەك پوولەکە یەکە یەکە سەرنجەکانم بە خۆیدا دائەدووریَ.
شاخی گۆیژە بەرگدرووی وەرزەکانی پێکەنینو گریانیشە.
گۆیژە مەراقی ڕەنگاوڕەنگ ئەچنێتو ئەیانکا بە: کۆڵوانەی تەم.

ئەیانکا بە: کراسی گولگوڵی هەورو بە ملپێچی
ڕیشاڵدرێژی سێبەرو، ئەیانکا بە کلێتەی سپی
سەر قوتکەو بە دەسەسڕی ئاوریشمی خۆرهەڵاتو
خۆرئاوابوون.
بەم ڕۆژگارە گۆیژە چاوم بانگ ئەکاتو
منیش چاوم، دوو گوڵدانی قژی ئەوە.
گۆیژە ڕۆژنامەی گڵینی بەیانیانو ئێوارانمە.
- ڕۆژی پشوودانی نییە- هەر بەیانییەك هەڵئەسم،
بە گەورەیی، بە مانشێتی بەفر بێ یان قوڕو لیتە،
بە مانشێتی سێڵاو یاخود گێژەڵووکە، بە مانشێتی
دووکەڵ یاخود پشکۆ یاخود خوێنو یاخود
گەرداوو باپووسکە، ئەو تازەترین هەواڵو
دەنگوباسی لە تەوێڵی درێژکۆلەی خۆی نووسیوە
بۆ نموونە:
⭑ئەم مێژووە زوقمەشەختەی زستانێکە هەرگیز گەرمی نابێتەوە.
⭑ئەمڕۆ پایزەو کەچی من بنارەکەم پڕە لە چاوی گوڵاڵە.
⭑لەم شارەدا هەندێ قەڵەم دەفتەرەکانی خۆیان ئەتك ئەکەن.
⭑لەم دەشتەدا سوار ئەگلێو ناشبێ بە سوار.
⭑لەم شارەدا مردن چەند پرس بە نێچیرەکەی خۆی ئەکات
لێرەیش هەر ئەوەندە بە ژن.
⭑لەم دەشتەدا جۆگە دوژمنی جۆگەیەو بەڵام ژەهریش
لە سەرچاوەی هاوبەشەوە ئەیانکوژێ

*ئەوا نالی سەرهەڵئەگرێو ئەڕوا
چونکە نە نیشتمان ناسیو نە منارەو
نە خەڵكو خوا!

بەم ڕۆژگارە گۆیژە چاوم بانگ ئەكاتو
منیش چاوم چاوی کۆڵانو گەڕەكو چاوی
دەرگاو پەنجەرەیە. گۆیژە دیوانی پەلکەگیاو،
قوڕەسوورو سملێو شانۆی کۆستو
دەمامكو سەمای گریانو بەستەیە.
شاخی گۆیژە ڕۆمانێکی بێ کۆتایی ئەم بنارو
پێدەشتەیە. گۆیژە چاپخانەی ژانو سوێی
ڕەنگاوڕەنگە. گۆیژە یەکەمین نووسەری یادداشی ئەم مەڵبەندەیە.

من خاچی مارتێئاڵاوم
من ڕێی وێڵێو
گەشانەوەی هەڵوەرینو
ئاوابوونی هەڵهاتنو
شەوقانەوەی کوژانەوەو
نیوەشەوی نیوەڕوانو
شەوەزەنگی بەیانیانم،
لەسەر حەوشەیەکی گەورە، گەورە ئەوەندەی سامناکیی
هەژاریی خۆی. لەسەر حەوشەیەکی گەورە، گەورە هێندەی

سکی خاڵیی هەژاریی خۆی. لەسەر حەوشەیەکی گەورە، کە
برسیەتی لە چاوەڕوانی هاتنو گەیشتنی
"مانگ"ی نان‌دا، کردبووی بە
جێگەپیاسەی شەوانەی خۆی.
لە ژوورێکی چاوخێلی لەش خواروخێچدا
لە ژوورێکی بچکۆلەدا..
بچکۆلەو تەنگ هەر بە وێنەی دڵی دایکت.
لە ژوورێکی پشت لە هەتاوی پاڵکەوتووی ناو نسێدا
نسێ وەکو دەموچاوی پشت لە خۆری خوشکەکانت،
لەگەڵ چوار پێنج
ماڵە مەراقی ڕووتەڵەو
ماڵە خەمی شەو بە کۆڵو
ماڵە پیازو و
ماڵە توورو
ماڵە کەوەرو
ماڵە زوخاوی دیکەدا.. بوونە هاوسێ!
هەر لەوێ بوو..
پیرێژنێکی سەر حەوشە.. خەیاڵ چڕو قسە فێنك
وەك سێبەری کەپری حەوشە.
پیرێژنێك چاو لێڵو پێڵ، وەکو چاوی زنەی شلوێ.
پیرێژنێك کە دەریایەك مێژووی دەنگو
مێژووی ڕەنگو مێژووی بۆنی

گوشیبووە ناو دەروونیەوەو
هەموو شەوێ
کارێزکەن بوو شۆڕ ئەبۆوە بەناو خۆیداو ئەچووە خوارێ.
هەموو شەوێ مشتێکی لێ هەڵئەهێنجاو دڵۆپ دڵۆپ
ئەیکردە ناو ناخمانەوە هەموو شەوێ.
هەموو شەوێ لە کەوێڵی ئەو دەنگەوە
لە ئەشکەوتی ئەو دەنگەوە
سەدان چرای ئەم زمانە
سەدان چرای ئەم شاخانە
بە ڕیز ئەهاتنە دەرەوەو ئەبوون بە ڕێچکە
گۆرانییو کەڵەپشکۆ. ئەبوون بە ڕێچکەی برینی
داگیرساوی ناو حیکایەت. ئەبوون بە بەیتی
ئەسپەڕەش، بە گردی ڕەش، ئەبوون
بە یاڵی داستانو بە شەتاوی کاوانی دەنگ.
بە پۆلەخۆزگەی خەومانو لە ناو ژووردا
باڵیان ئەگرت. لە ناو ڕۆحدا ئەتوانەوە
هەتا ئەبوون بە شەونمی سەر سەرینو
دیسانەوە بۆ سبەی شەو شین ئەبوونو
لە ناو ژووری پیرێژنو
لە کەناری ئاگردانادا ئەڕوانەوە.
من یەکەمجار لە هەوری ئەو ڕوخسارەوە
برووسکەی "بازیان" لێی دام.

**من یەکەمجار لەو چاوەوە**

**ئازادیی باری بەسەرماو تەڕی کردمو**

**وەك مەهاباد سوورهەڵگەڕام.**

**من یەکەمجار لە پەرژینی ئەو دەنگەوە**

**ڕیشی شێخ سەعید ئاڵایە خاچی لەشمو**

**من یەکەمجار لە بای تیژی ئەو دەنگەوە**

**ناوی دەرسیم گوێی سمیمو**

**دیاربەکر لە قژەوە هەڵیگرتمو**

**لە گۆمی وانی هەڵکێشام.**

**من یەکەمجار لەو زارەوە**

**حیلەی ئەسپەڕەشم بیستو**

**من یەکەمجار لەو دەنگەوە**

**چوارڕیانی خاچی نیشتمانم ناسیو**

**لەو دەمەوە، لە شەوانی ئەو ژوورەوە**

**بووم بە گەردەلوولی پرسیار.**

**من خاچمو بزمار پرسیار.**

**من لقو پۆپ، ژان بنجو بێخ.**

**من سەفەرو وشە ڕێگا**

**من هاڵاوو من بوخارو**

**مردن زرەیا!**

**-لە کەیەوە مەرگت ناسیو بووی بە نیشانەی**

سەرسامیی بەردەمی ئەو؟! لە کەیەوە مردن
هاتە خەونی خەمتو لە کەیەوە تۆ سۆراخی
مەملەکەتی تەمو مژو شەوی ئەکەی؟! لە کەیەوە
ئەو شەپۆلی نەهێنیانە وەك پووشکەیەك
لوولیان دایتو دایانیتە دەست گێژەنی نێرینەی ئەو؟!
ـ لەو ڕۆژەوە کە لە ناکاو بە بێ ئەوەی لە دەرگا بات،
مردن خۆی کرد بە ماڵمانداو باوکمی برد. لەو ڕۆژەوە
بەژنی دایکمی، وەکو ڕۆحی لە ئاوی ڕەش،
لە خومی ڕەش لە مەراقی ڕەش هەڵکێشاو
ئیتر ئەویش بوو بە پەریی مەملەکەتێ. لەو
کاتەوە، ئەو شەوانەی کە ئەچوومە ژێر لێفەوەو
لە ژێرەوە هەردوو چاوم ئەنووقانو سەیری کوێربوونی
خۆم ئەکرد. سەیری ناو گۆڕی خۆم ئەکرد.
لەو کاتەوە من ئەمپرسیو هەر ئەمپرسیو هەتا ئیستە:
ڕەنگە مەرگ لەناو گڤەی باهۆزدا بێ!
ڕەنگە لەناو کلووی بەفرو
ڕەنگە لەناو ڕووباردا بێ.
ڕەنگە مردن بە بێ ژیان نەژی.
ڕەنگە مردن هەر خۆی ڕەگ بێو
ژیانیش لقو پۆپەکەی!
هەر ئەمپرسیو هەر ئەمپرسیو هەتا ئیستەو هەتا هەتا
ڕەنگە مرۆڤ خۆی سەراب بێو ئەویش ڕاستیی!

تۆ ماری گینگڵت، پرسیاری گینگڵی خاچت بوو
-ئەی تۆ کەی ئەستێرەت بەجێهێشت،
هاتیتە سەر زەوی؟!
ئەی تۆ کەی بووی بە گیای ناو سەری
وڵاتو ئەی تۆ کەی لە قوللەی قافەوە
هاتیتە بەردەمی سۆراخی ئەم خاکەو لە بەردەم
جەللادو سێدارەو مەرگێکی تازەدا دابەزیت؟!

منداڵ بووم وەك گوڵی دارچوالەی یەکەم بەر،
بچووك بووم وەك بەچکە مراویی.
ڕۆژێکیان کتێبێ لە جانتای باوکمەوە سەری خۆی
دەرهێناو پێکەنی. پێی وتم: حەز ئەکەم بمبینی.
سەیرمکەیت. وای وتو دەستی خۆی دامە دەست.
هەڵمگرت. بۆنم کرد. ماچم کرد. کردمەوە:
وێنەیەك —چاوانی ڕەشی خۆی تێبڕیم. وێنەیەك:
خاچەکەی خستمە ناو کەلەپۆی خۆیەوە. مارەکەی
ترساندم. وێنەیەك وەك پرژە وەکو تیشك
وەك هەوا هاتە ناو چاومەوە
سەیرم کرد سەیرم کرد سەیرم کرد تا ژاکام
من پێشتر گوڵباخی ماڵێ بووم!
سەیرم کرد سەیرم کرد سەیرم کرد تا لێڵ بووم
من پێشتر بەفراوی شاخێ بووم.

سەیرم کرد سەیرم کرد سەیرم کرد تا پەرت بووم
من پێشتر شەماڵی ئارامی دارێ بووم.
سەیرم کرد سەیرم کرد سەیرم کرد تا سووتام
هەتاکو ڕیشم هات
تا تووکی سەر سنگم درێژ بوو.
من پێشتر منداڵ بووم.. منداڵ بووم. منداڵ بووم
لە کوێوە وام لێهات؟ لە کوێوە گەورە بووم؟!
لە کوێوە؟! لە کوێوە؟!
وێنەیەك ئاوا بوو
بەم جۆرە:
سێدارەو پیاوێکی خنکاوو دوو قاچی ناو ئاسمان!
وێنەیەك: پەتێك‌و ملێکی شکاوەو
دوو دەستی بەرەو خوار ڕاکشاو.
وێنەیەك: کەوایەك هەتاکو خوار ئەژنۆ
لە دووریش سێبەرو تارمایی چەند کۆشك‌و خانوویەك
من حونجەی پیاوەکەو ناوم کرد
بەم جۆرە
ق ا ز ی م ح م د.
ئەو ژاکانە بۆ هەوێنی گەورەبوونی
ژانەکانی دەوەنم بوو.
ئەو لێڵ بوونە بۆ هەوێنی قووڵبوونەوەی
نیگاکانی گێژەنم بوو.

**ئەو پەرت بوونە بۆ هەوێنی چڕکردنەوەی**
**ئاخەکانی بەندەنم بوو.**
**ئەو سووتانە بۆ هەوێنی شین بوونەوەی**
**بە پیتڕی دەغڵی وشەو**
**دەغڵی هزرو**
**دەغڵی سووری تەمەنم بوو.**
**ئەو ڕیشە ڕیشی شیعر بوو.**
**ئەو تووکە، تووکی ئازار بوو.**
**ئەو ملە ملی شاخێکمو**
**ئەو پەتە پەتی تاریکییو**
**ئەو کەوایە کەوای بەری مێژوویەکمو**
**ئەو دەستانە دەستی شەقامو ڕووبارمو**
**ئەو مردنە مردنێ بوو**
**بیرنەچوونەوەی ژیانو**
**لە دایك بوونەوەی تازەی**
**پێ نیشاندام**

**ئەوە خاچە بە کۆڵتەوە؟ یان چنارێکی کوژراوە؟!**
**ئەوە مارە تێی ئاڵاوە؟! یاخود پەتی سێدارەیە؟!**
**یان پارچەکانی جەستەی خۆت؟!**
**ئەوە بزمارە یان پەنجەی مەرگەوەرە؟!**
**یان سێ نەفرەتی دۆزەخە؟!**

چەقیونەتە بەری دەستو پشتی قاچی،
ئەو هاواری پێغەمبەرە؟!
ئەوە پرچی فریشتەیە بەسەر هەورا شۆڕبۆتەوە؟
کزەبا ئەیهۆنێتەوەو فرمێسکی خوا تەڕی ئەکا؟
یاخود ئەوە پرچی دایکتەو بەسەر شانتا شۆڕبۆتەوەو
تەنیایی ئەیهۆنێتەوەو گریانی ژوورو چاوی تۆ
تەڕی ئەکا؟
ئاخ بۆ دایکم!
ئاخ بۆ مانگێ لە سەرەتای هەڵهاتندا کەوتە خوارێ!
ئاخ بۆ خەونێ لە سەرەتای هەڵفڕیندا کەوتە خوارێ!
ئاخ بۆ دەنگێ لە بەرزایی چریکەدا کەوتە خوارێ.
ئاخ بۆ دایکم!
ئاخ بۆ شیعرێ لە سەرەتای تریقەدا
وشەکانی هەڵوەرینو بوون بە لمی گوێ ڕووبارێ!
ئاخ بۆ دایکم!
ئاخ بۆ چاوێ بۆ گەردنێ بۆ کاکۆڵێ
هێشتا بۆنی یەکەم ڕێحانەی ئەوینو
بۆنی یەکەم ماچی نمەو
هێشتا بۆنی یەکەم جێ ژوانو بۆنی گەڕەکی سەرگۆلو
بۆنی گڵەکەی مەلکەندیو بۆنی (وەیس)یان
لێوە ئەهات. کە تەمتومانێ دایپۆشین.
ئاخ بۆ دایکم!

ئاخ بۆ بەژنێ، بۆ سیمایەك، بۆ زرەی ڕستەبازنێ
کە هێشتا هەر زەنگیانەکانی باران‌و
هێشتا پەڕی کۆترەکانی ناو هەڵەبجەو
هێشتا زەردەی گوڵە زەردی قەرەداغو
هێشتا جێ پەنجەی وەنەوشەی
سەر چەرماوەندیان پێوە بوو
کە بوون بە تۆزو غوبارێ.
ئاخ بۆ دایکم!
بۆ ئەو طاوسە بەدبەختە
بۆ ئەو دارهەرمێ غەمگینەو
بۆ ئەو چل چرای گریانەو
بۆ ئەو بەفرە کراس ڕەشە.
ئاخ بۆ دایکم!

دایکت‌و تەواری خەمبار وەکو یەك بوون.
ئەو هەمیشە هەڵنیشتووی ناو کاولاشەکەی
بەختی خۆی بوو. ڕەنگی دایکت‌و گوڵە لیمۆو
شاخەشینەکەی دوای ڕەهێڵە وەکو یەك بوون.
ئەو: پەنجەرە تەماوییەکەی زستانانی سەر حەوشە
بوو. وەك بلووری دووکەڵاویی چرای دیوار
کۆی ژوورەکە ڕەش‌و زەردباوی تێکەڵ بوو.
لە دار قەزوانێکی تەنیای سەر گردێکی تەریك

ئەچوو. لە مریشکەڕەشەی کز وەستاوی
ناو بەفری حەوشەکە ئەچوو. لە سەرەتای
تاریکبوونی دوای ئێوارەو لە مەقامی ئەڵڵاوەیسیو
هەر کوتو مت لە خەم خۆیو لە شەو ئەچوو.
تۆ گەلێ شەو دوای نووستنی چراکانو
خوشکەکانتو دوای نووستنی داروبەردو
دوای نووستنی حەوشی گەورە. لە ژێر لێفەی
هەرزاڵەوە، گوێت لە زایەڵەی خوێناویی
ڕۆحی ئەبوو. گوێت لە وردو خاش بوونو
شکانی شووشەبەندی سێ دەریەکەی سنگی ئەبوو.
لە ژێرەوە، لە پەنجەرەی ناو لۆکەوە، سەیری
هەڵمی لاواندنەوەو سەیری شۆڕەبی گریانیو
سەیری سووتانی هێواشی یادگاریو سەیری
زەردیی تراویلکەی دەنگیت ئەکرد:
ئەتبینی چۆن دوو ئاونی بێوەژنیو
نائومێدیی تێکەڵ بە یەکتری ئەبن.
ئەتبینی چۆن هەردوو سەری، شەوی درێژی
هەژارییو چاوی زستان لە خاڵێکی ساردو سڕدا
بە یەك ئەگەن. ئەتبینی چۆن بیرەوەریو
لاواندنەوە، وەکو قەوزەو شەپۆلەکان
لە پاڵ کەنارێکی لینجدا بە یەك ئەگەن.
ئەتبینی چۆن ڕەنگ ئەڕژێتە دەنگەوە.

ئەتبینی چۆن کلۆی خەیاڵ لە زوخاودا ئەتوێتەوە.
ئەتبینی چۆن تەنیایی بێوەژنێكو تەنیایی خواو
تەنیایی مەرگو کوردستان.. لە یەك ئەگەن!
ئەتبینی چۆن کە نامۆیی ئەبێ بە بێوەپیاوێکی
سەر ڕووتاوەو بێوەژنێکی پایزە مارە ئەکات.
ئەتبینی چۆن خۆڵەمێشیش ئەبێتەوە بە پەنگرو
ئەتبینی چۆن کە پەنگریش ئەبێ بە پارچەیەك شەختەو
شەختەیش ئەبێ بە ئاگردان.

تۆ ئەو گەردوونەت ئەبینی.
ئەو هەموو کسپەو سووتانو خەمە تازانەت ئەبینیو
ئیتر ئەوسا لە ژێرەوە لە ژێر لێفەی هەرزاڵەوە
وەك گەواڵە هەورێ بچووك سەرت پەنگی ئەخواردەوەو
قوڵپت ئەداو لە پڕێکدا بە هەردوو دەست توند توند
دەمی خۆت ئەگرتو ئیتر دات ئەکردە باران،
سەرین ئەبوو بە گیای تەڕو، پەنجەرەی لۆکە
دائەخراو، ئەچوویتە ناو خەونێکەوە:
"ئاسمانەکەی وەکو کراسەکەی دایکت ڕەش هەڵگەڕاو،
مرۆڤەکان سەریان بووبوو بە سەری ورچ، ڕایان ئەکرد،
قەپاڵیان ئەگرت لە یەكو ئەیانبۆڕان. کۆڵان ئەبوو
بە تابووتێکی درێژی سەرداخراو، پیرەمێردی خاوەن
حەوشەیش لەسەر تەختەی تابووتەوە هەڕەشەی ئەکرد

له دایكتو داوای كرێی لێئەكردو سەلكی بڕاوی
چۆلەكەی تێئەگرتو پڕ بە گەڕەك ئەیزریكان"
ئەچوویتە ناو خەونێكەوە: "دارەكەی دەستی مامۆستای
وانەی "حساب" ئەبوو بە مار. ژمارەكان ئەبوون بە
دووپشكی باڵدار. كەپری حەوشە شەوگەردی پیا شۆڕئەبۆوەو
ژوورەكەتان ئاو ئەیبردو، جانتاكەی باوكت ئەبینی
لەناو قوڕێكدا چەقیوەو شیعرەكان كەوتوونە هاوار".
ئەچوویتە ناو خەونێكەوە: "لەو خەونەدا هەر خۆیشت بووی،
ئەبووی بە دووان یەكێكت ئەپووكایەوەو پێستی كۆنی
فڕێ ئەداو ئەوی ترت ئەبوو بە ئەسپێكی باڵدار، دایكت
ئەخستە پاشكۆوەو هەور ئەبوو بە ئاوزەنگیو هەر
ئەفڕیتو هەر ئەفڕیتو لە دواییدا ئەگەیشتیتە ئەستێرەی
خواو ئەبووی بە میوانی كچە حۆرییەكی نازدار" ئەچوویتە
ناو خەونێكەوە: "وا گەورە بووی سمێڵ ڕەشو
ڕانكو چۆغەی شینكی تازەت لەبەردایە، خەنجەرێكت
بە قەدەوە، بە شاخێكدا سەرئەكەویو لە پڕێكدا
لە نێوانی دوو بەردەوە، وەك هەڵقوڵێ، پیاوێك
ئەهاتە دەرەوە. چوارشانەو بەرز، لە فیشەكدا
زەرد ئەچۆوە. پێئەكەنیو پێی ئەوتی: ئەوە منم،
خولەپیزە، تۆیش پێت ئەوت: خۆشم ئەوێی،
منیش هاتووم لەگەڵ تۆدا ببمە چەتە. پێئەكەنیو
دەستی ئەهێنا بە سەرتاو لە دواییدا فیشەكێكی لە

فیشەکلغ دەرئەهێناو ئەیخستە ناو گیرفانتەوەو
پێی ئەوتی: قەت نەترسیی! وای ئەوتو لە پڕێکدا
ئەچۆوە نێوان دوو بەردو، وەکو عەردەکە قووتی بات،
ئیتر لە چاوان ون ئەبوو. دیسانەوە ئەبوویتەوە
بە منداڵو هەر لە خەوەکەدا ئەتوت: من بەیانیی
بە دایکمو بە خەڵك ئەڵێم: لەو کێوانە، لە سوورکێوو
لەسەر "کەتوو" چوومەتە لای خولەپیزە" ئەچوویتە
ناو خەونێکەوە: "لەو خەونەدا باوکت ئەدی،
ڤژئالۆزکاو جووتێ کۆتری سپی سپیش لەناو دەستیا،
پێی ئەوتی: ئەم جووتە کۆترەم کڕیەوە لە پیاوێکی
گوایە شێخو گوایە مەلا کە خەریك بوو سەریان ببڕێ.
پێی ئەوتی: ها بیانبە بۆ سەر سەربان،
بەرەڵایان کەو با بفڕن بەرەو ئازادیی نێو ئاسمان"
ئەچوویتە ناو خەونێکەوە: "لەو خەوەدا لەسەر
گردی مامەیارە، لە ناو ئاپوورەی ژناندا، لەسەر دایك
تۆ ئەم شیعرەت ئەخوێندەوە:

من کێڵگەی گەنمو جۆی شیعر بووم
دایکیشم بارانی پەڵەدان.
من بەردی ناو لانکەی شاخێ بووم
دایکیشم نیشتمان.
من کرمی ئاوریشمی قۆزاخەی بەهرە بووم

دایکیشم درەختی برکو ژان.
من جەستەی مەلێکی سپی بووم
دایکیشم ئاسمانی وەك قەتران.
من خەو بوومو دایکم سەرم.
من کەروێشكو ئەو نزار بوو.
من جۆلانەو ئەو لقی دار.
من هەناسەو دایکم سنگ بوو.
ئەو قەفەزو من کەوەکەی
من چیرۆكو ئەو شەوەکەی.

"سێ هۆرەی خۆشەویستیی بۆ دایکم،
ئەو هۆرانەی لەسەر خاچی لەشم هەڵکەندراون"
**یەکەم:**
ئاو نووسیبووی:
کوڕێك هەبوو لە دایکی دوور.
هەموو جارێ ئەهاتە سەر ڕووبارەکەم.
ورد ئەبۆوە ورد ئەبۆوە لە دواییدا تێی ئەچریکان:
هۆ دایە گیان تۆ دوور نیتو تۆ لە لامی
من ئێستاکە تۆ ئەبینم
بوویتە شەپۆلێکی کەنار.
من ئێستاکە گوێم لە تۆیە
کە هاژەت دێو

ئەڕژێیتە ناو ڕۆحمەوەو
بووی بە ڕووبار!.

دووەم:
دوای سووتانی باخی سێوێ.
لەناو هەموو جۆگەکاندا
تەنها یەکێکیان سوێی بۆوەو لە داخا مرد
لەبەر گڕدا بوو بە هاڵاو.
وتیان: ئەو جۆگەیە دایکی
باخی سێوی جوانەمەرگە!

سێیەم:
لە یادداشتەکانی خۆیدا
قولاپی قەڵایەك ئەڵێ:
کەسم نەدی.. تەنها دایك بوو ئامادە بێ
گەرووی بداتە دەس چنگم‌و
ژیان بدات بە مردن‌و
هەر بەو مەرجەی
کە ڕۆڵەکەی ڕزگاری بێ!

تۆ خەون بووی لە ناو خەونا.
ئەچوویتە ناو دوا خەونێکی بەفرینەوە: "هەڵۆیەك

هەڵیئەگرتیو چنگەکانی لە کەمەرت گیر ئەکردو،
بەرز ئەبۆوە، بەرز ئەبۆوە، هەتاکو سەر پیرەمەگروون،
لە پڕێکدا بەری ئەدایتەوە خوارێو گوێت لێ ئەبوو،
هەڵۆ قاقا پێئەکەنی. تۆش وەك گەڵایەکی تەزیو،
ئەکەوتیتە ناو گێژەڵووکەی زریانی دۆڵێکی قووڵ،
خولت ئەخوارد، هەڵئەلەرزیت، هەڵئەلەرزیت،
لەپڕ ئەتوت ئەمە خەوەو ڕائەپەڕیت، وەختێ چاوت
ئەکردەوە، خوشکەکانت لێفەکەیان ڕاکێشاوەو تۆیش
لە سەرمادا ئەلەرزیت. وەختێ خەبەرت ئەبۆوە:
شەوقی نارنجیی ئاگرێك ئەیدا لە کراسی ڕەشی
دایکتو کە سەرێکیشت هەڵئەبڕی بۆ تاکە چاوی
پەنجەرە. سەیرت ئەکرد حەوشەکەتان پڕ لە بەفرە"

من خاچی مار تێئاڵاوم.
من شەوێکی دەربەدەری ئەم مێژووەم.
من نەفرەتێکی بەهەشتییو
من زەردەشتێکی دۆزەخیو
من تاریکایی هەتاوم.
من خاچی مار تێئاڵاوم.
من کۆچێکی بێ کۆتایی ئەشکەنجەمو
من عەشقی لە دار دراوم!.

تۆ ئیستە هەر خۆتو خاچەکەی تەوێڵت پێکەوەن

چون شاخو دڕەی خۆی. چون چەمو هاژەی خۆی،
چون چمکی مەرگو ژین. تۆ ئیستە هەر خۆتو
بزماری داکوتراو بە جومگەی مێژووتا بەرامبەر یەکتری
دانیشتوون. وەك مانگو قوربانیی. وەك
شیعرو خوێنەکەی. وەك مەلی کوژراوو گۆرانیی.
تۆ ئیستە هەر خۆتی، تۆ ئیستە سێبەری ترساوی
بەیانیو گریانی تارماییت. خۆتو خۆت.
تۆ دایکت شوێن بەختو ڕووباری تازەی کەوت.
ئەو بەختەی بە باڵی نەورەسی دیجلەدا هەڵواسیی.
ئەو نانی گریاوی ژوورێکی برسی بوو، گوڵدانی
خۆڵەمیش، بوخچەی تەم، قوڵینەی فرمێسكو
ئەو گۆزەی زامداری ئاوێکی ڕەش ڕەش بوو.
بەختی یار بازێکی خوێن گەرمی باڵ تیژ بوو،
پەیدا بوو لە ڕۆخی دیجلەوە هات بردی — مەخابن
ئەو بەختەیش دوای چەند ساڵ، وەکو بەختی باخی میر
مێروولەو گژەباو خۆڵ خواردی — تۆ ئیستە هەر خۆتو
خاچەکەی تەوێڵت پێکەوەن. هەر خۆتو جانتایەك
ئەو تۆیەو تۆیش ئەوی. ژوورەکەیش وەك بەفری
ناو حەوشە توایەوە. ئەو ژوورەیش بوو بە خەو،
حیکایەت ساردبۆوەو ئاگردان سەری خۆی داپۆشیی.
هەر خۆتو جانتایەك، تۆ خاچ بوویت ڕێگەت دا
بە شانتاو گردۆلکەی مەراقت هەڵگرتو تۆ

ئیسته خاچێکی غەریبی ناو خۆتیو لە شاری باوکتا ڕەوەندی.
ڕۆژێکیان بەیانیی، گەردووگوڵ. سێ سەری گریانی
پرچ درێژ دەوریان دای. ڕوومەتتو لاملتیان
وەك سەوزەهەرێزی کازیوە تەڕ کردی. سەفەر بوو.
سەفەری دایکی خاچ. سەفەری خوشکی خاچ، سەفەری
چیرۆكو سەفەری "سەرکارێز"، سەفەری "کانی باو"
سەفەری گەڕەکی مەڵکەندی.

من ئیستاکە
دایکم هەیەو دایکم نییە
بەڵام سەیوان لە جێی دایکمە.
من ئیستاکە
خوشکم هەیەو خوشکم نییە
بەڵام ئەستێرەو مانگەشەو لە جێی خوشکمن.
من ئیستاکە
کەسوکارم هەیەو نییە
بەڵام شیعر، چاوی شیعر، بۆنی شیعر
لە جێی هەموو کەسو کارمە!
وردە وردە خاچ هەڵکشا، تۆیش لە گەڵیا
باڵات کردو، ماری گینگڵو مەراقیش،
ماری لاولاو، قەف ئەستوورتر، بە فیشکەتر،
بە پەرۆشتر خۆی تێئالاند، تۆ نەتزانی

چ ڕۆژێ بوو چ وەختێ بوو چ وەرزێ بوو
لە کوێوە بوو؟ شیعر هاتو تەلیسمی خۆی
کرد بە زێڕی خاوی تواوەو کرد بە زیوی خاوی
تواوەی ناو زمانو خۆی ڕژاندە مەراقتەوەو
لەگەڵ یەکدا وەکو زەردەی ئێوارانو کازیوەی
دەم بەیانیانی گڵەزەردە ئاوێتە بوون!
تۆ نەتزانی ئەم باڵندەی چارەنووسە باڵگڕدارە
لە کوێوە هات؟! تۆ نەتزانی شیعر لە ناو کلووی
بەفرا بوو هات؟! لەناو تانو پۆی پرشنگدا؟!
لە ناو جریوەو جووکەدا؟! لەگەڵ هەوری منداڵیدا؟!
لە گۆی مەمکی خەزاڵدا بوو؟! لە ماچی کاکە لاسدا بوو؟!
تۆ نەتزانی ئەم جادووە کێ لێی کردی؟! پەریەکانی
گوێ ڕووباری خەونی خۆت بوون؟! یان کراسی ڕەشی دایکت؟!
یان چاوانی داگیرساوی بەورەکانی شیعری باوکت؟!
تۆ نەتزانی کێ بوو تووشی ئەم ئەوینە
کوشندەیەی وشەی کردی؟! تۆ نازانی کام ئەسپ بوو
هەڵیگرتی؟ ئەسپەڕەشی بازیان بوو؟! یان ئەسپی
قەترانیی شەوو مەراقی خۆت؟! تۆ نەتزانی کێ بوو
تووشی ئەم ئەوینە کوشندەیەی عەشقی کردی؟ قژی
بژو سیمای سامداری چەرماوەند، وەختی زاوزێی
دارستان؟! یاخود نزای ناو پەلکەڕەنگینەی گۆیژە؟
یاخود زاری داپچڕاوی بەردو ئەشکەوت؟! یان سیحری

دەربەندی بوولێڵ؟ تۆ نەتزانی ئەی شێتی وشە
نەتزانی بۆ یەکەمجار کام فریشتە دەستی سووتان‌و
غوربەتی لێ وەشاندی؟! دەستی شیعری لێوەشاندی؟
تۆ نەتزانی ئەم جادووە کێ لێی کردی؟ ئەتوت ڕەنگە
ئەم ئەفسوونە ژنە شەوێکی قەرەجی ژێر دەواری
لای (هڵووبە) لێی کردبم! ئەتوت ڕەنگە ئەمە
سیحری بانگی شێوانی ئەرخەوان، یاخود نزای
گوناهێکی ڕدێن سپی لای زێوێ بێ و گیرا بووبێ!
یان تەلیسمی حیکایەت‌و سەرگوزوشتەو قسەکانی
پیرێژنی سەر حەوشە بێ؟! وا دێنە دی. تۆ
نەتزانی کێ تووشی ئەم عیشقی ئاوەو کێ تووشی
عەشقی ئەم خاك‌و خۆڵەی کردی؟! تۆ نەتزانی
چۆن بووی بە دەروێشی شیعرو، تۆ نەتزانی
کێ تووشی حاڵ لێهاتنی ئەم تەریقەتی پرسیارو
یاخیبوونەی خەمی کردی؟! تۆ نەتزانی
خۆشەویستیی ئەم بەردانە بە کام تووڵەماری ڕێدا
گەیشتنە لات؟! لە دەربەندی باسەڕەوە؟! لە
ئاوایی ئاگرەوە؟ تۆ نەتزانی خۆشەویستیی
ئەم تەپ‌و تۆزو دڕکانە، ئەم قاقڕی گەرمیان‌و
ئەم شەختەبەندی کوێستانە، ئەم گڵ‌و خۆڵی
داستان‌و ئەم دارستانی بەیتانە، لە کام
ئاسۆگەوە هاتن؟! تۆ نەتزانی ئەم نەفرەتە

بەهەشتییە.. ئەم نەفرەتە دۆزەخییە.. ئەم
نەعلەتی چارەنووسی ناو گومانو ڕاڕاییە کێ لێی
کردی؟! تۆ نازانی.. تۆ نەتزانی؟!

ناو بە ناوێ لە ناو ڕیشی خانییەوە
پەڕەسێلکەیەك هەڵئەفڕیو پێی ئەوتی:
من تووشی ئەم تێکئالآنەی
بەفرو گڕەی شیعرم کردی.
جاربەجارێ لە ڕەواقە سووتاوەکەی
خانەی سەبری نالییەوە..
بادێکی غەمگین ئەهاتو پێی ئەوتی:
من تووشی ئەم عەشقە شێتەی
خاكو خۆڵو گیاو دەوەنەی
شیعرم کردی.

ناو بە ناوێ لە کونە شاخی هیجرەتی حاجییەوە
بازێکی باڵسوور ئەهاتو پێی ئەوتی:
من تووشی سیحری ئازادیو
من گیرۆدەی ناو غوربەتی
بێکۆتایی شیعرم کردی.

جاربەجارێ لەگەڵ هاتنی باپووسکەی مەولەویدا

دەنکە تەرزەی بەر پەنجەرە پێی ئەوتی:
من تووشی عەشقی درەختی ئەم زامانەو
لەش‌و لاری ڕووت‌و قووتی
مانگەشەوی ناو دەریاچەو
من گیرۆدەی تەمتومانی
بن بناری شیعرم کردی!

ناوبەناوێ لە جوانێکی بێ ناوی لای "گۆران"ەوە
تیلەی چاوێ، ئەگەیشتە لات، پێی ئەوتی:
من تووشی عەشقی ناو گۆمی ئەو چاوانەو
من گیرۆدەی ئەو گۆی مەمکەو
زەردەخەنەی ئەم کانییەو
من شێتی شیعری قژزەردی تازەم کردی!

تۆ نەتزانی ئەم جادووە کێ لێی کردی؟!
تۆ نەتزانی کێ بوو تووشی ئەم ئەوینە
کوشندەیەی شیعری کردی؟!
شیعر.. شیعر چاوێکی دیکەی ناو چاوەو
بیستنێکی تری ناو بیستنەو.. تۆ ئەو چاوانەت لە بیرە!
کە خۆرنشینێکی پاییز، ئەو دەمەی قژی پەمەیی
تیزماڵکی هەورێکی ڕەوەند دائەگەڕاو لە کەلێکی سوور
ئەئالاً. لە ژوور سەریش، پۆلەمەلێکی ڕەنگاڵە

وەكو ئەڵقەی یەكەیەكەی زنجیرێكی لێك بەستراو بن
بە یەكەوە هەڵئەفڕینو لە یەكتریش نە ئەترازان.
ئەتوت زریزەی ئاسمانن، وەك خەیاڵیش،
"با"یش خەیاڵێكی بزێو بوو. خۆتو خولیایەكی
تازە لە چاوەڕوانی شیعرێكی كەسكدا بوون.
چاوەڕوانیت لە ئاوی خوڕ. لە ئاسكێكی ڕاونراو
لە ژانی شەپۆلو گێژەن. لە نائارامیی جانتاكەت،
لە سەفەری دایكت ئەچوو. تۆ خاچێ بووی لەسەر
بزماری ئاگر بووی. لە جێ ژوانی یەكەمی شیعری تۆداو
لە سەیوانو لە ناو پێڵووی ئەرخەواندا، هەر
لە تەنیشتی ژوورەكەی برایم پاشاو ئەملای ماڵی
ئەمین زەكیو بەرانبەر فێستەكەی سەری
مستەفا پاشا یامولكی- لەگەڵ كچەخەونی خۆتدا
بە یەك گەیشتن، ئەو چاوانە مەراقیان فێری فڕینی
ناو گڕستانی سەرت كرد. ئەو چاوانە كاژی
شەرمیان بە جەستەی مارت فڕێداو بۆ یەكەم جار
تۆوی عەشقێكی تازەیان ڕۆكردە سەر بەری دەستت.
ئیتر كچ بوو بە خولیای خاچ..
من ئەمپرسیو هەر ئەمپرسی:
چۆن بتوانم ڕستەكانی ئەم زمانە، بكەم بە پرچێكی
تازە بۆ كچ! چۆن بتوانم خوێنی گەرمی ئەم ئەوینە
بە جامی حەرف بكەمە ناو شیعرێكەوە هەتا ئەویش

**وەك ئەو خوێنە وەك ئەو دەمە قوڵپ بداو**

**گەرم بێ وەك ژووری مەمك؟!**

**چۆن بتوانم چاوی ئەم شیعرە تازەیەم**

**کەمێ تیل کەم وەك چاوی ئەو؟!**

**چۆن بتوانم؟ ئەبێ چی بکەم من بۆ ئەوەی**

**شیعر بکەم بە پاوانە بە پلپلەو بە گەردانە؟!**

**ئەبێ چی بکەم من بۆ ئەوەی شیعر بکەم**

**بە ئاوریشمەو بیئالێنمە گەردنی ئەو**

**هەر ئەمپرسی؟!**

**ئەی من چۆن ببم بە ئاوو دڵۆپی ئاوو**

**هەموو لەشی.. هەموو نەهێنیی ناو لەشی بپشکنم؟!**

**لەگەڵ گەورەبوونی خاچدا، پرسەکانیش گەورە ئەبوون**

**من بە بێ پرس سەرم نییە. من بە بێ پرس**

**نە خۆشەویستیت ئەناسمەو نە گەردوونیش ئەهەژێنم!**

**لەگەڵ گەورەبوونی خاچدا، لەهەر عەردێکی بەیاردا**

**پرس ئەڕوێنم!**

**من ئەم نیوە قەدەغەیەم چۆن بێنمەوە**

**ناو لەشی خۆم؟!**

**من ئەم نیوە زیندانەی خۆم چۆن بشکێنم؟**

**من ئەم نیوە بێ دەنگەی خۆم**

**چۆن بێنمەوە ناو گەرووی خۆم؟!**

**من دابڕینی نیوەم لە نیوەم.**

من دابڕینی جەستەم لە جەستەم.
بوونی نیوەم بە قامچیو نیوەکەی ترم بە قیژە.
بوونی نیوەم بە زیندانو نیوەکەی ترم بە شوورە.
من بوونی نیوەم بە کێردو نیوەکەی ترم بە مامر.
بوونی نیوەم بە ئاگرو نیوەکەی ترم بە پووشوو.
بەم جۆرە بوو:
بەیانییەك ئاسمان بوو بە بیابانو
بەفر بوو بە حوشترخۆرەو
شاخ بوو بە دەشتی حیجازو
جەستەم بە کافرستانو
شمشێر باریی.
شمشێر لەگەڵ سەرما باریی.

سەرم لەگەڵ بەردا باریی
بەرد لەگەڵ فەرماندا بارییو
فەرمان دوو کەرتی کردمو
لەو ڕۆژەوە من نیوەمو نیوەکەی کەم ون کردووە.
لەو ڕۆژەوە من ئەم خاچی نامۆییەم هەلگرتووە.
ئەم خاچەی تەوێڵم "تار"یشە، من بە مار
بە ماری مەراقو ئەندێشەم، بە کلکی بە سەری
ئەم تارە لێ ئەدەم. ژن ژێیە. ژێی ئاسۆی
ڕوانینمو ژێی گزنگ، ژێی گیاوگوڵ.

**ژێی شیعری کۆچەرو بێ ماڵم. من کە تار**
**لێ ئەدەم، چرپەی یار، فرمێسکی، پەنجەیی‌و**
**گۆی مەمکی، ڕیشاڵی کۆڵوانەی، لە بەستەو**
**مەقامی کونکونی دەنگمەوە دێنەدەر.**
**من کە تار لێئەدەم، وڵاتێك لێ ئەدەم.**
**من سەری مەولەوی‌و کوێستانی "عەنبەر" و**
**هەناوی وەلی‌و شەم لێ ئەدەم. هەورامان**
**لێ ئەدەم. ئەوەتەی چوومەتە ئەم سیحرە**
**کەسکەوە، هەر شەوەی من چڵ‌و من لقی**
**دارێکی بەرداری ئاوازم. هەر شەوەی باوەشێ**
**پرشنگ‌و هەر شەوەی هێشوویەك ماچ ئەگرم.**
**ئەوەتەی چوومەتە ناو خەونی عەشقەوە،**
**من سەرووی باڵدارو شەپۆلی فڕیوو شەقژنی**
**گوڵاڵە ئەبینم. ئەوەتەی ئەو تیشکە لێی داوم،**
**هەر ڕۆژەی من ئەبم بە پەڕەی دەفتەری،**
**تەلانێك. هەر ڕۆژەی من ئەبم بە خامەی**
**تیرێژی ئەشکەوتێ‌و خەرمانە ئەنووسم، شەقامی**
**ناو شارو کۆڵانی چاوەڕێ‌و دووکەڵ‌و ژیلەمۆو**
**تانجەرۆی چیرۆکێ ئەنووسم. من لە کوێ ئەبوومە**
**ئەم بێشە زیوینەو ئەم فوارەی ڕەنگانە، من**
**لە کوێ ئەبوومە کتێبی ئەفسوونی ئەم هەموو**
**وشانە، گەر چاوو گەر دەنگ‌و گەر ڕەنگی**

کچێکی مەڵکەندی نەبوایە. من لە کوێ ئەبوومە
ئەم ماسییە زێڕینەی هۆنراوە گەر چاوی ئەو کچەو
گەر دەمی ئەو کچەو گەر سنگی نەبوایە.

تارم لێدا ڕەشەمێ بوو
کەچی پەنجەم نێرگزی گرت
نێرگزم برد بۆ مەڵکەندی.
تارم لێدا شەوەزەنگ بوو
کەچی دەنگم بەیانی گرت
بەیانم برد بۆ مەڵکەندی.
تارم لێدا گڕەی با بوو
کەچی وشەم بوو بە شەماڵ
شەماڵم برد بۆ مەڵکەندی.
تارم لێداو وشکانیی بوو
کەچی لێوم بوو بە جۆگەو
من جۆگەم برد بۆ مەڵکەندی.
تارم لێداو وەسێتم کرد
وەختێ مردم
تارەکەیشم
با هەر ببەن بۆ مەڵکەندی!

من خاچی مار تێئاڵاوم

من شیعرێکی پەپکەخواردووی
ناو مەراقو
من سووتانێکی سووتاوم.
من ڕووبارێکی وەستاوو
من مێژوویەکی جانتامو
من لافاوێکی خنکاوی
ناو لافاوم!

جانتاکەت وەك تەرمی شیعرێکی بێ قەبر ئەخستە
سەر شانتو ئەڕۆیشتی. تۆ گردی گریان بووی
ئەڕۆیشتی. جانتاکەت قورس بوو، پڕی بوو لە
لمی فرمێسكو لە چەوی هەنسكو لە قوڕی
خەمستان. تۆ تۆزو غوبار بووی  ئەڕۆیشتی.
جانتاکەت زۆر سوك بوو. هەر هەمووی
دوو دەرپێو فانیلەو کراسێ، پانتۆڵێ،
دوو وێنەی دایکتو خوشکانو دوو شیعری ناو
"ژین"ی ع. گۆران. تۆ خرچەی بەفری
ژێر سمی شەو، تۆ نووزەی بەردێکی
هەڵکەنراو، تۆ دەستی شکاوی دارێ بووی
لە لاڕێی کۆچێکدا بە تەنیا بەجێماو.
تۆ سەرمای نامۆ بووی بە زوقمو زستانی
شارەکەت. هەر وەکو خەمێکی لێکەوتووی

گیرفانی شەقامی "کاوە" بی، یان وەکو
هەناسەی بزربووی عەشقێکی "حاجی حان"
ڕەشەبای شارەکەت، ڕەشەبای هەژاریی،
وەك قوتووی بەتاڵو ڕۆژنامەی دڕاوو
وەك پەڕە مریشکی سەربڕاو، سەرەوخوار
بەرەوخوار بەرەوخوار تا شیوی جوولەکان ئەیبردی!

ئەگەر تەنیایی نەبوایە
لە داخاندا شیعر ئەمرد.
ئەگەر مانگەشەو نەبوایە
لە داخاندا بەفر ئەمرد.
ئەگەر باڵندە نەبوایە
لە داخاندا درەخت ئەمرد،
ئەگەر ئازادی نەبوایە
لە داخاندا ژیان ئەمرد.
تۆیش ئەگەر شیعر نەبوایە
لە داخاندا زوو ئەمردی!
حەوت ڕۆژ جارێك. ڕۆژنامەیەك وەکو گۆم بێ
سەرت تێدا نوقم ئەکرد. گوێچکەت ئەنا بە بنیەوە.
سۆنە بوویتو سەرسام ئەبوویت. گوێچکەت ئەنا
بە دڵیەوە، گوێت لە ورتە ورتی وشەو پرشەپرشی
ڕستە ئەگرت. هەڵنەئەسای وەکو گەڵای

دانەویوی شۆڕە بییەك لە كەناردا تەڕتەڕ ئەبوویت.
خۆزگەت لێ ئەچۆڕایەوە. هەڵنەئەسای. لەبەر
قەڵبەزەی هەڵبەستدا بە چوارمشقی دائەنیشتی،
ئەبووی بە گیاو گوڵی بنی. ئەبووی بە سەرەمێكوتە،
بە بەردی لووس، ئەبووی بە سێوە لاسوورەو
ئاوی چیرۆك‌و وتارو پەند ئەیبردی. حەوت ڕۆژ
جارێك، ڕۆژنامەیەك وەكو ئاوبێ، خۆتت
تێدا نوقم ئەكرد. تۆ بۆقەمەلەی شیعر بووی
كورت‌و كەمێ ڕێگەت ئەكرد. حەوت ڕۆژ جارێك،
ڕۆژنامەیەك وەك ئەستێرك بێ خۆتت تێدا
نوقم ئەكرد. یەكە یەكە گوێت لە خورپەی دڵی
هەموو تنۆكەكان ئەگرت. گوێت لە ڕاچڵەكینی
پیت‌و لە وێرگوڵە شەیتانۆكەو گوێت لە دەنگی
وەستانی پێی نوختە ئەگرت. لە بنەوە سەیری
قژی ڕەنگاوڕەنگی دارەبەنی شیعری نالیی‌و
خەڵوەتەكەی "مەحوی"ت ئەكرد. لە بنەوە،
سەیری یاڵی شەپۆلەكانی سالم‌و سەیری سووتانی
گەردنی "كوردی"ت ئەكرد. لە بنەوە سەیری
مەمكی چوارخشتەكی‌و لە بنەوە سەیری خوار ناوكی
هەندێ قەسیدەی شێخ ڕەزاو شوكریت ئەكرد. پێ ئەكەنیت.
وەك گێلاس سوور ئەبوویتەوە. خەیاڵت پیا
هەڵئەواسین حەوت ڕۆژ جارێك سەرو كەللەی

پیرەمێردێ وەك حەوزی ماسیی زمان بێ،
هەموو جارێ ماسییەکی ئەکرد بە شوڵکی پەندەوەو
لەبەر پەنجەرەی هەتاودا هەڵی ئەخست. سەروو
کەللەی پیرەمێردێ وەکو نووری تیرێژێ بێ تێی
ئەڕوانیت. بە پەنجەی چاو ئاماژەی بۆ ڕێگای
دوورو ئاسۆی ئەودیو هەورەکانی گڵەزەردەو
ئەزمڕ ئەکرد. تێت ئەڕوانی. وەکو لە سرڕێك
بڕوانی: ناوچەوانی لە ناوچەوانی کێو ئەچوو.
ڕیشێ بۆنی ئەستێرەی بەرز، بۆنی ئاگر، بۆنی
نەورۆز، بۆنی مامەیارەیان لێ ئەهات.
حەوت ڕۆژ جارێك. ڕۆژنامەیەك. وەك کەشتی نووح
جووت جووت هەموو نێرەو مێیەی مێژوویەکی لافاو بردووی
لە خۆیدا کۆئەکردەوە. من لەوێدا نەژادی ئەم خاچەی
خۆمو من لەوێدا یەکەم گڕی سەر زاگرۆزو یەکەم
بەفری ئاراراتو کەللەسەری باپیرانی هەزار مێردو
سەرەتای ئەم ڕێچکە خوێنەی خۆم بینییەوە.
ئیتر من لەو حەوت ڕۆژ جارەوە
ئەم چارەنووسەم تێئاڵاو لێم نەبۆوە.
ئیتر من لەو حەوت ڕۆژ جارەوە
ئەم بارانی پشکۆو تەرزەو گوڵو دڕکەی
لێ داکردمو خۆش نەبۆوە
ئیتر من لەو حەوت ڕۆژ جارەوە

بووم بە هاودەمی ئەم خاچەو
لە ئێوە جویێ نەبوومەوە.
ئەم خاچە خەریکە گوڵ دەرکات.
ئەم مارە خەریکە باڵ بگریێ.
ئەم شیعرە خەریکە زاووزێ
بە بەردو بە باوە بکاتو
ئەم چاوە خەریکە
بە پەیژەی پرسیارو
بە باڵای دووکەڵدا هەڵگەڕێ!

سەروملێك لە ناو کۆنەپاڵتۆیەکدا. کتێبێك لە بنهەنگڵدا.
وەك باپووسکەو دەنکە تەرزە سەروخواری شار ئەگەڕای.
تۆ بارانت هێندەی قسەکانی دایکتو هێندەی
چاوەکانی شیعرو هێندەی قژی دەزگیرانەکەت خۆش ئەوێ.
باران زەنگیانەی پچڕاوەی فریشتەکانی ئاسمانە.
باران شیعری زستانانەی خوایەو لە ناو هەورێکی
تەنیادا ئەو ئەینووسێ. لەبەر ئەودا ئەبی
بە پەلکەگیای سەوزو خەمانت ئەبریسکێتەوە.
لەبەر ئەودا ئەبی بە زامی هەڵقوڵیو.
لەبەر ئەودا ئەبی بە جۆگەلەئاوی کەمدووی پەناوپەسێر.
ئەبی بە گەمیەی خەیاڵو بە چارۆگەی
کۆڵی منداڵانی پڕ لە گێلاخەو لە پیشۆك.

تۆ ئەڕۆیشتیو ئەو ئەباریی. سەروملێك
لە ناو کۆنە پاڵتۆیەکدا. چەپکێ شیعری باراناویو
چون باپووسکەو دەنکەتەرزە تەنیا. تەنیا
سەروخواری شار ئەگەڕای. لە پڕێکدا تۆ
لات ئەداو ئەچوویتە ناو کەشتییەکەی "نوح"
نوح هەر خۆیو پشیلەیەك وەکو کوردو شەو.
نوح هەر خۆیو تووڕەبوونێکی بەردەوام وەکو
ڕەشەباو ئەم شارە. ڕوخساری نوح
وەکو توێکڵە هەناری ئاڵ.. لووتێ پڕ لە وردە
جۆگەو ڕوباری شین.. وەك ددانی ڕیزێ
کورسیی لە یەك نەچوو، تەختەیەكو پۆلێ
مەلی حەرفو وشەو ئاسمانێکی خۆڵەمێشیی.
جامێ بادەو پۆلێ شیعری سەرخۆش سەرخۆش،
باڵ لێکەوتوو. بۆنی عەرەق بۆنی تەنیاییو
بێکەسیی، بۆنی شێلمی کولاوو بۆنی مێژوویەکی
کۆنو بۆنی سیرو بۆنی شیعری پێنج خشتەکیو
بۆنی ئێوارەی درەنگی سابوونکەران. لە ناو جەستەی
کەشتیی وێڵو جەستەی نوحدا تێکەڵ ئەبوون.
ئەبوون بە یەك. نوح هەر خۆیو پشیلەیەك
وەك کوردو خەم. تۆیش هەر خۆتو خەیاڵێکی
ڕەنگ پەمەیی. وەك باپووسکەو دەنکە تەرزە
سەروخواری شار ئەگەڕای، باران ئەبارێو تۆیش

ئەڕۆی. ئەبوو بە شەو

خاچت بە شەودا هەڵواسە
بەڵکو هەتاکو بەیانی کە هەڵئەسیی
ببێ بە چوار باڵی ڕووبار
بۆ ئەم شارە!
خاچت بە شەودا هەڵواسە
بەڵکو هەتاکو بەیانیی
ببێ بە چوار چاوی باخچە
بۆ ئەم شارە.
خاچت بە شەودا هەڵواسە
بەڵکو هەتاکو بەیانیی کە هەڵئەسیی
ببێ بە بەژنی چوار سەرووی
مژدەو جەژن
بۆ ئەم شارە.
سەرت بە شەودا هەڵواسە
بەڵکو هەتاکو بەیانیی
ببێ بە سەرچاوەی پرشنگ
بۆ کوێرەکانی ئەم شارە.
هەرچی باڵی وشەکانتە
هەرچی چاوی شیعرەکانتە
هەرچی بەژنی خاچەکانتە

**وەك سەری خۆت**

**هەڵیانواسە بەم شەوەدا**

**بەڵکو هەتاکو بەیانیی.. ببن بە نان..**

**بە نان بە نان**

**بۆ برسییەکانی ئەم شارە.**

**ئەبوو بە شەو. ئەچوویتەوە بۆماڵەوە**

**ماڵی "مەکتەب"**

**ماڵت بوو، ماڵیشت نەبوو.**

**ئەچوویتەوە بەشی ناوخۆی قەڵەمە لانەوازەکان.**

**ئەچوویتەوە بەشی ناوخۆی شێدار بە پەڵەی وەڕسیی.**

**شێدار بە دەنگی تەڕی حەرەس‌و**

**سامدار بە لوورەی سەگگەلی کەناری شار.**

**ئەچوویتەوە. لە ناو هۆڵێکی لاکێشدا. ژمارە "یەك"**

**لە دە هێلانەی دوو قاتدا**

**لەگەڵ نۆزدە سەری تردا**

**لەگەڵ نۆزدە ڕەنگی جیاجیاو**

**لەگەڵ نۆزدە دەفتەری غەریبی‌و**

**لەگەڵ نۆزدە.. خاوێن‌و چڵکنی تێکەڵ‌و**

**لەگەڵ نۆزدە.. فرمێسك‌و قاقای تێکەڵ‌و**

**نوێژو گوناهی تێکەڵ‌و زیرەك‌و دەبەنگی تێکەڵ- و**

**درۆ بەسزمانی تێکەڵاو بووی!**

ئەچوویتەوە. شەو کەنەفت بوو. تۆیش کەنەفت بووی.
چراکان ئەکوژانەوە.. تاریکیی ئەزرنگایەوە
خۆتت ئەکرد بە ژێر پەتووی سەوزەڵەدا
لە ژێرەوە وەکو کرمی فەریکەنۆك لوولت ئەخوارد.
ئەوسا ئیتر لەگەڵ خۆتدا ئاگردانی
خەیاڵی خۆت ئەبردە ژێر پەتووەوە
خۆت بە وان گەرم ئەکردەوە
لەگەڵ خۆتدا کۆڵانەکەی ماڵی ئاسکەو دەرگا تەنەکەکەیانو
لقو پۆپی دار توووەکەیانو پێکەنینی ئاسکە خۆیت
ئەبردە ژێر پەتووەوە.
لەگەڵ خۆتدا ئاسمانێکی شیعری شینو سیمای دایکتو
شاخی گۆیژەو لایلایەکەو شیعری بیستو حەوت ساڵەکەی
باوکتو سەیرانەکانی "تابین" و پەڕەسێلکەی
ئێوارانت ئەبردە ژێر پەتووەکەوە.
لەگەڵ خۆتدا دوا فرمێسکی کچی فلیمە هیندییەکەو
قاتێکی نێو شووشەبەندی کۆگایەکی سەر شەقامەکەی مەولەوی
-پڕ بە بەرت- ئەبردە ژێر پەتۆکەوە..
لەگەڵ خۆتدا.. تەشتێ هێلکەی پیست ئەگرتەوەو
ئەتبردە ژێر پەتووەکەوەو یەکە یەکە دەموچاوی
خزمە پیسکەکانی باوکت تیا نوقم ئەکرد!
لەگەڵ خۆتدا سەری ئەسپەڕەشت ئەبردە ژێر پەتووەکەوەو
یاڵو گەردنیت ماچ ئەکرد.

لەگەڵ خۆتدا بە ڕقەوە سەرەڕووتاوەکەی "عومەر عەلی"ت
ئەبردە ژێر پەتووەکەوەو بە کەشك دات ئەگرتەوەو
هەر لێت ئەداو هەر لێت ئەدا
هەتاکو دەستت شل ئەبوو
تاکو خەیاڵت شل ئەبوو
تا ئەنووستی!
تۆ خاچی مار تێئالاَوی
تۆ ئیستە مێملّی ئارامو تۆ ئیستە
ئاخێکی لەبەردا ڕسکاوی.
تۆ سەرت کەوانەو
تۆ ملت هەمیشە
تیرێکی لەسەرپێی سۆراخەو.
تۆ گوڵی گومانیو
لە وەردی پرسیاردا ڕوواوی.

تۆ ڕووی دەمت کردە گۆیژەو
گۆیژە گێڕایەوە وتی:
"قەلاَچوالان" ئەتوت ژنێکی بێزارە
لە ڕەنگو شێوەی قژی خۆی.
لە سێبەرو لە هەتاوی نگینی خۆی.
لە ئاوێنەو لە شانەی خۆی.
قەلاَچوالان بە دوای بەرایی بەختێکی

تازەتردا بۆ چاوانی. بە دوای ئایندەی زیوین‌و
بژوێنێکی نوێدا وێڵ بوو
بەیانییەك، ڕەوەسوارێ، کە بالآیان
لە ڕووباری وەنەوشەیی بورجی کاکێش هەڵکێشا بوو.
بە کەناری کازیوەدا پەڕینەوەو
هاتنە سەر باسکەکانی من.
دوور ڕوانییان:
ئاسکێك لە بەرەبەیان جوانتر
ئاسکێك لە فریشتەی ڕەزو
لە پەریەکانی خەو جوانتر.
ئاسکێك کردی بە بارڕژن‌و ڕووەو دەشتایی داگەڕا
برایم پاشاو ئەسپ سواری قەڵاچوالان
جڵەویان دایە دەس "با"یەك
بایەکی پەست، بایەکی گرژ: تیژ بردنی.
ئاسك لە سەر بەردێ وەستا
پیاوی پاشای دەرزیی هەڵگر
تیروکەوانی ڕاکێشاو
تیرێ وەکو چاوی شەیتان
چاوی دۆزەخ، تیژ دەرپەڕی‌و فڕی‌و فڕی‌و
لەسەر دڵی ئاسك چەقی.
چاویان لێبوو کە ئاسك کەوت
چاویان لێبوو کە تاشەبەرد ئاڵ هەڵگەڕا

وەختێ سوارەكان گەیشتنە بەردەمی بەرد
فریشتەیەك وەكو كراسی گوڵاڵەی لەبەردا بێ
ئەستێرەی چاوی خواوەندی خۆشەویستیی دابێ لەسەر.
هەستایە پیان. هەردوو باسكی كردەوە
بۆ ئاسمانو وردە وردە بەرزبۆوەو لە پڕێكدا
لە چاو ون بوو. كە ڕەوەسوار چوونە سەر
بەرد. ئاسكیان نەدی. هەندێ دڵۆپە
خوێنیان دی: دڵۆپەكان نووسیبوویان: سلەیمانی!
ئیتر لەو یەكەم تیرەوە
نەفرەتی ڕەش لەم شارەدا خۆی ڕواندو
بەرەبەرە دارستانی لێ كەوتەوە.
لەو دڵۆپەخوێنانەوە
ئەم شارە خوێنی هەڵمژیو
گەورە سەرچاوەی خوێناوی
مێژوویەكی سەربڕاوی لێكەوتەوە.
"هەندێ لەو دێراوی قسەو پەندانەی
لە بناری شاردا لێدراون"
**یەكەم:**
ڕۆژژمێری چاوەكانی ئەم گۆیژەیە
ڕۆژژمێری ئەشكی خاكو
ڕۆژژمێری هەڵقرچاوی مێژووی ئاوو
سەعاتێكی زەنگ لێدەری

بەردەوامی خوێنی شارە!

**دووەم:**

بەم بنارەدا چی نەڕۆی
بەم بنارەدا چی نەهات.
لوورە لووری ئاگری پارس‌و
گڤەگڤی شمشێری ئەسحابەکان‌و
قیژەقیژی شەوەزەنگی ڕۆمەکان‌و
نێلەنێلی ڕمی عەجەم
بەم بنارەدا چی نەڕۆی
بەم بنارەدا چی نەهات.

**سێهەم:**

وەرە ناو ئەم دیرۆکەوە
بۆئەوەی ئاسمان ببینی
چۆن کون ئەبێ‌و
لەو کونەوە چەند تیرێژی
سەروڕیشی پێغەمبەران
بە خوێنەوە ئەکەونە خوار.

**چوارەم:**

لەسەر زەویی تا ئەسووتێ
کەسی نییە ئەم ولاتە

له ئاسمانیش که خوا باوەشی پیائەکات
ئەم دووکەڵە!

**پێنجەم:**

لێرە میرەکانی بابان
لەبەر دەسکەوتی هێلانە چۆلەکەیەك
خانوویەکیان ئەڕووخاندو
لەبەر کوشتنی کوللەیەك
خەرمانێکیان ئەسووتاندو
که یەکتریشیان سەرئەبڕی
"نرخی سەریان*
لەسەر سەربەستەکانیان بوو!"

**شەشەم:**

ئەم ئازارە مەخەرە ناو
لانکەی گوڵو ئارامەوە
ئەمە شیعرە با نەتەرێو خەمی لە بیر بچێتەوە
ئەمە شیعرە ئەمە ڕووەکێکی سەیرە
بە دڵنیایی کز ئەبێو
بە مەراقیش ئەشنێتەوە.

تۆ پیاسەی شیعرێکی ڕیش هاتووی

* وێنە شیعرێکی ئەدۆنیسە.

ناو باخی مەراقی ئەم شارەی.
هەموو ڕۆژ لە داری تەنیایی
پەیکەرێ بۆ ئەوین ئەتاشیو
لە بەردەم ئاوێنەی کۆچەری تەمەنتا دایئەنێی.
تۆ ئیستە مەراقی "ئاسکە"و مەراقی نیشتمان
بە پیاڵەی فرمێسکێ تێکەڵی یەك ئەکەی.
پرچی ئەو ئەبەستی بە پرچی لاولاوی ئەمەوە
بەژنی ئەو بە بەژنی ڕەوەزی شاخی ئەم
ئەپێوی. تۆ چاوی ئاسکەو چاوی کەژ
تۆ پەنجەی ئاسکەو پەنجەی گوڵ،
تۆ لێوی ئاسکەو لێوی گڵ.
تۆ مەمکی ئاسکەو مەمکی هەرد
وەکو یەك ئەبینی.

تۆ پیاسەی شیعرێکی ڕیش هاتووی
ناو باخی مەراقی ئەم شارەی.
تۆ چوویتە کۆڵانی دووکەڵو
ناو چرە تووترکی ئەشکەنجەی خەڵکەوەو ئەپرسی:
نیشتمان بەردە یان ڕووبارە؟!
نیشتمان دایکمە. یان باڵندەی نزارە؟!
نیشتمان خوێنە یان هاوارە؟!
نیشتمان شیعرە یان خەونێکی هەوارە؟!

ئەتپرسی: ئەم عەشقە لە کوێوە هاتە ناو لەشمەوەو
لە کەیدا هەڵقوڵی؟!

خاچێکی ڕیش هاتووم
خەریکە یەکەمین هۆنراوەم پێ ئەگرێ.
وا ئیستە دەوەنی وشەی من خەریکە
وەك باڵای ئەرخەوان هەڵبچێ و
ئەرخەوان باڵ بگرێ!

سووچێکی چایخانە وەك سووچی مەراقی سێگۆشەی
خۆت وا بوو. حەوزێك و فوارەیەك. فوارەکە
تۆپێکی بچکۆلەی باغەیی هەڵئەداو نەئەکەوت.
تۆ فوارەی یان تۆپی سەر ئەوی؟ ئەتپرسیی
لە خۆتت ئەپرسیی: کامیانی؟ تۆ بۆ خۆت
هەر ئاوی؟! یان ئاوی بۆ خەڵکی؟! تۆ گریان
گریانی شیعرتە بە تەنیا؟ یان گریەی تەلانی
چیایشە؟! ئەو وەختەی کە ئەبێ بە سێلاو؟
تۆ مەراق مەراقی شیعرتە بە تەنیا؟
یان کسپەی گەلایشە.. ئەو وەختەی
پێش وەرین (با) ئەیبا؟! ئەتپرسیی:
ئەم چاوە هەر چاوی شاعیرە؟
یان چاوی نانیشە؟! ئەم دەستە هەر

دەستی شاعیرە؟! یان دەستی شەقامیش؟!
ئەم زەردە هەر زەردیی خۆرئاوای ناو شیعرە؟!
هەر زەردیی گوڵانە یان زەردیی هەژاریش؟!
سووچێکی چایخانە. وەکو سووچی خەیاڵی شەوانەی
خۆت وابوو. یەکەم جار لەوێدا. تۆ چرپەی
سیاسیی دووفۆڵیت پڕایە گوێچکەوە. تۆ لەوێ
یەکەم جار: ڕۆژنامەی نهێنیو بەیانی نهێنیو
یەکەم جار هەر لەوێ تۆ وێنەی تاڤگەی زیندانییو
زنجیری دەستو پێی ئاسۆگەی دیلت دی.
هەرلەوێیش یەکەم جار: سمێڵی ستالین یەك دوو جار
بە چەپدا بایدایتو چرووتی چەرچلێش دووکەڵی
ڕژاندە چاوتەوەو هەر لەوێیش: عەینەکی
ڕۆزفلتو هەر لەوێیش، مالینکۆف، مۆلۆتۆف
کاسکێتی لینینو یەکەم جار هەر لەوێ تۆ
شیعری قوللەڕەش، ئازاری زنجیت دی!
خاچێك بووی زریانی بزمارو دڕکەزیی بردیتی.
خاچێك بووی بەرەو خۆر هەندێ جار لەسەر سك ئەخشای.
خاچێك بووی بەرەو مەرگ هەندێ جار ئەفڕیتو
هەندێ جار بە کاوخۆ ئەڕۆیشتی.

ڕۆژێکیان مێژوویەك هاتە ناو شارەوە
تۆ پێشتر لەم چیای مێژووەو

لەم زەریای مێژووەو

لەم ئاگری مێژووەت نەدیبوو.

ئێوارە بوو پیرەمەگروون ملی زیاتر هەڵبڕیبوو

بۆ ڕێی کەرکووك..

ئێوارە بوو هەر قەبرەکان مابوونەوەو

نەهاتبوون بۆ ڕێی کەرکووك.

ئێوارە بوو..

لەگەڵ هەوایەکی شیندا تەرمی گۆمێ گەیشتەوە

بەردەمی شار. مێژوو هەستا.

لەگەڵ گریانێکی مۆردا تەرمی هەورێ گەیشتەوە

بەردەمی شار. برین باریی.

لەگەڵ سووتانێکی سەوزا.. تەرمی ڕەزێ گەیشتەوە

بەردەمی شار. ترس سووتا

لەگەڵ هاوارێکی زەرد دا.. تەرمی خۆرێ گەیشتەوە

بەردەمی شار. تیشك بەستی

لەگەڵ هەواڵێکی ڕەشدا.. تەرمی ئەسپێ گەیشتەوە

بەردەمی شار. شاخ حیلاندی.

لەگەڵ ئاوێکی سپیدا.. تەرمی شیعرێ گەیشتەوە

بەردەمی شار. ڕووبار فڕی

لەگەڵ گڕەیەکی سووردا.. تەرمی داستان گەیشتەوە

بەردەمی شار.. خەڵك و خوێن و شەو ڕاپەڕی!

تۆ ئەو شەوە خاچت سەوڵی ڕووناکی بوو

کەشتیت مێژوویەکی یاخیو
شەپۆلیشت جادەکانی ئەم شارە بوو.
تۆ ئەو شەوە هەر چاو بە چاو ژانی خاكو
زەویت بینی: کە چۆن بوومەلەرزەی ئەبوو.
تۆ ئەو شەوە سەعات "دە" بوو
هەر ڕووبەڕوو کە شەفەقی بەربەیانی خوێنینت بینی.
تۆ ئەو شەوە یەکەم جار بوو گوێت لە زەنگی داهاتوو بێ.
تۆ ئەو شەوە یەکەم جار بوو لە بەردەمتا مەرگ ببینی
کە چۆن ئەمرێ!

لە یەك شەودا.. ڕیشی مەراقت سپی بوو
نە کاژاو بوویتو نە سوورکێو!
لە یەك شەودا.. هەندێ گردی پێکەنینت
لەڕ بوون، بوون بە داسكو دەرزی
نە گردی جۆگە بوویتو نە سەیوان.
لە یەك شەودا نامۆیی تۆو نەخشەی عێراق
بە پێوانەی فرسەخی خوێن
هەزاران شەو لە یەکتری دوورکەوتنەوە.
گشت وانەکانی مامۆستای (واجبات) و (جوغرافیا)
بوون بە کاڵەکی گەنیوو توێکڵەشووتی.
لە یەك شەودا زانیت هەموو ڕۆژەکانی ئەم وڵاتە
لە تۆڕی شەوی بەغدادا بەگیر هاتوون.

هەر ئەو شەوە ئاڵای عێراقت لەسەری خۆت داماڵی‌و
ڕێك كردت بە دوو كەرتەوە
پارچەیەكیت فڕێدایە ناو زێرابی ماڵی قودسی‌و
ئەوی ترت وەكو سدارەكەی پاشا
كرد بە سدارە بۆ سەری
گوێدرێژێكی مەلكەندی!

ئەو شەوە شەو نەبوو سەرم بوو هەڵگیرساو پریشكی
هاوێشت‌و بێشەیەك لە ترس‌و تۆقینی
پێشینەی سووتاندم.
ئەو شەوە شەو نەبوو گەردن‌و شانم بوو
چەخماخەی دایەوەو ڕێژنەی هەلاڵەو
ڕەهێڵەی ئەستێرەی بەسەردا باراندم.
ئەو شەوە شەو نەبوو هاواری كێوم بوو
تل بۆوەو جیهانی بێدەنگیی شێلام‌و
سنووری خەیاڵ‌و ڕوانینی بەزاندم!

## "یادداشتەكانی ئەو شەوە لە چەند دڵۆپە خوێنێكدا"

**یەكەم:**

تابووتێكەو لە دوو مەتر كەمتر
كەچی مێژوویەك لە ناویا ڕاكشاوە
لە ڕێی نێوان داریكەلی‌و سلەیمانی‌و
لە ئاوی سیروان درێژتر.

دووەم:

لەبەر دەروازەی سەرادا
بەهەشتو دۆزەخ تێکەڵن
جارێك خۆڵەمێشی خواینو
جارێکی دی زەردەخەنەی پێغەمبەرین.

سێهەم:

وەك ئەو شەوە
هەموو جارێ عەرەبانچیو بێ بەرگو نان
ئەم مێژووە ئەئاژوونو ئەبن بە بای
دەوری ئاگر
کەچی لەوسەر کە گالیسکەی
بەرگو نانو کە گالیسکەی
خۆشییانی سەربەرەوخوار
پەیدا ئەبێ.
نە ئەو نانێکی ئەگاتێو
نە بۆ ئەمیان شەرواڵێكو
نە بۆ عەرەبانچیش جێیەك
هەتا سواربێ!

چوارەم:

لە شەوی شیعرێکیان پرسیم:
ناونیشانت؟

ئەویش وتی:
ناونیشانی کوێت بدەمێ!
من ماڵەکەم وا بە کۆڵی ڕێو بانەوە
گەر ویستت بمدۆزیتەوە
ئەبێ پرسیار لە با بکەی من لە کوێم‌و
ئەبێ بە نامۆیی بڵێی
من چوومەتە ناو کلۆری کام ژانەوە!

**پێنجەم:**
ئەو شەوە مانگەشەو
پێشانگەی ئەوینی شارێکی لە خۆیدا کردووە
سەد تابلۆی شەقامی ڕەنگینی
بە خۆیدا هەڵواسی
ئەو شەوە بە خوێنی ژنێکی بەر سەراو
بە پەنجەی تریفە
مارەیی ئازادیی لە بەردەم
گۆیژەدا مۆرکرا!

تۆ گۆیژەیت‌و لەسەر ترۆپکی بەسەرهات
ڕاوەستاوی‌و ئەڕوانیتە ئەم زەمانە.
دەمێ هەڵمی‌و دەمێ تنۆک‌و دەمێکیش
گڕەو پشکۆ.

تۆ خاچیتو لەسەر گۆیژە ڕاوەستاویو
ئەڕوانیتە ئەم زامانە.
دەمێ گوڵیو دەمێ سووتوو دەمێکی دی
خوێنی ئاسۆ.

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ شیعرێکی پەپکەخواردووی
ناو تەنیاییو
تۆ قوتابی مەراقیتو
تۆ کلۆیەك تەباشیری سکاڵایتو
تۆ تەختە ئاخی خولخواردووی بەردەوامی
ناو گێژاوی!
شەقام بێشکەی درێژکۆلەی شەوانی هاوینانت بوو.
گەورەیش بوویتو ڕای ئەژەنیت.
هەتا درەنگ. لەسەر کورسیی چایخانەیەك. مەراقت وەك
قەلەڕەشکەی پەڕەوازە هەڵئەکورما.
تۆ دوا خەیاڵی درەختی شەوانە بووی
سەعات بەردی تێئەگرتیو هەڵنەئەسای
تۆ ئەودەمە کەوتبوویتە ئاوی شینی دوو چاوەوە.
تۆ گەڵای مێو بوویتو ئاوی شینیش هەر ئەیبردی.
ئەم سەرچاوەی ئاوی شینە
هەر لە لای کەشتیی نوحەوە هەڵئەقوڵاو

گشت ڕۆژێکیش تۆ لە گەڵیا بە کەناردا هەر دووراودوور
دوای ئەکەوتی.
تۆ ئەتزانی ئەم ئاوە قەت بوار ناداو
ئەم ئاوە قەت بۆ تۆ نابێو
ئەم ئاوە قەت لەسەر شیعرت ڕاناوەستێو
تۆ ئەتزانی لەناو ئەم سیحرە شینەدا
بەخت گەرداوە.
تۆ ئەتزانی نەك خاچی تۆ.. بەڵکو دەیان
ماسیگرەی عاشقی ئاو لەو دوو چاوەدا خنکاوە.
تۆ ئەم گێژاوە ڕایکێشای تا بە دەوری
نەهێنیدا بخولێیتەوە..
تۆ ئەم ئەوینە مەحاڵە بەهرەی
قوڵایی پێ بەخشیت..
تا گژوگیاو ڕەنگو دەنگو
گەرای عەشقی هەڵنەهاتووی
لە بندا بخوێنیتەوە..
تۆ ئەم شەپۆلە شینانە کە بردیانی بۆئەوە بوو
لە ناو ئەوینە تەنکاودا نەخنکێیتو
ببی بە شەهیدی زەریا!
شەقام بێشکەی درێژکۆلەی شەوانی هاوینانت بوو،
تۆ دوا خەیاڵی درەختی شەوانە بووی.
سەعات بەردی تێئەگرتیو هەڵنەئەسای.

که هەڵئەسای وشەیەکی سەرشکاو بووی.
که هەڵئەسای مەراقێکی ئاڵۆزکاو بووی.
له گلۆڵه دەزووی تەڕو شێواو ئەچووی،
خۆت سەری خۆت لیٚ ون ئەبوو
له شوێنێکدا.. له دوو شوێندا.. له ده شوێندا خۆت ئەپچڕان.
ئەبووی به چەند کەرتێکەوه، هەر کەرتێکت بایەك ئەیبرد
هەر کەرتێکت شەپۆلێك‌و هەر بەشێکت تەمێك ئەیبرد.
ئەویان دەستەکانی دایکت
ئەویان عەشقێکی مەحاڵ‌و
ئەوی تریان گیرفانێکی پڕ له فرمێسك!
که هەڵئەسای جاده ئەنووست. بەسەر جادەی نووستووەوه
تاك‌و تەرا، وەك چەند زارێکی هەڵدراو.. یەك‌و یەك،
دوو و یەك.. هیچ‌و یەك.. هەر تۆو بایەکی عەجوول‌و
یەك دوو شێتی ئێسك سووك‌و دوا سەرخۆشی پاڵ
دیواری قاچ مانگرتووی شار ئەبینرا:
چاوم لێیه:
ڕەشەبایەکی سەرخۆش هات
مەلا سمایل.. پیری مەی. دەنگی بادە. دەنگی ڕۆستەم
دەنگی زۆراب. هەر وەکو قاپیٚ شەرابی
سووری سەرمۆر له دوای یەك دوو جاریٚ لەقین
لەبەر دەروازەی سەرادا ڕێك ئەوەستیٚ
دەستی چەپ لەبەر پشتێنداو، دەستی ڕاستیش بۆ هەڕەشه

**لە ئاسمانو حکومەتو بازرگانی شار هەڵئەبڕێ!**
**ڕووبارێکە لە شیعرو پەند.. سێڵاوێکە لە هەجووی تیژ**
**هەر سەرئەکاتو هەڵئەچێ!**
**لە پڕێکدا ئەبێ بە زووخاوێکی مەنگ**
**شەپۆلەکانی دائەچێ!.**
**ئەم هەورە لەگەڵ شەرابدا شێلراوەو لە ئاگری**
**نێو داستاندا سوور بۆتەوەو بووە بە نانێکی سووتاو.**
**ئەمە جیهانێکی تێکەڵە لە فیردەوسیو لە حافظ و**
**فایەق بێکەس، لە خەیامو مەلای گەورە**
**ئەم تێکەڵە**
**لە نێڵە نێڵی ئاگرو لە خوڕەی ئاو**
**ئەدوێو ئەدوێو مشتەکوڵە ئەدا لە هەور**
**جبەی ئەشرافو مێزەری مەلاو شێخو**
**وشکەسۆفی بەرانبەر خوا هەڵئەبڕێتو**
**شیڕ.. شیڕ شیڕ شیڕ.. دایان ئەدڕێ!**
**شەق لە تاجی ئینگلتەرە هەڵئەداتو هەر گڤەی دێ.**
**جنێو ئەدا بە عەمباری شاراوەی ئاردو برنجو**
**ئەدوێو ئەڕواو ئەڕواو ئەدوێو هەر گڤەی دێ.**
**تاکو لە پێچی چوخمێکدا بزر ئەبێ**
**ئەو بەردەوام شیعری خەیام ئەڕێژێتە سەرشەقامو**
**ناو کۆڵانو شار بۆنی ڕەزی چوارینەی**
**باوەگەورەی بادە ئەگرێ:**

"ئەڵێن کە دۆزەخ مەخسوس بۆ مەستە
بەم واتە واتە قەت دڵ مەبەستە
گەر عاشق‌و مەست بچنە جەهەننەم
بەهەشت چۆڵ‌و هۆڵ وەك بەری دەستە".

ئەو بەرەو ژوور. مەراقی سەر هەورازێ بوو
تارمایی سەرخۆشی ژێر چوخمێ،
کە ون ئەبوو.. ئەڕۆیشتەوە.
منیش خاچێکی بابردووی بەرەوخوار بووم
لەگەڵ مانگەشەوێکی نەخۆش‌و گژەبایەکی دەنگگڕو
خەیاڵێکی تۆزاویدا،
بەرەو نسێی ماڵی مەکتەب ئەبوومەوە.

**"بروسکەیەك کە لە تیسکەی تفەنگ‌و هەورەتریشقەو لە مردن بە پەلەترە"**
**نە شیعرەو نە پەخشانەشیعرەو**
**لە قسەی منداڵیش ساکارترە:**

بۆ بەرێزان:

عومەر خەیام. ئەبو نەواس. فایەق بێکەس. گۆران. سەیاب. حەمدی. هەژار. هێمن. سەلام. حسێن مەردان. شێخ نووری شێخ ساڵح. سەلام. دڵدار. جەلادەت بەدرخان. ڕەفیق حیلمی. صادق هیدایەت. فروغ فروغزاد. محرم محمد امین. مالك حداد. صلاح عبدالصبور. عەلی مەردان. تایەر تۆفیق. حەسەن زیرەك. نازدارو ئەسمەر فەرهاد. هەروەها مەلا سمایل‌و هاوڕێکانی:

ئێمە کە لە خوارەوە ناومان نووسراوەو ئیمزامان کردووەو خۆمان بە دۆستی نزیكو دڵسۆزی ئێوە ئەزانین. تکاتان لێ ئەکەین. تکا. جارێ هەر لە شوێنی خۆتان بنو نەکەن بگەڕێنەوە. چونکە ئەگەر بێتو بگەڕێنەوە. ئەوا چەند ساڵێکە لەم وڵاتانەدا شمشێرێکی ڕیشدار پەیدابووەو لە هەتاو نایخاتە سێبەر. ملی یەکە بە یەکەتان ئەپەڕێنێ. ئەویش لەبەر ئەو شیعرو چیرۆكو باسانەی نووسیوتانە، لەسەر ئەو قسانەی کردووتانە. لەسەر ئەو خەیاڵانەی لەسەرتاندا بووە. لەسەر ئەو خواردنەوانەی خواردووتانەتەوە. لەسەر ئەو گۆرانیانەی وتووتانە. لەسەر ئەو سەمایانەی کردووتانە، بۆ ژنەکانیش لەسەر ئەو جلانەی لە بەریان کردووە. لەسەر ئەو ئارایشتانەی کە کردوویانە. تکاتان لێ ئەکەین هەر لە شوێنی خۆتان بنو نەگەڕێنەوە. هەروەها تکایە ئێوەیش لەلای خۆتانەوە هەموو ئەو ژنو پیاوە زاناو ئەدیبو مێژوونووسو سیاسیو هونەرمەندو سەرخۆشو سەماکەرو خاوەن مەیخانەو خەیاتی ژنانو فالگرەوەو دەستگرەوانەی کە لە کیشوەرەکەی ئێوەدان ئاگادار بکەنەوە بۆئەوەی نەگەڕێنەوە. تا ئاگادارتان ئەکەینەوە.

بەشێك لە ناوی ئیمزاکەران.

د. حسین مروە. د. مهدی عامل. د. عبدالرحمن قاسملو. د. شەرەف کەندی. سەعید سوڵتانپوور. سەعیدی سیرجانی. حەسەن قزڵجی. عەبدولخالق مەعروف. زهدی. عمر توفیق. مەلا مەجید. مەلا عەبدولڕەحان. مەحمود خاکی. لەگەڵ سەدان ژنو پیاوی ڕۆژنامەنوسو ئەدیبو هونەرمەندو زانای ئێرانیو جەزائیریو میسریو پاکستانی کە لەبەر درێژبوونەوەی برووسکەکە ناوەکانیانمان نەنووسی.

وێنەیەکی بۆ:

ـ عەرشی پەروەردگار.
-هەموو مزگەوتەکانو کڵێسەکانی دنیا.
ـ موفتیو پاپا.

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ نەفرەتێکی پیرۆزیو
تۆ گوناهێکی پاکژیو
تۆ بەهەشتێکی گڕدارو
تۆ وشکانیی ناو سالاوی!
بەیانیان تۆ خۆزگەی تەڕیتو ئەچیتە دەرەوە.
تۆ مێرگی گەڕیدەو گوڵزاری دەستگێڕی، باوەشت
پڕ ئەکەی لە گزنگ. خەیاڵت پڕ ئەکەی لە ئاونگ
چاوانت پڕئەکەی لە نامەی ڕەنگاوڕەنگ،
هەتاوی دوای باران ئەخەیتە سەرشانتو بە دەستیش
پریاسکەی هەورێکی پڕ باران هەڵئەگری. ئەمانە
هەر هەمووی، ئەیانبەی، بۆ کچێو کچ بێباك
بە لاتا ئەڕواتو نە خەمت بۆن ئەکاو نە خۆزگەی
تەڕی تۆ ئەبینێو نە گوێیشی لە ڕازی وەریوتە.
هەست ئەکەیت سەرابی. هەست ئەکەیت گۆرانیی
تەماویت، هەست ئەکەیت بێ ڕەنگو بێ بۆنو
بێ دەنگی. خۆزگەی تەڕ ئەبێتە زەردەپووش
ئەوساکە باوەشت پڕئەبێ لە وردە ئاوازی شکاوی

شمشاڵو لە خۆڵی شیعرێکی ڕووخاوو لە گەردی
خەماویی خۆڵەمێش.
لا ئەدەیت. تۆ پەنا ئەبەیتە بەر کتێب. بەر سایەی
دیوانو ئەچیتە ژێر باڵی گۆڤارو ڕۆژنامەو ئەبیتە
ڕێبواری وڵاتی ناو چیرۆك. "گەلاوێژ" تا ئیستەیش
تەلانی هەر سەوزەو سەرگۆنەی لاپەڕەی پڕ لە خوێن.
"ڕۆژی نوێ" قژی خۆی ئەکاتە کەپرێكو هۆنراوەی
ئەبێتە باوەشێن. تۆ ئەڕۆیت. تۆ سەرت
ئەدەیتە دەست خێڵی ڕووناکییو تۆ سەرت
ئەخەیتە سەر پشتی هەزاران ئەسپەشێی ناو دیرۆك.
هەڵئەسیی هەست ئەکەیت وەك لقی دارسێوی هاوینان
بە بەری چڕو پڕ قورس بوویت. هەست ئەکەیت جۆگەی نوێو
شاخی نوێو مەلی نوێت بینیوەو لە دوێنێ
بەرزتر هەڵئەفڕیت. دێیتەوە سووچەکەی
چایخانەت. ئەبینی کۆڕ گەرمە بە قسەو
بە بۆنی تێکەڵی دووکەڵی جگەرەو دووکەڵی سیاسەت.

لە ڕۆژژمێری ئەیلوولدا. ئێوارەیەك کە هێشتا خۆر
وەکو سینییەکی خڕی پرتەقاڵیی بە کەناری خۆرنشیندا
هەڵواسرابوو. لە ڕۆژژمێری ئەیلوولدا ئێوارەیەك
کە هێشتا خۆر مابووی بازداتە خوارەوە
بۆ ناو شەوو لەسەر دواکەل بە ترسەوە

ڕاوەستابوو. ژیلەمۆیەکی دەنگ و باس،
هێشتا گەرم، ڕۆکرایە سەر جادەکان. بای
سرکەسرکی ناو خەڵکیش خەریکبوو ئەیگەشاندەوە.

ئەڵێن: دەرگای هەردوو دەربەند
بوون بە دەروازەی ئاگرو
لەسەر بەغدا داخراون.
ئەڵێن: بەردەکانی دەربەند
یەکە یەکە بوون بە چاوو داگیرساون.
ئەڵێن: لە گەرووی دەربەندا
ئەمڕۆ مێژوویەك نێژراوەو
مێژوویەکی تازە زاوە.
ئەڵێن: لەو دەربەندانەوە
ڕۆژگاری نوێ هەڵئەقوڵێن
مرۆڤی نوێ
جۆگەلەی پشکۆ لە پشتو
کڵپە بەسەر دێنە دەرێ
ئەڵێن: لەم لا گرمەژنی
ئەسپەڕەشو چەپۆکانیو
ئەڵێن لەولایش چریکەی بازەکەی کفری
-ئیبراهیم بەگ- بە یەکەوە هاتوونەوە.
ئەڵێن: ئیستە لە هەردوو بەری دەربەندا

داستان سەنگەری لێداوەو
خوێن ئامادەی بازرەقەیەو
ئازادیی وا لە کێوانە!

لەو ئێوارەی ئەیلوولەوە دۆڵی کپ مرد.
لەو ئێوارەی ئەیلوولەوە شیعری کپ مرد.
لەو ئێوارەی ئەیلوولەوە ئادەمیزادی کپیش مرد.
لەو ئێوارەی ئەیلوولەوە پەردەو کوللەی مانگەشەوو
سەرینی نەرمی تریفەو دەنگی ئاوریشمینی شنەو
کزەو پیاسەی بە کاوخۆی خەیاڵو سەرکردنەسەر
ڕانی شینی گۆمو لەنجەولاری گۆزەی کانیی‌و
وردەشەپۆلی شمشاڵو ڕەزی نووستووی بێ دەربەست‌و
کلاوکلاوێنەی شاخ‌و بەردی هەڵمەقۆی شەوان‌و
زەردەخەنەی گوڵەکانی باخی گشتی‌و بۆنی دڵداریی
ناو چیغ‌و فەنەری کۆلارەکان‌و سێوە لاسوورەی
نێودەستی مێبازان‌و دیلانێی ئەستێرەکان‌و
خاڵخاڵۆکەو ماڵی خاڵ‌و هیلالی خەنەی ناو
دەست‌و تێشووی ڕاوو نازوونووزی دەنگی
خۆش‌و یارەکەی من:
هەموو چوونە ناو کونەبای مێژوویەکی بێ بنەوەو نەهاتنەوە.
هەموو چوون بۆ کۆچی بیرچوونەوەی ئەو دیو خەون‌و نەهاتنەوە
هەموو کەوتنە ناو وڵاتی خۆڵەمێش‌و دووکەڵەوە..

هەموو بوون بە ژێر دەستو پێی گابەردو کەندەڵانەوە..
هەموو لە ناو شەوی خوێندا ون بوون.
چوونە تابووتی لەوەو
لافاوی گوللە بردنیو
گڕ دایپۆشین.

ئەبێ لەناو ئەم تەندووری خوێنە شێتەو
لە بەردەمی ئەم گەرداوە چەمووشەدا، شیعر
چی بکات؟! ئەبێ وشە بچێ بۆ کوێو
ببێ بە چیو کام هەرێمی بوومەلەرزەو
کام مەڵبەندی مەرگی تازە داڵدەی بدات؟!
ئەبێ شیعر ببێ بە چی؟
ئەبێ وشە بچێ بۆ کوێ؟
ئەگەر ئەبێ بە پەپوولە
هەر بە هالاوێ ئەسووتێ!
ئەگەر ئەبێ بە باخچەیەك
هەر دووکەڵ چاوی کوێر ئەکا.
ئەگەر ئەبێ بە کانییەك هەر بە تەقەیەك کەڕئەبێ.
ئەگەر ئەبێ بە بولبولێ
هەر بە گرمەیەك لاڵ ئەبێ
ئەم پرشنگە
ئەگەر ئەچێتە ژورەوەو

دەرگا لەسەر خۆی دائەخات
شەوێك ڕەنگی هەڵئەبزڕكێو
دوور لە نیشتمانی ئاسۆ
لەسەر جێگایەكی شێدار
تەنیا ئەمرێ!
ئەم خەیاڵە
ئەگەر خۆی ئەكات بە خەڵوەت
بۆ ئاسمانو جریوەی دوور
ئەوسا تەنها خوا ئەیبیسێو
خەڵك نایبیسێ.
ئەم سترانە.
ئەگەر لێوی خۆی بدوورێ
لێوی قەڵبەزەو
شەپۆلو
دەمی دەریاچەیش ئەدوورێ!
ئەم ئازارە..
ئەگەر تێكەڵ بە گڵ نەبێ
گوڵەگەنم چۆن بزانێ ژانی ئەوە؟!
ئەم فڕینە
ئەگەر نەبێ بە تەتەری خۆشەویستیی
عەشق بە چیدا بزانێ
باڵی ئەوە؟!

ئەم ئاوە گەر
زەوی لە زمانی نەگاو
ڕەگ نەیەویٚو
دارستان گوێی لیٚ ڕانەگریٚو
بەرد بە هاژەی هەڵنەپەڕیٚو
گژوگیا نەیخوێنێتەوەو
زیخو چەو نەینووسێتەوەو
مێرگەکانیش ماچی نەکەن
بۆچی ببیٚ؟!!
لە نێوانی شیعرو شیعرو.. شیعرو شاخدا
لە نێوانی شیعرو شیعرو.. شیعرو چاودا
من ئەو خاچەم
باڵێکم وا لەناو هەورا شەقژنێتیو
باڵەکەی دیم لەسەر زەمین کێوماڵ دەکا.
بە باڵێکما ئەستێرەیەك شۆڕبۆتەوەو
بەوی ترما جەستەی گوندیٚ.
لە یەك وەختا من خەونیشمو بە ئاگا بوون.
لە یەك کاتا شەپۆلەکانی ڕووی ئاومو
گێژاوی ناو قووڵاییشم.
من ڕوون بوونەوەی ناو زەریام.
ئاسانێکی دژوارمو
من نە شیعرم بۆ ژوورێكو

نە باڵندەم بۆ باخێك‌و
نە زمانی هێرۆگلیفیم بۆ تاقمێ‌و
نە زمانی تەنکاویشم!
وا ئێستاکەیش مەرگ ئابلۆوقەی ئاوی داوە
مەرگ ئابلۆوقەی باخی داوە.
چەقۆ ئابلۆوقەی گەرووم‌و
زیندان ئابلۆوقەی فڕینم‌و
سەرباز گەمارۆی سەرنجم‌و
زنجیر ئابلۆوقەی مێژووم‌و
قەنارە ئابلۆوقەی ملم‌و
دەبابە ئابلۆوقەی خەونی داوەو
فڕۆکەیش ئابلۆوقەی مانگم!
وا ئێستاکەیش لەم تەمی خوێن‌و غوباری مردنەدا
لە سەرانسەری جەستەمدا..
لەم سەرەوە تا ئەوسەری. لە تەوێڵی خانییەوە
تا کەڵەموستی پێی نالیی، لە برژانگی حەبیبەوە
تا ئەگاتە کاکۆڵی زین، نە سەوزەگیایەکی
چاوم‌و نە پەنجەیەکی دایکم‌و، نە لەنجەیەکی
بەفرم‌و نە تروسکایی جۆگەیەك دیارنەماوە.
ڕێگا نەبوو..
من شیعرم کرد بە خڕکەبەردی سەنگەرێ
تا مردنێ بگێڕمەوەو مانگ نەکوژرێ.

ڕێگا نەبوو..
من شیعرم کرد بە خڕکەبەردی سەنگەرێ
کە لەوێوە ئازادییشم
تەقە لە مردن بکاتو
سەری تاریکیی هەڵگرێ!
ڕێگا نەبوو..
ئەبوو ئیتر شیعر بکەم بە مەتارەو
شیعر بکەم بە وردەنانی گیرفانو
شیعر بکەم بە قومبەلەی بەرکەمەرێ.
ڕێگا نەبوو.. لەوە زیاتر
هەر لە خامو جاوی شیعر دادڕمو
بیکەم بە کفنی گردۆڵکەو
هەر لە دارو تەختەی شیعر داتاشمو
بیکەم بە تابووت بۆ دەغڵو
بۆ جەنگاوەر بە پەیکەرێ!
ڕێگەم نەبوو.. لەوە زیاتر
بۆ هاودەنگیی لەگەڵ تەنیایی شەهیدا
شیعر بکەم بە یاوەرێ!
ڕێگە نەبوو.. ئەبوو ئیتر
وشە بکەم بە قۆپچەی بەردینی پاڵتۆی
کێوەکانو وشە بکەم بە دەنووکی قاسپەی بەفرو
وشە بکەم بە بالیفی گمەی کۆتری بریندارو

وشە بکەم بە ژێی خوێناویی گیتاریَ!
ڕێگا نەبوو.. ئەبوو ئیتر
شیعر بەرمە ناو ژانەوە.. هەتا ڕەنگی ناسۆر بگریَ.
شیعر بەرمە ناو گڕەوە.. هەتا ڕەنگی سووتان بگریَ.
شیعر بەرمە ناو کۆچەوە.. تا ڕەنگی ڕاگوێزان بگریَ.
شیعر بەرمە ناو خوێنەوە.. تا ڕەنگی شەهیدان بگریَ.
ڕێگەم نەبوو لەوە زیاتر..
من خاچەکەم لەم دۆزەخە تازەیەدا بڕوێنمەوە
هەتا ئەویش ڕەنگی ئێوەو ڕەنگی مێژووی
پەڕاگەندەو ڕەنگی خاکی نامۆ بگریَ!
تۆ هەنووکە چاوت بووە بە بەستێنی گۆمی کوژراو
هەموو ڕۆژێ لەم کەنارە سامدارەوە
تۆ تارمایی ترسێکی پەلوپۆ داری، خۆت ئەبینی،
سام ئەبینی. دەستی پەڕیوی شەپۆڵو پەنجەی زنەو
کەفەژیلکەی دوا هەناسەی زێ ئەبینی.
بڵقی خوێنی خۆت ئەبینی.
هەموو ڕۆژێ لەم کەنارە سامدارەوە
وەکو تیتڕواسکی غەمگین لە گوێ دەریاچەکەی "دوکان"
لەسەر کۆتەرەی یادگار هەڵئەنیشیو
جەستەی سەرئاوکەوتووی لادێو
جەستەی جوانووی سوار نەدیوو
جەستەی کێڵگەکان ئەژمێری.

تۆ لێرەوە لەم بەستێنە ڕەشپۆشەوە
وەکو ماسیگرەی عاشق لە گوێ گۆمی "دەربەندیخان"
هەموو ڕۆژێ بەرسنگی خۆت ئەدەی لە ئاوەسوورەکەی
ئەم دەڤەرەو یەکەیەکەیش سەری بڕراوی ماڵانی
ناو "سیار"ەو قامیشەڵانی بێنەوای گیانی نالیو
دەشتی شارەزوور ئەژمێری.
تۆ ئیستاکە لەبەر پرژەی "بافل"ەکەی چەمی ڕێزان
هەموو ڕۆژێ گوڵە هێرۆیەکی ئاڵیو بۆ ئاسمانێکی مسینی
پڕ فڕۆکەو پڕ ناپاڵم سەرهەڵئەبڕی.
تۆ ئیستاکە هەموو ڕۆژێ سەری تاجو نووکی نەجمەو
بزماری پۆستاڵەکانی ئەفسەرێکی شاری بەغدا
"زەعیم صدیق" وەکو تەلبەندی حامییەو گوێزانی کول
بە ناو هەناوی دایکتا ڕەت ئەبنو شیعرو یارو و
منداڵیتو گوڵ سەرئەبڕن
تۆ هەنووکە هەموو کاتێ، زریکەی شەو، زریکەی ڕۆژ،
وەکو داوە دەزووی بەربووی سەرهەڵدێرێ،
لە دهۆکەوە بۆ کەرکووك بە پەنجەی کۆڵ ڕائەکێشیو
لە دەنگتەوە ئەیئاڵێنیو لەگەڵ هەموو کسپەیەکدا
مێژوویەکی ئەتلێیتەوەو لەگەڵ هەموو گرمەیەکدا
گێژەڵووکەی بە چواردەوری نیشتماندا ئەخولێیتەوەو
لەگەڵ هەموو دڵۆپە خوێنێکدا تۆ خاچێکی جارێکی
تر لە ناو بێدەنگیی دنیادا ئەڕوێیتەوە!

دیسانەوە ئێوارەیەو
ئەمجارەیان شەقام بە دەنگی بەرز ئەگریی.
دیسانەوە ئێوارەیەو
خۆر بە کەوڵێکی سوورەوە هاتۆتە بەردەمی سەرا.
پێنج ڕێیانی بەردەم سەرا
پێنج قیژەن‌و بە یەکەوە هەڵئەفڕن‌و
پێکیشەوە ئەچنەوە ناو هێلانەکەی فرمێسکی خوا.
ئێوارەیەو لەبەر دەروازەی سەرادا
دوو لاشەیان فڕێداوە
دوو لاشەی باخ.
دوو لاشەی شاخ.
دوو پارچە خۆر.
دوو ڕەزی مۆر.
دوو دیوانی خانی‌و کۆیی
دوو سروودی ڕەنگ پەمەیی
دوو قەسیدەی فایەق بێکەس
دوو گلێنەی حسێن حوزنی
دوو ڕووباریان فڕێداوە.
دوو ئەسپی ڕۆژ
دوو بەردەنوێژی دەرسیم‌و
دوو باهۆزی چیای جوودی‌و
دوو بەهاریان فڕێداوە.

ئێوارەیەو لەبەر دەروازەی سەرادا
دوو پێغەمبەر پاڵکەوتوون‌و خوێنیان داوە بە خۆیانداو
سەریان کردۆتە سەر ڕانی کوردستان‌و
وەك دەریاچەی نێو خۆرنشین
هەردوو نوستوون.
لەسەری گۆیژەوە دوو شەربە لە شێوەی
دوو هەوری سووورباودا
باڵئەگرن ئەو وەختەی ئەگەنە سەر سەریان
سەرەوخوار ئەوەستن
تا قلّپ قلّپ
ئەڕژێن بە مێرگی گولاڵەی لەشیاندا.
"کانی با" دوو کزەی قژسووری ئاوارەی ئەنێرێ
ئەگەنە لایان‌و ئەوەستن
پەنجەیان ئەخەنە ناو ڕیشی تەڕیان‌و
بە تاڵیی خوێناویی کاکۆڵیش
دوو زامی سەرسینەی هەڵەبجە ئەبەستن.
چەرماوەند تەواری سەرماهیی ئەنێرێ بۆ لایان
کە تەوار ئەگاتە سەر سەریان
ئەوەستێ‌و بە دەنووك دوو دڵۆپ
لە کانیی جەستەیان هەڵئەگرێ‌و
ئەیانبا بۆ ئەوەی تینوویەتی
دوو بەردی بشکێنێ!

(بێکەس)یش دوو شیعری دەنگ سووری ئەنێرێ بۆ لایان
کە شیعر ئەگەنە بەردەمیان
ئەوەستن کڵاوی ناونیشان دائەگرن
لەسەرخۆ، لەسەرخۆ، دەست ئەبەن
دوو تاڵ موو لە برۆی هەردووکیان دەردێنن
تاڵەکان ئەخەنە ناو شووشەی حەرفەوە
تاڵەکان ئەخەنە ناو نمەی حەرفەوە
ئەیانبەن بۆئەوەی
لە تاقی کازیوەو
لە ژووری ئازادیی‌و
لە دڵی منداڵدا دایبنێن!

## "چەند نیگارێکی نوێی حوزەیرانی 1963
## کە لەسەر جەستەی قوربانییەکانی زەعیم صدیق هەڵکەندراون"

**یەکەم:**

دەشتێك هەمووی ڕووتەنی بوو
تەنها لە یەك شوێندا نەبێ
کە تۆپەگوڵ تۆپەگوڵی گەورەگەورە
دایپۆشیبوو.
کەس نەیزانی نەهێنیی ئەم پارچە عەردەو

تۆپە گوڵی گەورە چییە.. هەتاکو چوون
عەردیان هەڵکەند
ئەوسا ئیتر ئاشکرا بوو
کە چەند عاشقێکی فتبۆڵ
لە ژێرەوە لە پاڵ ڕەگی تۆپەگوڵدا
ڕاکشابوون!

دووەم:
ئازادیی سکاڵای خۆی هەیە.
قوربانیی سکاڵای خۆی هەیە.
چیایش هەر سکاڵای خۆی هەیە.
گۆڕستانی مۆمەکانیش سکاڵای خۆیان هەر هەیە
هەموویشیان گەر بیانەوێ
سکاڵایان شۆخو شەنگ بێ
سکاڵایان ڕازاوە بێ،
بە چرای وشەی سەوزو سوور
ڕووئەکەنە تاقە کەسێ
سکاڵایان بۆ بنووسێ:
عەرزوحاڵچیەکەی بەر سەرا
ئەو پەخشانەی
کە بە پێوە وەکو فوارە
شەهید کرا!

**سێهەم:**

**حەوشەی ماڵەکانی ئێمە**

**جگە لە چیمەن بۆ قسەو نانخواردنو**

**دانیشتنو پاڵکەوتنو لە دایکبوونو**

**نووستنو شووکردنو ژنهێنانیش.. هتد**

**حەوشەی ماڵمان..**

**زەعیم صدیق.. جەنەراڵی هاوینی مەرگ**

**بۆ یەکەمجار.. یەکەم کەس بوو**

**بۆیشی کردین**

**بە قەبرستان!**

**چوارەم:**

**مامۆستایانو حوزەیران**

**وەکو ڕووبارو سەرچاوەن.**

**دەنگیان یەکەو لەشیان یەکە**

**مامۆستایان لەم یادەدا**

**پۆلێ باڵندەی وشەنو**

**حوزەیرانیش تەختەی ڕەشە!**

**حوزەیران بە گەرمای مەراقو بە قرچەی ئەو هەموو**

**کۆستانە، ئارامتی وەکو پۆڕی ناو گڕە پڕووکان.**

**تۆ ئیستە وەك تەلی دڕکاویی چواردەوری زیندانت**

داخ بوویت‌و به وێنه‌ی خه‌رمانی سووتاوی مێژووت‌و
به وێنه‌ی بازنه‌ی ئاگری ئه‌و پووش‌و په‌ڵاشه‌ی شه‌وانه
له كه‌ژدا ئه‌ڕۆن‌و ئه‌سووتێن كه‌وتوویته هه‌ڵقرچان.
حوزه‌یران جه‌سته‌تی هاویشته ناو گه‌رووی كڵپه‌وه
سه‌رت بوو به سه‌ری شاپڵێته‌و
ده‌ستت بوو به جۆگه‌ی په‌نگرو
ملیشت به گڕدان!
حوزه‌یران به‌هارتی خڵتانی دڕك كرد
"ئه‌و دڕكه نیشانه‌ی ڕسكانی گوڵت بوو"
حوزه‌یران تۆی دایه به‌ر تیغی وه‌یشوومه
"ئه‌و تیغه هه‌تاوانی زامت بوو"
حوزه‌یران چه‌ند شه‌تڵ‌و چه‌ند تۆوی گریانی
له سنگتا شارده‌وه.
"ئه‌و شه‌تڵ‌و تۆوانه كۆگه‌رای ژانت بوون"
حوزه‌یران پاڵێكی پێوه‌نای بۆ كه‌ندو هه‌ڵدێرێ
"ئه‌و كه‌ندو هه‌ڵدێره لوتكه بوون به‌ره‌و ژوور"

جه‌نه‌راڵ صدیقی هاوینی مردنیش
چه‌ند په‌تی بۆ ملی هۆنراوه‌ت هه‌ڵخست‌و
چه‌ند چاڵی له پشتی وشه‌تا هه‌ڵكه‌ندو
چه‌ند كونی كرده ناو دیواری سه‌رته‌وه
په‌ته‌كان.. پلیكه‌ی سروود بوون به‌ره‌و ژوور.

**چاڵەکان.. دێراوی ڕستە بوون بۆ چیرۆك بۆ دوارۆژ.**
**کونەکان.. پەنجەرەی سەهۆڵی کۆنگرەی ئەوینی**
**خەڵکیی بوون**
**حوزەیران.. بە قفڵی قەدەغەی هاتوچۆ**
**چۆنیەتی خولْقانی کلیلی فێرکردی.**
**حوزەیران.. بە دۆزەخ ئاماژەی بەهەشتی بۆ کردی.**
**حوزەیران.. بە سووتان سەوزایی لە گیاندا هەڵکردی.**

**تۆ خاچی مار تێئالاْوی**
**تۆ ئەو کاتژمێری خوێنەی**
**هەموو سەری سەعاتێکی سووتان لیْ ئەدەیتو**
**زەمینێکیت بیستو چوار سەعاتیش جارێك**
**بە دەوری مردنی خۆتدا خول ئەخۆیتو**
**کە ڕووناك ئەبی تەندووریو**
**کە تاریك ئەبی خەڵووزیو**
**تۆ ئەو وەرزی پێنجەمینەی**
**لە ڕۆژژمێری ئەم دنیا بیْ دڵەدا**
**ناوت نییەو ڕەنگت نییەو دەنگت نییە.**
**تۆ هەر بۆ خۆتو لە لای خۆت**
**هەر برینێکت زارێکەو**
**هەموو ئەندامێکی جەستەت گوێچکەو چاوە**
**ساڵ ئەڕواتو کۆست ئەڕواتو**

وەك كوردستان قەرەوێڵەی كۆلێرابێ
دوور لە دنیاو لە سووچێكدا
پەڕ كراوە!

ئەتپرسیو لە خۆتت ئەپرسیی:
تۆ ئیتر ئەتوانی لە نێوان بێدەنگیی بەفرێكی نووستوودا
لە نێوان زایەڵەی ئەو هەموو خوێنەدا باوێشكی شیعرێ بیو
بەرامبەر ئاوێنەی دیوارێك دانیشی؟!
تۆ ئیتر ئەتوانی لە نێوان سێدارەو لە نێوان گەردنی
دایكتدا ئاخێكی گرمۆڵەی ناو گۆشەی گریان بیو
دانیشی؟! تۆ ئیتر ئەتوانی
لە نێوان دەوەنی بە قاسپەو
barووتی ساچمەی كێواندا
شەمشەمەی ئەشكەوتی كوێران بیو دانیشی؟!
ئەتپرسیی لە خۆتت ئەپرسیی:
ئەتوانی قاچی خۆت كلۆم كەیت؟!
ئەتوانی خۆت ئەگریت ببیتە سنووقی تەنەكەی
ژوورەكەو ئاسمانێك لەسەر خۆت دابخەیت؟!
ئەتوانی خۆت ئەگریت.. خۆت بكەیت بە بوخچەو
هەناسەو خۆزگەتو ڕوانینت
پێكەوە گرێدەیت؟!
ئەتوانی وەكو (لاس) باڵ بگری

بۆ گوڵی "عوممان"و؟!
وەك عەشقی سیامەند ڕابکەیت بۆ سەرشاخ؟!
ئەو شاخەی دراوسێی دێرینەی مەراقتەو
بەرانبەر ماڵتانەو
وا ئیستە هەموو ڕۆژ لەوێوە ئازادیی
ئاوێنە ئەگرێتە ڕوخسارتو
بەو شەوقە
چاوانت پڕئەکا لە باران؟!
ئەتپرسیو لە خۆتت ئەپرسیی:
ئەتوانی؟! ئەتوانی؟! ئەتوانی؟!
دیسانەوە ئێوارەیەك..
ئێوارەیەك کە هەر ئەتوت طاوسێکی زۆر غەمگینەو
خەریکە مل ئەخاتە ژێر پەڕوباڵی گەواڵە هەوری خۆرنشین.
ئێوارەیەك کە لە پلوسکی زەردەوە دڵۆپ دڵۆپ
ماچاوی خۆر ئەتکایە ناو زاری بوولێڵی دەربەندو
قژی پری شەوێکی تر خەریك ئەبوو ئەهاتە سەر
دەموچاوی شاری نالیو گۆیژەی دایكو دایئەپۆشین.
ئێوارەیەك کە تاریکیی بە پرتاو هات
پێنج ڕێیانی بەردەم سەرا
وەکو بووبێ بە دەسکەوان وەکو ترسیان تیا کوتابێ
پڕ بە کەپووی شەقامەکان
پڕ بە لووتی کۆڵانەکان

**بۆنی ترس‌و بیمی تیژو بۆنی بۆکڕووزی چۆڵی‌و**
**بۆنی پەنای مردارەوەبووی تاریکیی شارەوانی‌و**
**بۆنی قەدەغەی هاتوچۆی وەك بارووتی**
**لێوە ئەهات.**
**ئەو ئێوارەیە تۆ وتت:**
**لە ئیستەوە من ناتوانم لە نێوانی**
**خوێنی ژاڵەی حوزەیران‌و تەوری ژەنەراڵی مەرگا**
**ڕۆنیشم‌و لە ئیستەوە من ناتوانم ببم بە شیعری**
**کەسیرەی ناو بێدەنگی‌و**
**لەسەر داری قەنارەی خۆم هەڵبنیشم!**
**ئەو ئێوارەیە تۆ وتت:**
**بە سرکەییەکەی دایکت وت**
**بە دووکەڵێکی گۆیژەت وت**
**بە ملوانکەکەی یارت وت**
**بە دیوانەکەی باوکت وت**
**بە ماری گینگڵی شیعرو بە خاچت وت**
**ئەوا ڕۆیشتم!**
**ئەوە شاخە؛ لەم دەراڵی بەردانەدا دۆڵپای داستان**
**پێئەگرێت‌و ئەفسانە چاوی ئەپشکوێ‌و، مێژوو دەست بە**
**باهۆزەوە ئەگرێ‌و ئەڕوا. لەم دەراڵی بەفرانەدا**
**هەزاران ساڵ ڕەقهەڵاتوون. تەماشاکە: بوون بە زنجیرە**
**پەیکەری ناو پێشانگای بەردەمی خوا. ئەوە شاخەو**

شەدەی سەری هەور نییەو بێشە نییەو نە وردە
بەرد چنیویەتیو نە پەلکەگیا. ئەوە شەدەی خوێنی
سەری میدییەکانە کە لە دڵی ئاسیاوە وەك جۆگەلەی
گریانی زیو داگەڕانو لەم هەرێمەدا لایاندا.
ئەوە شاخەو تەلیسمی چاوی ئەشکەوتو قاقای
پێکەنینی عەزیا. ئەوە شاخەو لانکەی کاردۆخ
بە لوتکەوە هەڵواسراوەو خواوەندی "با" ڕای ئەژەنێ
شاخو قۆچی کەڵەکێویش لە بڵندایی ڕەوەزدا بوون بە هێما.
ئەو شاخەو سیحری بەردەو سامی چاوقایمی چیا.
تۆ هاتوویتە ناو هەوێنی ئەوینەوە.. لەگەڵ ڕەگدا
ڕۆئەچیتو لەگەڵ چڵدا ئەشنێیتەوە
تۆ هاتوویتە ناو گلێنەی سەرچاوەوە..
لەگەڵ ئاودا کۆچ ئەکەیتو لەناو خاکدا ئەتوێیتەوە.
تۆ چوویتەتە ناو هیواوە
وەکو گزنگ تۆو ئەکرێیتو
وەکو سەمەلیش ئەڕوێیتەوە
تۆ ئیستە ئەوەندەی کە باران ئازادە.. ئازادی.
تۆ ئیستە ئەوەندەی کە کەوێڵ بێ ترسە.. ناترسی.
تۆ ئیستە ئەوەندەی کە گوڵی ناو ئەشکەوت دڵشادە.. دڵشادی.
تۆ لێرە ئەتوانی لە خەونی پێدەشتدا ئاسك بی،
ئەوکاتەی کە بەسەر جۆگەلەی گوڵاوو بەفراودا بازئەدەن.
تۆ لێرە ئەتوانی لە خەونی خەرەندا شاهۆ بی،

ئەو کاتەی لەسەر باڵ گۆرانیو حیکایەت هەڵئەگرن.
تۆ لێرە ئەتوانی لە خەونی ڕێگادا تەتەر بی
ئەوکاتەی کە نامەی نانو گوڵ ئەبەنو ئەهێنن.
تۆ لێرە ئەتوانی لە خەونی گەلیدا ئەسپ بی
ئەوکاتەی کە زەنگی کوڕژنی هەلگەڕان لێئەدەن
تۆ لێرە ئەتوانی لە خەونی زماندا شیعر بی
ئەوکاتەی کە بەرەو تەلبەندو سێدارەی شارەکان هەڵئەفڕن.
تۆ لێرە ئەتوانی لە خەونی وڵاتدا قامك بی بۆ سەنگەر
ئەوکاتەی سەربەستیو نیشتمان
بە ڕێزەی یاقووتی باریوی
ئاسكو زارۆكو هۆنراوە
تەتەرو شاهۆو ئەسپو دار
سوورهەڵدێن.

تۆ خاچێکی ڕیش هاتوویتو
قۆناغ.. قۆناغ
گەیشتوویتە "مامەڕووتە"
شەوەکی لەگەڵ ئەستێرەو پڕمەی وڵاخی سەرپلەو
خوڕەی ئاوو دەنگی سیسركو حەپەی سەگەلو
بریسکەی چاوی مێگەلو تروسکەی ئاگری جگەرەو
خشەخشی پێی درەختو بە ڕۆژ لەگەڵ
تاشە بەردو مێرگو پردی لەقی تەختەبەندو

دەواری شڕی ڕەوەندو هۆبەهۆی ناو
کێڵگەکانو لەگەڵ شیعرا گەیشتیتە مامەڕووتە.
تۆ خاچێکی ڕیش هاتوویتو
قۆناغ.. قۆناغ گەیشتوویتە مامەڕووتە.
شەکەت.. شەکەت.. کەنەفت.. کەنەفت..
ئەڵێی دەوەنی سەروقژ خۆڵاویتو قاچی ولاخێ
شێلاوتی. چڵکنو گێژ، تەواو وەکو، قازی کزو
قوڕاویی ناو کۆڵانانی زستانی دێ.
گەیشتوویتە مامەڕووتە.
مامەڕووتەو ئەم دنیایە ڕەنگە جیاوازی تەمەنیان
چەند مانگێ بێ. تۆیش تەمەنت بیستو چوار
بزماری ساڵەو بە لاشیپانی جەستەدا داکوتراون.
گەیشتوویتە مامەڕووتەو
ئیستە لەسەر ئەژنۆی بەردی ئەو وەستاویو
هەورێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی شەدەی سەرتەو
ڕەز پشتێنتەو
ئازادیی خۆی، بە تازەیی، هەڵئەمژیی.
تۆ ئیستاکە لە ئەشکەوتی "سەردێمان"دا
لەسەر ئەم یاڵە قژڕووتاوەیەو لەسەر
ئەم گردە کەوش لەپێیە
مەراقی شیرینیی شاخو
مەراقی مێخۆشیی خەوتو

مەراقی ترشی هەژاریی‌و
جەستەی شەقبووی سەرچڵی یادگارێکی
دوور ئەنووسی!

ئەم ئەشکەوتە دەمی داپچڕاوی بەردە لە وەختی هاوارکردندا.
ئەم ئەشکەوتە کونەخەیاڵی سروشتە
لە وەختی شەو ڕام کردندا.
لە وەختی بەفر نووسین‌و لە وەختی خەڵوەت گرتندا.
ئەم ئەشکەوتە شوێنی خۆشاردنەوەی تیشکە
ئەو کاتانەی سەربازەکانی شەوەزەنگ ڕاوی ئەنێن.
ئەم ئەشکەوتە جێی کۆبوونەوەی نەهێنیی باڵدارانە
ئەو کاتانەی ئەیانەوێ باسی داوو باسی تیرو
چۆنیەتی زاڵبوونی باڵیان بکەن بەسەر دێوجامەی
مردندا. ئەم ئەشکەوتە تەختی خواوەندی
تەنیایی‌و بێکەسیشە، ئەو کاتەی جگە لە فرمێسك
جگە لە تاجی نامۆیی کەس بە دەوریەوە نامێنێ.
ئەم ئەشکەوتە مندالْدانی شەوگاریشە
ئەو وەختانەی بەوری ڕەش‌و ورچی سپی- و
توولەماری ڕێگەی ئەبێ!
ئەم ئەشکەوتە برینێکی سارێژنەبووی زەمانیشە
من گوێم لێیە کە بەردەوام ئازار گۆرانیی تیا ئەڵێ.
ئەم ئەشکەوتە هەتا ئیستەیش دەنگدانەوەی حیلەی

ئەسپو سوارەکانی "گەزنەفۆن"ی تیا ئەبیسترێ.
بە دیوارە تەڕەکانیا قومقومۆکەی گیانی پاشایەکی کوژراو
یان پەلکەگیای عەشقی کچێکی لێرە سەربڕدراو
هەڵئەگەڕێن. لە دیوارە تەڕەکانیا هەتا ئیستەیش
فرمێسکی ئاوارە ئەڕوێن.
ئەم ئەشکەوتە ئۆکۆردیۆنی بەر سینگی مامەڕووتەیشە
هەموو شەوێ دوای نووستنی ئێمەو درەخت، دوای نووستنی
ئێمەو قەڵەم. دوای نووستنی ئێمەو ڕادیوێ.
بە پەنجەکانی هەردوو دەستت. دەست بە دوگمەی
ڕەشو سپی سەری ئێمەو بەرددا ئەنێ.
هەر بە بەرسنگی خۆیەوە ئەم ئەشکەوتی ئۆکۆردیۆنە
دێنێو دەبا لەگەڵیا خۆی ڕائەژەنێ. چەناگەی
پێوە مت ئەکات. هەرچی ئاوازی ناو گەلیو
دارستانو چۆمەکانە ئەم لێی ئەدات.
هەرچی فرمێسکی حەیرانە ئەم لێی ئەدات.
هەرچی کازیوەی لاوکە ئەم ئەیژەنێ.
مامەڕووتە ئەم ئەشکەوتی ئۆکۆردیۆنە
لەگەڵ سنگو هەناسەیدا دێنێو دەبا
پەنجە بە دوگمەی دلۆپو دوگمەی تەرزەو
دوگمەی کلووە بەفرا ئەنێو
باران بارانە لێ ئەداو
بەفر باریو

کۆچی سیامەند لێئەداو..
ئاخەکانی خەجو پەری‌و
خەزاڵ پێکەوە لێئەداو
چلوورەی کاوان ئەژەنێ!
پەنجە بە دوگمەو بە گۆپکەی
داری مێوو
دار قەزوان‌و
سەرو و سنەوبەردا ئەنێ‌و
سەوزەڵەخانم لێئەداو
گوڵ ئەژەنێ!
پەنجە بە دوگمەی وەریوی
گەڵاڕێزانیشدا ئەنێ‌و
منی ماڵوێران لێئەداو
پاییزی قژزەرد لێئەداو
تەم ئەژەنێ!
پەنجە بە دوگمەی ئەسرین‌و
پەنجە بە دوگمەی کۆترەکەی
ئاخرشەوی ماڵئاوایی‌و
ئاخرماچی
ڕۆحدا دێنێ‌و
"مەرابوس" لێئەدات‌و
زام ئەژەنێ!

تۆ لێرە مەراقت قەقنەسە ئالوودەی مەراقی
خەڵکییە، هەڵئەفڕی. کزیتو ئەچیتە
سەردەستی لاوازی برسێتیی. کڕیتو ئەچیتە
سەرشانی ڕەنگ زەردییو لاملت هەڵئەسووی
لە ملی ناسۆرو خەفەتیان. تۆ دەنووك لە
گۆنەی خۆڵاویی منداڵیان ئەگریتو تۆ چینە
لە پێستی سووتاوی لەشیاندا ئەکەیتو گوێ
ئەگری لە پینەی شەرواڵو گوێ ئەگری
لە نووزەو کڕووزەی پێخەڤ شڕۆڵەو پێڵاوی
دڕاویان. هەموو جار میوانە ئاخێکی ناکامو
بێهودەی. هەموو جار حەز ئەکەی، خۆزگەتە
تۆ ببی بە گەنمو بە نیسكو ماشەڕەش بۆ
ئەوان. خۆزگەتە تۆ ببی بە کەللەشەکرو
بە چاییو بە ڕۆنو بە نوقڵو بە دەرمان
بۆ ئەوان. حەزئەکەیت، خۆزگەتە، تۆ ببی
بە تۆپی قوماشو بە یاریی منداڵان بۆ ئەوان.
تۆ نابی. تۆ نابیو ئەوساکە هەنسکی
قەڵەمیو شیعرێکی ناسکیو دەست ئەکەیت بە گریان.
هەموو ڕۆژ تۆ ئەڕۆی هەر ئەڕۆی تا ئەگەی
بە پەریی باڵداری داستانێ. ئەچیتە پێشەوە. چرپەیەك
بە گوێیدا ئەکەیتو ماچێکی ڕوومەتی ئەکەیتو

دوو شیعریش ئەبەستی بە پەڕو باڵیەوە هەتاکو
بیانبا یەکەمیان بۆ دایکت‌و دووەمیان بۆ کچێ
کە ڕەنگی چاوانی خواستووە لە ئاسمان.
درەنگان دێیتەوە ژوورەکەی ئەشکەوتی سەردێمان
ئەچیتە ژێر پەتووی شەوێکی کڕەوەو پاش تۆزێ
ئەنوویت‌و لە خەوتا تۆیش ئەبی بە کوڕی نێو داستان.

## "چەند تابلۆیەکی هەڵواسراو بە دیوارەکانی ئەشکەوتی سەردێماندا"

**یەکەم:**

ئێمە لێرە لە هەناوی ئەم شاخەدا
لەم کلۆرە بەردینەدا
بۆ ئەو پیاوانە ئەنووسین
کە پاشەڕۆژ ناچار ئەکەن بێت‌و
کە مردنیش ناچار ئەکەن هەڵبێت.
بۆ ئەو پیاوانە ئەنووسین ڕەنگی شەفەقیان گرتووەو
بۆنی ئازادییان لێدێ.
بۆ ئەو پیاوانە ئەنووسین
کە میوانداریی خۆر ئەکەن
لە زۆزک‌و لە هەندرین.

**دووەم:**

چوارگۆشەیەکی هاوڕێی ناو ئەشکەوت بووین

هەموو جارێ سەرمان ئەنا
بە بازنەی ئەشکەوتەوە
تا شەویش خەوی لێئەکەوت
لەبەر ئاگری ڕازی یەکدا دائەنیشتین.
بەیانییەك "عوسمان"یان برد
عوسمان وەکو مووروویەکی چاوشین
وەکو شیعرێکی سەربالٚ شین
لە ڕنۆ بەفری دیلمانو هۆمەرانو گەلاٚلٚەدا
ونیان کردو نەهاتەوە
نەهاتەوەو نەهاتەوەو نەهاتەوە!
سێگۆشەیەکی هاوڕێی ناو ئەشکەوت بووین
سەرمان ئەنا بە بازنەی ئەشکەوتەوە
تەم هاتو ڕۆی
خەم هاتو ڕۆی
خوێن هاتو ڕۆی
سالٚ هاتو ڕۆی
"دلٚشاد" بە دەستی برسێتیو شووشەی بادە
زامدار کراو لە دووکەلٚی جگەرەدا خنکا.
"عەبدولخالق" لە هەولێرا
بە شمشێری "سەعد" کوژرا!
چوارگۆشە هەلٚوەشایەوە
سێگۆشە هەلٚوەشایەوە

دەوری بازنەش بەردراو
وا ئیستاکەیش وەك ئەبینن من هەر خۆمم
هەر لایەکی چوارگۆشەکەم
هەر یەك هێڵی ئەم کۆستانەم
هەر یەك دەستی ئەم زامانەم
من نازانم چ ڕۆژێکیش
لە شەممەوە هەتا شەممە
چ سەعاتێك لە بیستو چوار سەعاتەکە
ونم ئەکەن وەکو مووروو
ئەمفڕێنن وەك چۆلەکە
من نازانم مەی ئەمکوژیٚ؟ ئاوارەیی؟!
یاخود دووکەڵی جگەرە؟!
من نازانم کام شمشێریش
شمشێری عومەر.. ذو الفقار؟!
شمشێری سەعد.. یان قەعقاع؟!
کامیان دێتو سەرم ئەبڕیٚ!
هەرکامێکیان دێن دەبا بێن
خۆ من ئەم شیعرەم تەواوکرد
خۆ من ئەم شیعرەم خوێندەوە!!

سێهەم:
لە ئەشکەوتی سەردێمانداو

لەسەر داوای مامەڕووتە
من ئەم تابلۆیەم دروست کرد:
زەمینەکەی: پووشی زەردی کاولاشێکی قلێش قلێش.
لەولایشەوە درەختێکی پەلوپۆ ڕووت
مەلێك ئێسکی بە دەرەوە..
کەچی بەردەوام ئەخوێنێ
ئاخ هەژاریی!
ئاسمانێکی خۆڵەمێشیو دوو فڕۆکەی لەش تاریكو
لە ناوەندا پەڵەیەکی سوور وەك یاقووت
کە بەردەوام ئەجریوێنێ
ئاخ نیشتمان!
لە ڕاستەوە.. قەڵبەزەیەك
بەسەر بەردێکدا بازئەداو
مامزێك لێی ئەخواتەوە
منداڵێکیش تیشك ئەچێنێ
وای لە ئەوین!
لە چەپەوە دوو شاخ شەڕەقۆچ ئەکەنو
قۆچەکانیان لەناو سکی یەکتردایەو
خوێنیش بووە بە تاڤگەو
دیواری بەردیش خەریکە هەرەس دێنێ
ئاخ شەڕی خۆم لەگەڵ خۆمدا
ئاخ شەڕی شاخو شاخو شاخ

شاخ.

ئاخ!

**چوارەم:**

له ئەشكەوتى سەردێماندا
پیاوێك باوكى سیوپێنج كوڕ بوو
ئەم باوكە سەرى لە كۆترو
بەژنى لە دار زەیتوون ئەچوو
ئەم پیاوە كوڕى خابوورو
برابچووكى شەماڵو
لە هۆزى گوڵو ڕێحان بوو.
مامەڕووتەو
هەر سیوپێنج كوڕى ناو ئەشكەوت
بە قەد ئاردو بە قەد ئاوو
بە قەد هەتاو خۆشیان ئەویست
ڕۆژێ بەغدا هەر لە بەغدا
مینێكى باڵدارى ناردو
دارزەیتوونى تەقاندەوە
دار زەیتوون بوو بە چوار پارچەى ناو ئاسمانو
بە چوار باڵى دەم ڕەشەبا
كەرتێ فڕى بۆ مەهاباد
كە نیشتەوە بوو بە لانكە بۆ منداڵێ.

کەرتێ فڕی بۆ عاموودا
کە نیشتەوە بوو بە پردێ بۆ چیرۆکێ.
کەرتێ فڕی بۆ ناو دەرسیم
کە نیشتەوە بوو بە کورسی بۆ هەڵبەستێ.
کەرتێ فڕی بۆ ناو کەرکووك
کە نیشتەوە بوو بە سەبەتەیەك بۆ نان
لە دواییشدا
کۆترێکی سوور هەڵفڕیو.. وا یوسفیی
گەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکەی "سەردێمان"!

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ سەفەری وەنەوشەیی ئێوارانی.. وەختێ کە شاخ
وەکو دایکت بەجێدێڵی.
تۆ سەفەری ئەرخەوانیی بەیانیانی.. وەختێ گریانی ژوورەکەت
وەکو پەنجەرەی بارانو
خەونی تەڕت لە ئەشکەوتی سەردێماندا بەجێدێڵی.
تۆ سەفەری بەفرانبارو وەرزی دابڕانی عەشقی
وەختێ جێ ژووانی شیعرو هەزار هەزار گچکە ئاوێنەی یادگار
لەسەر بەفری نوا باریو
وەك جێ پێی وردی چۆلەکەو جێ پێی وشە
لە سنگی مامەڕووتەدا بەجێدێڵی.
گەڕایتەوە. دوای هەڵفڕینی کۆپتەری پڕ لە ماچو
پڕ لە تەوقەو پڕ لە بەڵێنی سەوزو سوور. گەڕایتەوە.

ئەمە وچانی بەردە یان فێڵی ئاگر؟!
ئەمە حەسانەوەی بەفری هەڵگوردە یان
خۆ کۆکردنەوەی بیابان؟!
ئەمە گێژبوونی شاخە دوای سووڕانەوەی
بە دەوری ئەم جیهانەدا یان
ڕاچڵەکینێکی تری خوێنە دژی مردن؟!
ئەمە گەڕانەوەی بایە بۆ ناو ئەشکەوت؟!
یان خۆمەڵاسدانی خۆرە جارێکی تر؟!
ئەمە ساویلکەیی ئاوە لە لادانیا بۆ گرتنی؟!
یان قەڵەمبازی هاژەیە بەرەو مەودای زێیەکی تر؟!

هەموو جارێ ئەم بازانە تەماشایان لم ئەیخوات و
لەناو لمدا باڵیان ئەشکێ و لەناو لمی نامۆییدا
ئەبێ بمرن! هەموو جارێك ئەم بازانە بۆ ئاسمانێك.
چەند ئاسمانێك لەسەر خۆیان دائەخەن و بۆ جۆگەیەك
دڵی دەریاچە ئەشکێنن! هەموو جارێ بە تۆڕی
لم شاخ ئەگیرێ و دیسانەوە ئەچینەوە ناو تۆڕی لم.

گەڕایتەوە. وەکو مۆمێکی کوژاوە، بە دوای خۆتدا
دەزووی دووکەڵت ڕاکێشا. گەڕایتەوە وەکو
خوێنێکی کوژاوە بە دوای خۆتدا دەزوولەی خوێنت ڕاکێشا.
بە ناو پردان و گەڵاڵە و پردی زەردو ناوگەلیدا
تێپەڕیت و بە دوای خۆتدا لاشەی خۆتت ڕائەکێشا.

بە دوای خۆتدا مووی ڕووتاوەی سەری کەژو ڕەزەکانت
ڕائەکێشا. وەختێ گەیشتیتە ماڵێ تۆ گلۆڵەیەکی
گەورە بووی لە دەزووی دووکەڵو خوێنو لە تاڵە
قژی کێوانو خاچێکی ژانگرتوو بووی وەکو عیسا.

تۆ ئیستە لای دیجلەی!
گەر دیجلە وەفای بۆ سەرچاوەی خۆی هەبێ
ئەبێ تۆی خۆش بوێ!
تۆ ئیستە لای دیجلەی لە ژووری برۆنزیی شەپۆلیا وەستاویو
لە درزی ئاوەوە تەماشای نەهێنیی قوڵاییو
جیهانی شاردراوەی خوا ئەکەی!
تەماشای داڵانی گژوگیاو
هەیوانی گوڵانو
تەماشای تابووتی درێژی قوڕ ئەکەی!
تۆ ئیستە نەورەسی
تۆ خولیای سپیتو ئێواران لە زەردەی مەراقدا
هەڵئەفڕیو دەنووکی وشەتو بەرسنگی ڕستەتو
گەردنی خەیاڵت لەم مێژووە شینەدا نوقم ئەکەی.
تۆ ئیستە لای دیجلەی:
گەر دیجلە وەفای بۆ سەرچاوەی خۆی هەبێ
ئەبێ تۆی خۆشبوێ.
ئەو ئیستە قامووسی ئاوێکی بەرینەو تۆیش ماسیی

شیعرێکی ناو ئەوی. ئەو ئیستە واگۆنی درێژی
بارانەو تۆیش نمەی نەفەرو ئاخێکی سەفەری
ناو ئەوی. ئەو لەناو چاوانی هۆزگەلی
بەفرەکەی تۆوەیە هەڵئەقوڵێو تۆیش نەوەی
ئەو بەفرەو چلێکی ئاوبردووی هۆزگەلی.
ئەی دیجلە!
ئەی باسکی شلی خواو ئەی قیژەی تەڕی خاك!
ئەی حیلەی تەقیوی سەرچاوەی شاخەکان!
ئەی هاژەی ئەبەدیی لە گوێچکەی گەردووندا
مەگەر تۆ بیزانی. مەگەر تۆ بیژمێری، لەوێوە
چەند وەرزی خنکاوو چەند هیوای چاوشینی
خنکاوم بە قۆناغ لەگەڵتا هاتوونە ئەم خوارە.
مەگەر تۆ بیزانی. مەگەر تۆ بیژمێری، چەند عەشقی
خنکاوو شۆڕشی خنکاوو دڵداری خنکاوم
لە بنتا نوستوونو گەیوونە ئەم شارە.
تۆ بڕۆو ئەم هەموو لاشانەم
هەر بە شان هەڵگرەو بیانخە ناو گیانی زەریاوە
تا زەریاش بۆنێکی زایەڵەی من بگرێ.
تۆ بڕۆو ئەم هەموو گوڵانەم لە چاودا هەڵگرەو
بیانخە ناو دڵی زەریاوە
تا زەریایش ڕەنگێکی ناکامیی من بگرێ
تۆ بڕۆو ئەم هەموو کۆستانەم

بۆ زەریا بژمێرە
تا زەریا تووڵانیی نامۆییم بناسێو
سبەینێ سکاڵای بە خوێنی ئەستێرە نووسراوم
هەر لە تۆ وەربگرێ!
ئەی دیجلەی هەڵقوڵیو لە تەختی تەوێڵما!
تۆ کچی بەفرمیو تۆ خوڕەی ناو سەرمیو
کەچی تۆیش هەر وەکو باڵندەی زمانم
لە زۆر شوێن قەدەغەی لابدەیت!
سڵاوێ بکەیتو قەدەغەی بگەیتە
دوورایی تینوێتیم!
قەدەغەی دەستێکی تەڕی خۆت درێژکەیت
بۆ دەمەقلێشی ناو دەستمو
قەدەغەی ماچت کەن: دەشتی کوێر
گڵی کوێر، کێڵگەی کوێر
وەك ماچی قەدەغەی
نێوانی ئازادییو وڵاتم!
بەغدا! کەللەی سەری: هێشووە خورماو
بەژنی: منارەیەکی مسینی مێژووی کۆنەو
قاچەکانی کوورەی خشتو لەناو دیجلەدا دایناوە!
لە نێوانی سەرسامبوونی چاوی منو ئاپارتمانی کۆنکرێتیو
کۆگای سەوزو سووری زۆرو ئەسپی برۆنزیی پەیکەرو
گۆڕەپانی بە ئاپوورەی خەڵكو گوڵدا: هەزار خولیای

کۆن‌و تازە بەسەر پردی هەردوو بەری سەر دیجلەدا
دێن‌و دەچن. هەوری ڕەنگاڵەی سەرسامبوون
دامئەپۆشێ. من ئیستاکە لە کەوێکی ونبوو ئەچم
کەوێکی گێژ: بزر لەناو پانتۆڵی ڕەشی شەقام‌و
کەمەربەندی گۆڕەپانداو ناچمەوە سەر ناونیشانم.
بە دەوری تەپکەی پرسیاردا هەر خول ئەخۆم
من کەوێکم خۆم هاتوومە بەر شەوارەی
ئەم پایتەختە. بەڵام بە شوێن دانەوێڵەو
ئاودا هاتووم. ئەگەڕێم‌و هێشتا پەڵە
خوێنی شوبات بەرامبەرم ئەجریوێنێ!
شوێنەواری زریکەکانی (ساحەی کەشافە) ڕەش ئەچنەوە.
هێشتا لوورەی شەمەندەفەری مردنیش هەر دێتە گوێ.
چەندین جادە بە کراسی ئاودامانی سووریانەوە
بەرەو ڕووم دێن. بە سەریاندا ئەپەڕمەوە..
من خاچەکەم بۆنی ئەشکەوتی سووتاوی لێدێ‌و
ئەوان بۆنی ڕۆژنامەی سووتاوو بۆنی نووسینگەی
سووتاوو بۆنی ژووری مەرگیان لێدێ.
ئەگەڕێم‌و جادەی "ڕەشید" جۆلانەمە
هەموو ڕۆژێ هەزار جارم دێنێ‌و دەبا.
لە نێوانی موتەنەبی‌و ڕەصافیدا
من وشەیەکی برسیم‌و من شیعرێکی بێکارم‌و
من گیرفانی چۆڵی قوڵفەم. خەونی کلیلێکی ونبووم

كتێبی کەوتووی سەرشۆستەم. وا ئیستاکە
من "شێت"ەکەی "جوبران"م و لە خۆمەوە
پێئەکەنم و بە خەڵکیدا هەڵئەڕوانم.
لائەدەم و ئەچمە زاری شۆڕیجەوە:
گەرووی بازاڕ وەك پارووییەکی زۆر بچووك
بە ئاسانی قووتم ئەدا:
فەیلییەکان و شاخی پشتیان ئەبینم و پووزی
بەردیان. فەیلییەکان و زەنگوڵ زەنگوڵی
ئارەقەی شین و مۆری سەر تەوێڵی کێڵگەی ڕەنجیان.
ئەم فەیلیانە: جۆگەی ماسولکەی بازاڕن.
شەپۆلی مەچەك و دەستن.
کەمەریان کەمەری خۆرەو
ڕانیان ڕانی داربەڕووەو
قاچیان قاچی گەلیەکانی ئەردەڵانەو
سەریان سەری کەڵەکێوی و
ئازارن و بەختیارن!
ئەم فەیلیانە بە بنەچە لە بازۆکانی میدیان
لە ڕەگەکانی ئاگرن.
ئەم فەیلیانە کوڕی ئاوارەی ڕەشەبای ڕۆژهەڵاتن و
لووڕی برووسکەو باران و
لووڕی هەورن!
ئەم فەیلیانە نائومێدیی بە لەپی دەست ئەشکێننەوە

ماندوێتی ئەکەن بە گوریس
لە دژواریی شەتەك ئەدەن
زەلیلیی پێئەبەستنەوە!
ئەم فەیلیانە ئەو پەنجانەن
لە کۆنەوە جومگەکانی جەستەی بەغدایان بەستووە.
ئەم فەیلیانە ئەو شانانەن لە کۆنەوە
ئاسنو کۆست، خانوو و پردو، شەوی قورسیی
ئەم شارەیان هەڵگرتووە..
ئەم فەیلیانە چەمی هێزنو
ئەڕژێنە جەستەمەوە!

لائەدەیت. ئەمجارە ئەچیتە شەوەوە
لە دەمی پەرداخی بادەوە ئەچیتە شەوەوە.
شەو لێرە: ژنێکی سەرخۆشەو مەیخانەماڵێتیو
هەتاکو بەیانی ئەستێرەی سەرخۆشە!
درێژە کەناری ئەم ئاوە خومارە
وەك ڕۆخی خەیاڵی نەواس خۆی.
ڕەنگینە ئەم جادەی بادەیە
وەك دەستی بە جامو قەسیدەی چاومەستی
"نەواس" خۆی!
ئەچیتە شەوەوە. ئەچیتە ماڵی مەی. ئەچیتە لای
"عەشتار" گۆشەیەك وەك گۆشەی چاوانی

وەك گۆشەی پرسیاری سەرسامیی. ئەگریتو ئەوساکە
بە خۆتو بە شەوو بە مەیدا ڕۆئەچی. ڕۆئەچیو
ڕۆئەچی. هەتاکو ئەگەیتە سەر بنجی تەنیاییو
سەر ڕەگی نامۆییو ئەچیتە سەر باڵی سیمرخی
سەرخۆشی. سەرەتا هیچ ناڵێی گوێ ئەگری:
گوێ ئەگری لە ڕووبار ئەوکاتەی کە ئاوی شمشێرو ڕم ئەدەن.
گوێ ئەگری لە گوڵان ئەوکاتەی کە ئەبن بە ژەهر.
گوێ ئەگری لەگەڵا ئەوکاتەی کە ئەبێ بە گوێچکەی مەرگەوەڕ.
گوێ ئەگری لە مانگو ئەستێرە ئەوکاتەی کە ئەبنە دەلیلی پیاکوژان.
گوێ ئەگری لە مێژوو ئەوکاتەی کە درۆ ئەژمێرێ.
گوێ ئەگری لە شەیتان ئەوکاتەی نوێژ ئەکا.
گوێ ئەگری لە شیعر ئەوکاتەی کە ئەبێ بە لێبووك.
گوێ ئەگری لە ناخت ئەوکاتەی ئەترسێو ڕائەکا.
تۆ ئیستە بێشەیەك لە خاچی پرسیاری.
تۆ ئیستە باڵندەی وڵاتی پرسیاری.
دوورترین ئەستێرە دائەگریو ئەیخەیتە سەر مێزی بەردەمت.
تۆ بۆ هەیت؟!
ئەچیتە زەریاوە پرسیاری لێئەکەی
تۆیش ئەمری؟!
وەك مەرگ تارمایی پیاوێ بێو لاتەوە وەستابێ
پێی ئەڵێی: بۆ بمرم؟!
وەك زەمان تارمایی ژنێ بێو بە تیژی بە لاتا تێپەڕێ

ئەپرسی: لەبەرچی ناوەستی؟!
گیانی خۆت ئەخەیتە پەرداخی بادەوەو
پرسیاری لێئەکەی: لەبەرچی جەستەی خۆت جێدێڵی؟!
ئەپرسیو ئەپرسیو ئەپرسی..
تا ئەبی بە شارە مێرووڵەی پرسیارو ئەوروژێی،
بە ڕێچکە ئەدەیتە سەری خۆت. ئەدەیتە ڕووبارو
ئەدەیتە ئاسمانو ئەدەیتە عەشتارو ئەدەیتە
بەغدادو ئەدەیتە گشت دنیاو.. ئەوکاتەی هەڵئەسی:
هەست ئەکەیت سەرت لای ئاسمانەو
دەستت لای ڕووبارەو
قاچت لای درەختەو
چاوت لای عەشتارەو
دەمت لای نامۆییو
ئەمجارە ئەنوویتو ناپرسی!

ئەی بەغدای ئاوو ئەستێرەو وشەی باڵدار!
ئەوە چەند وەرزی نامۆییو چەند سیاساڵ تێئەپەڕێ
بەسەر یادی یەکەم ماچی نێوان تەنیاییمو دیجلەی تۆدا؟!
ئەوە چەند خولی مانگی شیعرمە
کە بە دەوری شەوەکانی شەهرەیارو شەهرەزاددا ئەخولێتەوە؟!
من مۆزەخانەی سالآنتم
من بەردەیادی نووسراوو

تازەترین گۆزەی خەمو مەراقتم
مۆزەخانەم بۆ چاوانێ گریانی بەردو دەستخەتی
شاخەکانم وەکو خۆی ئەخوێنێتەوە..
لە هێماکانی کۆڵینی سەردیواری ئەم غوربەتە
کۆنەم ئەگەن..
لە سێبەری شوێنەوارە پەرتەکاندا
تیرو نێچیر.. منو تەور
لە یەکتر جوێ ئەکەنەوە!
سیمای دوێنێی فریشتەکەی بەر ئاگری گاتاکانم
ئەناسنەوە. دەزگیرانە میدیەکەی من، کە لەو
سووچەدا وەستاوە. نایکەن بە هاوسەری کۆرش‌و
بە کەنیزەکی خەلیفەو پەچەیشی پێ ناگرنەوە.

ئەی بەغدای ئاوو ئەستێرەو وشەی باڵدار!
من مۆزەخانەی گەڕۆکی دەربەدەریم
من نە دەرگاو نە کلیل‌و نە قفڵ‌و
نە گاردم هەیە!
من مۆزەخانەی گەڕۆکی ئاوارەییم
بێ دیوارم.. وەکو لەشم
بیست‌و چوار سەعات کراوەم.. وەکو دەشتم.
بیست‌و چوار سەعات ئامادەم.. وەکو ئەشکم.
ئەی دەنگی ئاوو ئەستێرەو وشەی باڵدار!

من لە نێوان هەردوو بەری ئەم ڕووبارە وەڕسەدا
هەموو ڕۆژێ ئاسۆیەکم تەم لە کۆڵو دێمو دەچم.
من بۆئەوەی لەم ڕووبارەو بەغدا بگەم
هەموو ڕۆژێ شەپۆلێكو هاوارێکیان وەکو کراس لەبەر ئەکەم.
من بۆئەوەی ببمە هاودەمی نامۆییو
دۆستی نزیکی تەنیایی
هەموو ڕۆژێك سەرێك لە شیعری سەیابو جیکۆر ئەدەم.
من ناتوانم لێرە هەڵکەم
ئەگەر بۆ هاودەنگیی شەوم
دیجلە ژوورەکەم پڕ نەکا لە هاژەی خۆی!
من ناتوانم لێرە هەڵکەم
ئەگەر هەموو بەیانییەك..
نەبمە باڕێزەو ڕێژنەو
بەسەر زامێکدا دانەکەم.
من ناتوانم لێرە هەڵکەم
ئەگەر هەموو بەیانییەك
بە "هەشت" لاپەڕەی ئاسۆیی
ڕۆژنامەی ڕێگای دووکەڵو
سێدارەکانم دەرنەکەم!
من ناتوانم لێرە هەڵکەم
ئەگەر هەموو ئێوارەیەك
چارۆگەیەکی تازەتر بۆ ئەم کەشتیی

بەدبەختییەم پەیدا نەکەم.
من ناتوانم لێرە هەڵکەم.
ئەگەر هەموو ئێوارەیەك.. بە دووقۆڵیی
لێرە لە "باب الشرقی"دا
لەگەڵ بایەکی ئەزمەڕی ئاوارەدا سەما نەکەم.
من ناتوانم لێرە بژیم
ئەگەر هەموو شەوێ جارێك
لە گۆشەی بێئارامیداو لە مەراقدا
لەناو مەیدا ئارام نەگرم.
من لێرە ناتوانم بژیم
ئەگەر هەموو ڕۆژێ جارێك بۆ عەشقێکی تازە نەمرم!
تۆ لە ڕووباری کتێبدای. هەموو ڕۆژێ شەپۆلی
تازەی کتێبێ. گەرداوی شیعرو چیرۆکێ تۆ ئەباتو
ئەتدا بە دەم جیهانەوە. تۆ ئیستاکە بەو زمانەی
"حەللاج" تیایدا ئەتوایەوەو "موتەنەبی" تیایدا
ئەفڕیو "سەیاب" لەناویا ئەگریا: کەوتوویتە
سەوڵ لێدانو سەرت بووە بە فەنەری ڕێگەوبانی،
حەللاج ئەتبا بۆ لای لۆثەر. موتەنەبی ئەتبا بۆ لای
شکسپیرو سەیاب ئەتبا بۆ لای ئەلیوت ئا بەو جۆرە
تۆ ئەتوانی، لە زەماوەندی خوێناویی گارسیا لۆرکادا
دەست بگریو لە سالۆنی ژێر زەریادا لەگەڵ ڕامبۆ
بخۆیتەوەو گوڵێکی ڕەشیش لە بۆدلێر وەربگریتو

بیدەی لە قژی یارەکەت.

ئەو کچە ئەبینی..
ئەیبینیو بۆی ئەبی بە گوڵدان
ئەیبینیو بۆی ئەبی بە مۆمدان.
تۆ بۆنی دارچوالەی ناو ئالان ئەکەیتو
وا ئیستە لەگەڵتەو هاتۆتە -کەڕادە-.
تۆ بۆنی پونگەی ناو مێرگێکی لای کاژاو ئەکەیتو
وا ئیستە هاتۆتە بەردەمتو هاتۆتە -کەڕادە-
ئەوینەو وەك هەرمێ گوڵاوی تەڕبووە.
ئەم بەژنە هی شیعرە لە وەختی سەمادا؟
یان هی ئاو ئەو وەختەی بە پێوە ئەوەستێ؟!
ئەم قژە هی ڕەزە لە وەختی ڕۆیشتنا؟
یان هی کەژ ئەو وەختەی کە ئەنوێ؟!
ئەم ڕەنگە هی وشەی ئەسمەرە
ئەوکاتەی کە ئەبێ بە خاکی گەرمیان؟!
یان ڕەنگی گەنمی خوێنگەرمە
ئەوکاتەی بەرامبەر خۆرەتاو هەڵئەچێ؟!

ئەم ئەوینە ئەچمە بەریو ئەمکا بە گۆماوی خەیاڵ.
ئەم ئەوینە ئەچمە بەریو ئەمکا بە ئاوێنەی نزار.
ئەم ئەوینە ئەچمە ناویو
بە قژی خۆی دامئەپۆشێ

ئەم ئەوینە جارێك ئەمكا بە بلێسەو
جارێکی تر بە تاڤگەو
جارێکی تر بە باڵندەی
باڵ زیوینی
وڵاتی یار!

ئەوین چییە؟! ڕۆحی شەوە؟! ڕۆحی ڕۆژە؟! ڕۆحی خاکە؟!
هێزێکی تری سروشتە وەکو ئاوو
وەکو هەواو وەکو مردن؟!
یان هەر کلێپەی ئارەزووە
کە هەڵبوو.. دامرکێتەوە؟!
ئەوین چییە؟! دژەمەرگە؟!
دژە وەڕسبوونی لەشە؟!
نوێ بوونەوەی بەردەوامە؟! یان وەرزێکی تری جەستەو
یاخود دەستو پەنجەی خوایە؟!
یان سەرچاوەی خوێنی شیعرەو وشك نابێ‌و دوایی نایە؟!
ئەوین چییە؟! ژیانەو تێکەڵی مەرگە
ئاگرەو تێکەڵی ئاوە؟!
زەنگی ڕەنگە؟!
بۆنی دەنگە؟!
وڵاتی بیرنەچوونەوەی خەونە؟!
هزرە کە وەختێ کوێر ئەبێ؟!

**هۆشە کە بێهۆش ئەکەوێ؟!**

**ئەوین چییە؟! تەزوویەکە دێتو ئەڕواو ئاوا ئەبێ؟!**

**سڕبوونێکی تەماشایەو بە سحری هێزێکی نادیار؟!**

**چەخماخەیە لەناو دڵدا؟!**

**تۆفانێکە لەناو سەردا؟!**

**ئەوین چییە؟! من نازانم ئەوین چییە؟!**

**بەڵام کە دێت بە دووباڵی گڕوبارانەوە دێتو**

**لەملاوە ئەمکا بە سووتوو**

**لەولاوە نوێم ئەکاتەوە.**

**تۆ خاچی مار تێئالاَوی**

**تۆ سۆراخی ئۆقرەی سەر ئاگری بوونیو**

**تۆ باڵی فڕینی ئاوی.**

**تۆ خاچی مار تێئالاَوی**

**تۆ هەناسەی لە نیشتمانی تاساوداو**

**دڵۆپێکی لەو وشانەی**

**کە لە چاوی نامۆییدا**

**قەتیس ماوی!**

**ئەمێستا سەردەمی سامداری کۆشکێکە.. کۆشکێکی کۆتایی**

**ڕازاوە بە پشکۆی خواوەندی تەمووزو**

**ڕازاوە بە چرای خوێناویی سێکوچکەی پەیامو**

**ڕازاوە بە ڤیژەی هاوینو زریکەی شەوانی.**

ئەمێستا ڕۆژگاری کۆشکێکە
لە چاویا نیشتمان مەییوە.
لە دەنگیا شیر ئەڕوێو
لە بەرپێی نەهەنگیا، بەستوێتی ڕووباری
قرمزیی قوربانیی‌و
ئەستێرکی فرمێسکی هەڵبەست‌و گۆرانیی.
ئەم کۆشکە سەرەتاو کۆتایی دیارنییە.. کۆشکێکەو
وڵاتێ لە بەردو لە لم‌و لە گۆشت‌و
لە ئێسکی قووتداوە.
دیواری لە جەستەی لەتلەتی ئاسۆیە.
پەنجەرەی لە ئێسکی شکاوی هەتاوە.
ئەم کۆشکە بنمیچی لە باسکی بڕڕاوی باخانەو
ئەم کۆشکە هەرێزی لە شەتڵی دەمارو پەنجەیەو
شوورەیەك لە ڕم‌و لە ترس‌و لە عەزیا
چوار دەوری گرتووە.
ئەم کۆشکە
دایەنی زۆڵێکی مێژووە!

چەند هەوری سك پڕیان گرت‌و، بردیاننە ناو ئەم کۆشکەوەو نەهاتنەوە!
چەند شنەبای گەنجیان گرت‌و بردیاننە ناو ئەم کۆشکەوەو نەهاتنەوە!
چەند پەرەسێلکەی قەڵەم‌و چەند باراننامەیان گرت‌و
بردیاننە ناو ئەم کۆشکەوەو.. نەهاتنەوە.

چەندداربەڕووی کاسپیان گرت. چەند دارخورمای شاعیریان گرت
بردیاننە ناو ئەم کۆشکەوەو نەهاتنەوە..
چەند شۆڕەبی ژنیان بردوو.. چەند مامزی کچیان بردوو
چەند چەخماخەی ئەفسەرو سەربازیان گرتو
بردیاننە ناو ئەم کۆشکەوەو نەهاتنەوە!
چەند دارتەلی کرێکارو چەند منارەی ڕیش درێژو
چەند کلاوکوڕەی ڤازییان گرتو بردیاننە ناو ئەم کۆشکەوەو نەهاتنەوە!
چەند پەپووسلێمانکەی ئاخوونو چەند ئەستێرەی ئاشوربانیپاڵو
چەند هیلالی تورکمانو چەند تاوسی یەزیدییانو
چەند شینەشاهۆی سەرخۆشو
چەند تاقتاقەکەرەی زۆر بلێو
چەند پڵنگی شۆڕشگێڕو
چەند محەمەدو چەند مووساو عیساو
چەند عومەرو چەند عەلییان گرتو
بردیاننە ناو ئەم کۆشکەوەو نەهاتنەوە
چەند خزمی نزیکی خوایان گرتو بردیاننە ناو ئەم کۆشکەوەو
نەهاتنەوەو نەهاتنەوەو نەهاتنەوە!

من ئێستا وەك جاران ناوێرم ژوانێ دابنێم
بۆ دیجلەو پێی بڵێم: دووقۆڵیی خۆرنشین
هەر لەژێر پردەکەی "ئەحرار"دا یەکتری ببینین.
ئەترسم نەبادا، ماسییەك، شەبوطێ،

جاسوس بێو ڕاپۆرتم لێبداو بنووسێ
گوایە من بە دیجلەم وتووە: ئەوەندە بۆ ئەنوویت
دە هەڵسەو هەڵبچۆ!

من ئیستە وەك جاران ناوێرم ئەوەندە نزیکی پەیکەری
ڕەصافی ببمەوەو بیدوێنم، ئەترسم نەبادا، قۆپچەیەك
لە قۆپچەی چاکەتی ڕەصافی خەفیە بێو کە ڕۆیشتم
ڕاپۆرتم لێبداو بنووسێت: گوایە من بە چرپە
بەو گەورە شاعیرەم وتبێ: وا دیارە ئێستاکە غەمباریو
وەڕسیی.. هەر بۆیە دەمێکە بێ شیعریو نانووسیی!

من ئیستە ناوێرم وەك جاران ناوبەناو سەردانی
سەرقەبران بکەمو بچمە سەر مەزاری چیرۆکی کوژراوم.
ئەترسم نەبادا لە پەنا کێلێکدا ڕیشۆڵە جاسوسێ
گوێ بگرێو کە ڕۆیشتم ڕاپۆرتم لێبداو بنووسێت:
بە گوێی خۆم گوێم لێبوو، شایەتم، ئەم پیاوە
کە وتی: نەمردووی تۆ ماوی! چیرۆکی خوێناویی!

من ئیستە ناوێرم —نە بەخوا ناوێرم- ئەو وەختەی
بە تەنها خۆمو خۆم. پێکەوە دانیشتین کە (T.V)یم
کردەوە. تۆزێکم خواردەوە. دوو پیاوە زلەکە دەرکەوتن.
هەر ئێجگار ئەسپایی، ئەوەندە ئەسپایی، کە لووتم

نەیبیسێ. پێبکەنم‌و دوو بۆڵەم لێوەبێ، ئەترسم،
ئەترسم نەبادا، دانێکی کلۆرم گوێی لێمبێ‌و
بۆ سبەی ڕاپۆرتم لێبداو بنووسێت: گوایە من
وتوومە: هەمدیسان سیسارکە کەچەڵەو شەللاتی بەر
مەیدان هاتنەوە!!

ئێمە نەوەی سەردەمی کۆشکی کۆتایین
سەردەمی (نەء) سەربڕین‌و
سەردەمی (ئا) خەڵاتکردن.
ئێمە نەوەی سەردەمی کۆشکی کۆتایین
خوێن دەم‌و چاوی شتین‌و مێژووی کوێر دەستی گرتین‌و
بەڕێی گوێزاندا ڕۆیشتین‌و ترسمان پۆشی‌و
دووکەڵمان دا بە خۆماندا.
ئێمە نەوەی سەردەمی کۆشکی کۆتایین
لە قوتابخانەی چەقۆدا فێرە خوێندەواریی بووین‌و
لە پێخەفی خۆڵەمێش‌و چڵقاو نووستین.
ئێمە نەوەی سەردەمی کۆشکی کۆتایین
کە گەورەیش بووین
دڵداریمان لەگەڵ چەك‌و فیشەك‌و خەما کرد
سێدارەکان کردیانین بە ئەندازیارو
برینەکان کردیانین بە پزیشك‌و
تەلی کارەبای ناو کونەلووت‌و کونی دیکە

**کردیانین بە کارەبایی‌و**

**هەڵواسین‌و پانکەی بنمیچ**

**کردیانین بە وەرزشکاری ئەتروپاتیك.**

**ئەو بوتڵانەی تێیان بڕین**

**کردیانین بە عارەقخۆرو سەرخۆش‌و،**

**لە هۆش خۆچوون‌و ئاوی ساردو وڕێنە**

**کردیانین بە شاعیری سوریالی‌و هاوچەرخ!**

**لە دواییشدا ئەو پشیلە دڕو برسیکراوانەی**

**کە گەڵو گونی هەندێکمانیان خوارد**

**ئەوانیش کردیانین بە ئەندام**

**لە کۆمەڵەی بەزەیی هاتنەوە بە ئاژەڵاندا**

**ئێمە نەوەی سەردەمی کۆشکی کۆتایین.**

**"یەکێك لەو پۆستەرە شیعرانەی کە چەخماخەی**

**مێژووی حەللاج بە قوڵایی ژێرزەمینەکانی کۆشکی**

**کۆتایی‌و بە درێژایی دیجلە لە ئاسماندا هەڵیکەندووەو**

**نە ئەسڕدرێتەوەو نە پڕیش ئەکرێتەوە"**

**لەم کۆشکەدا**

**مێژووی حەللاج**

**مێژووی ئەتك**

**دوو مێژوو بوون**

**بەینیان خشتێ**

دیوارێ بوو.
پیاو هەبوو ئەبوو بە مشك.
پیاو هەبوو ئەبوو بە حەللاج
یەكەمیان وەك عزیز الحاج
دووەمیش وەكو عەسكەریی!

تۆ خاچی مار تێئالاوی
تۆ لە نێوان مارتی ئاشتیو مارتی شەڕدا
وەك گێنگڵی "كەركووك" وابووی.
تۆ لە نێوان گمەی كۆترو لوورەی گورگا
وەك "خانەقین" ئاسكێكی حەپەساو بووی.
تۆ خاچی مار تێئالاوی
تۆ لە نێوان مارتی بەغداو مارتی شاخدا
لە چوار خولی ئەم زەمینە سەرشێتەدا:
نەورۆزی تێكەڵ بە شەختەو
ئاردی تێكەڵ بە تی ئێن تیو
تەوقەی تێكەڵ بە خەنجەرو
ماچی تێكەڵ بە ژاڵكو
هەڵپەڕینی تێكەڵ بە كۆتەڵو كۆستو
ڕەشبەڵەكی گوڵو ژانبووی.
تۆ خاچی مار تێئالاوی
تۆ لە نێوان مارتی ئاشتیو مارتی شەڕدا

سەرت تاران ئەیفڕاندو ئەیکرد بە کورسیی شابانوو
باڵت بەغدا ئەیفڕاندو ئەیکرد بە جۆلانەی کۆشكو
لە ناوەندا تۆ گەمیەیەکی بابردووی ناو گەرداوو
لە ناوەندا تۆ جەستەیەکی پچڕاوو
هەناوێك بووی وەکو کالیارێکی گەنیو
زەردەزیرەی دزی شاخو شارەمێرووولە تێی دابووی.

دیسانەوە باوەشی بەرد والآیە بۆ عاشقانی چاوی چیاو
دڵخوازانی پرچی ڕەزو گەردنی هەرد.
جارێکی تر باوەشی کەسکی کێوانو
کۆشکی بلوورینی بەفرو ماڵی ئەشکەوت
لە پێشوازیی سەر ڕێگادا
گەڵاو، کلوو، گوڵە کێویلەیان هەموو
ڕاوەستاون بۆ پێشوازیی
ئەوانەی بۆ خۆشەویستیی گڵەسوورەکەی حەمرینو
ڕووباری ڕەشی کەرکووكو
بەژنی زیووینی خانەقین
هاتوون ببن بە چاو بۆ شەو
هاتوون ببن بە باڵ بۆ ئاو
هاتوون ببن بە دەم بۆ دار
هاتوون ببن بە دەست بۆ دەشت.

لەم تۆفانە گەورەیەدا

ئەو کەشتیانەی ئەنوون ئەمرن.
لەم ڕاپەڕینی خاکەدا
ئەو ڕێیانەی ئەنوون ئەمرن.
لەم بارانی قوڕقوشمەدا
بێلایەن هەر مردووەکانی گۆڕستانن.

لەم شۆڕشی جەنگەڵو دەربەندانەدا
سنەوبەری شیعرو چیرۆك
سەکۆی تاشەبەردی شانۆنامەو ئەکتەر
چرای وێنە، هاژەی مۆزیك
لەگەڵ سوارەتووکەی وشەدا ڕێ ئەکەن.
لەگەڵ ئەسپی بازیانی ڕەنگو دەنگدا کورژن ئەکەن.
لەگەڵ تاڤگەی بێخاڵدا هاژە ئەکەن.
قۆڵ لە قۆڵی کازیوەداو
لەگەڵ سیروان ئەکەونە ڕێ!

ئەم کۆچە تەنها هەر کۆچی پەڕەسێلکەی خەمێك نییە.
ئەم ڕەوەندانە ڕەوەندی ناو یەك هۆبەو یەك ئاسۆ نین.
ئەم دڵدارانە دڵداری یەك کانیی نین.
ئەم دەستانە تەنها دەستی جۆگەیەك نین.
ئەمە کۆچی نیشتمانە.. وەختێ کێوان ئەبن بە باڵ بۆ ئازادیی.
ئەمە سەفەری کێوانە.. وەختێ خوا ئەبێ بە کەشتیو مێژوو بە ئاو.

ئەمە سەفەری مێژووە
کە مانگ ئەبێ بە فڕۆکەو لووتکەیش بە چاو!

لە مارتا چرۆو زام پێکەوە ئەپشکوێن.
لە مارتا گەڵاو خەم پێکەوە ئەوەرێن.
لە مارتا دیاردەی دژ پێکەوە ئەژینو
پێکەوە ئەمرنو پێکەوەیش ئەڕسکێن.
وادەی کۆچ زەنگوولەی بەردینە.
لە ملی ئەم مانگە کەسکەدا.
هەر ڕۆژەو زرنگەی زەنگی ئەو
بۆ کۆچی گوڵێکی لێئەدا.
زەنگدارە فرمێسکی ئەم مانگە
وەك زەنگی گەردنی کارژۆلەی ڕاکردوو
زەنگدارە هەناسەی ئەم مانگە
چون زەنگی گەردنی ڕێژنەی داکردوو.
ئەمڕۆ زەنگ
بۆ کۆچی سووری مە لێدرا!
خێڵێ بووین لە وشەی ڕووناكو
بۆ کۆچی بەرەوژوور کەوتینە هەڵفڕین.
پۆلێ بووین لە مەلی قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگ
باڵێکمان چیرۆك بوو.. باڵێکمان شیعر بوو.
لە پێشدا لە دارتووی مەچەکی شەقامی کاوەوە هەڵفڕین.

هەتاکو یەکەمجار بگەینە
تەلاری چەناگەی مەولەوی‌و
بۆ یادی کۆچنامەی نووسەران
بۆ یادی ڕۆژێکی لێوانلێو لە ئەوین
بگەینە هێلانەی ئەو نوورەو
بە دەنووك لە گەڵاو لە پووشووی زیوینی
ناو ڕیشی هەڵگرین.
ئەو ڕۆژە "هەڵەبجە" لە پرسەی چۆڵ ئەچوو..
یان ئەتوت ئەسپێکی بەرەڵای بێ زین‌و بێ سوارەو
لە ڕەوی کۆستێکدا بە تەنیا جێماوە.
"بیارە" وەك مۆمی کافووریی خەڵوەتی مەولانە
ئەسووتێ‌و ژێرپیاڵەی بنیشی
پڕئەکا لە نمەی یاقووتی سۆفیانە!
تۆ ئیستە "تەوێڵە" مەنزڵی بارانتەو مەنزڵی شیعرتەو
تەوێڵە خاچەکەی سەرشانتە!

تەوێڵە: لە قۆچی کەڵێکی گیرخواردووی
نێوانی دوو گاشی شاخ ئەچێ
هەتاکو بڕەتێ شاخ توندتر ئەیگرێ
تەوێڵە قوڵینەی دەمتەنگی بەردینەو
ئاسمانی لەوێوە کە دەرکەوت
ئەوەندەی نانێکە!

تەوێڵە عەشقێکی هەڵاتووی زەردەشتە
عاسییەو ڕێی نییە نە ڕاکاو دەربچێ‌و
نە خۆیشی بۆ دواوە وەرگێڕێ.
تەوێڵە ناوقەدی پچڕاوی مەزدەیەو
کەوتۆتە نشێوی قوڵەوەو
تا ئەمڕۆیش بەردەوام
ئەو خوێنی بەهاری کوژراوی
هەر لێدێ!
چل ڕۆژە زایەڵەبارانە، چل شەوە گلێنەبارانە
چل ڕۆژە جەستەی خاك وا لەبەر
گۆپاڵە ڕەهێڵەی سزادا
چل ڕۆژە لە تۆڵەی ئەستێرەی سووتاودا
خۆر چاوی‌و خۆر دەستی لە دواوە بەستراوە.
وەك ئەڵێن: غەزەبی خواوەندی سزایەو غەزەبی
خواوەندی زستانەو، غەزەبی نەفرەتی تاریکی‌و
لە ملی ئاڵاوە. چل شەوە مانگ ونەو
هەن ئەڵێن: لای خوایەو گیراوە.
هەن ئەڵێن: وا نییەو بە سەفەر ڕۆیشتووەو
دێتەوەو ئەو ئیستە میوانی عەشقێکی دەریاچەی
خوێناوە. هەن ئەڵێن: ڕاستییەکەی، نەهێنیی
خوای بەفروبارانی بە شەوی سەرخۆشیی مانگەشەو
جاڕداوەو هەر بۆیەش بزرەو، سەرنگون کراوە.

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ ژانێکی قەڵادزێی گەشاوەیتو
تۆ ئیستاکە گوڵی دووکەڵی نیسانیو
لەبەر پێوە تا تەوقی سەر
بە ئاسۆسدا هەڵزناوی.

ئەمە نیوەڕۆی نیسانە؟!
یان نیوەڕۆی مەرگە کاتێ دووکەڵ سێبەر
ئەکات بۆ کۆست؟!
ئەمە گوڵاڵەی نیسانە؟!
یان دەستو پەنجەو دوولێوی منداڵانی قەڵادزێ؟!
ئەمە زانستگەی نیسانەو سلەیمانی؟!
یان کۆلیجەکانی خوێنو دەستی پەڕیوی نیوتنو
سەری بێ لەشی گالیلۆ؟!
ئەمە مێزەری خانییە؟! یان کڵاوێکی قوتابی؟!
ئەمە شیعرێکی نالییە پەڕیوەتە ئەم گوزەرە؟!
یان سەروریشی مەولەوی؟!
ئەمە هەنارو لاولاوە؟!
یاخود مەمکی حەبیبەیەو پرچەکانی عەنبەرخاتوون؟!
یان دەفتەرێکی قوتابی؟!
ئەی ئەمەیان هیوای چاوشینی گۆرانە؟!
کەوتۆتە بن ئەم بەردەوە؟!

**یاخود ئەستێرکێکی مردووە؟!**

**ئەی ئەم عەینەکە پەڕیوەی کەوتۆتە ئەم هەرێزەوەو**

**دوو دڵۆپ خوێن لەسەر شووشەی چاوەکانی ئەجریوێنن؟!**

**عەینەکەکەی ئەنیشتاینە؟!**

**یان عەینەکی کێوەڕەشە؟!**

**یان عەینەکەکەی شێخ نووری؟!**

**کێ ئەیزانێ؟! کەس نایزانێ**

**لە سێ کوچکەیەك بەولاوە کەس نایزانێ**

**جگە لە خواو لە بەغدادو لە کرملین.. کێ ئەیزانێ؟!**

**کەس نایزانێ!**

**لە سێ کوچکەیەك بەولاوە کێ ئەیزانێ؟!**

**جگە لە خواو لە صەدامو لە برجنیف.. کێ ئەیزانێ**

**جگە لە خواو لە صەدامو**

**جگە لە خواو**

**جگە لە**

**جگە؟**

**کەس نایزانێ؟! کێ ئەیزانێ؟!**

**سڵاو! برجنیف! سڵاو!**

**سڵاوی دووکەڵی نیسان**

**سڵاوی دووکەڵی سوورم**

**وەختێ لە جەستەم هەڵئەسێو**

**گەرماوگەرم**

له ئاسماندا به گه‌وره‌یی
وێنه‌ی سه‌ری بڕاوم‌و
ده‌ست‌و قاچی په‌ڕیوم‌و
به‌ژنی که‌رت که‌رتم ئه‌کێشیٚ!
سلاٚوی منداڵانی "دیٚ"
ئه‌و کاته‌ی له‌ناو کێڵگه‌داو له پۆله‌کانی خوێندندا
دوای ڕۆیشتنی میکه‌کانت.. گه‌رماوگه‌رم
خوێن قوردێله‌ی پرچ‌و قژو
خوێن پشتێنیان بۆ ئه‌به‌ستیٚ!
سلاٚو! برجنیف! سلاٚو!

سلاٚوی گوڵه‌کوێره‌کان.. کوێری دیاریت.. به سوپاسی گه‌لاٚیشه‌وه.
سلاٚوی داره‌شه‌له‌کان.. شه‌لی دیاریت.. به سوپاسی چڵیشه‌وه.
سلاٚوی ئاوه لاڵه‌کان.. لاڵی دیاریت.. به سوپاسی هه‌وایشه‌وه.

له دواییشدا بریجنیف له دواییشدا..
سلاٚوی گۆڕستانه‌کان، که له بازاڕی فڕۆکه‌و تۆپه‌کانتا
گه‌وره بوون‌و گه‌شه‌یان کرد.
سلاٚوی پرسه‌و ڕه‌نگی ڕه‌ش.. که له بازاڕی فیشه‌ك‌و چه‌که‌کانتا
زیادیان کردو قازانجیان کرد..
سلاٚوی تایبه‌تی مردن بریجنیف سلاٚوی تایبه‌تی مردن!
سلاٚوی گه‌رمتر له ناپاڵم‌و

گەرمتر لە کاتیۆشاو
گەرمتر لە ئاگری سۆخۆی
کە ئەم هەموو سەرو باڵو
سنگو ڕانو
ملەقۆرتانەی منت وا..
وا بە هەرزانو بە تاڵان پێ فرۆشت
وا بە هەرزانو بە تاڵان
وا بە هەرزان
وا بە
وا!

تۆ ئیستە خاچی ژێر دەواری
وەك بژوێن تۆ پڕیت لە شەونم
لە خۆزگەو تریقەو تۆ پڕیت لە ورشەی
یاقووتی هەڵاڵەو
لە پرژەی پلووسکی ڕووناکیو
تۆ ئیستە هەر ئەڵێی شەپۆلی کەروێشکەی
ئاڵتوونیی مێرگێکی ئێوارەی ئاوداری.
تۆ ئیستە ستوونی قەڵەمو ڕایەڵی ئارامو
ژێی وژەی شەوانەی نزاری.
تۆ ئیستە لە دەشتی کاغەزدا
دێراوی بۆ پەمووی نووسینی گوڵ سپیو

تۆ ئیستە گژوگیای ڕۆژانەی
تا ئەژنۆ سەرکەوتووی هۆنراوەو وتاری.
تۆ ئیستە —ئازادیی- هۆبەتەو
کانیاوی سەرەڕێی لە کۆچی گەرمێن‌و کوێستانی
دڵدارداو، باوەشی گوڵگوڵی هەواری.

تۆ وەکو بارانی، بەردەوام
سەوزەگیاو گوڵەباخ ئەنووسیی.
تۆ وەکو "زینوێ" بی، بەردەوام
پەپوولەو وەنەوشە ئەنووسیی.
تۆ وەکو "چۆمان" بی، بەردەوام
هەر خوڕەو هەر هاژە ئەنووسیی
تۆ سەکری سەکرانی‌و بە بەفر لەسەر یاڵ
لەسەر بەرد، لەسەر هەرد، قەسیدەی فێنك‌و
ژیننامەی ئەوینی هەڵەکۆك ئەنووسیی!

هەنووکە تۆ وشەت فیشەکەو
تۆ ڕستەت تفەنگ‌و
لە گەرووی زۆزکدا سروودی بەردیت‌و
ئەنووسیی. ئەنووسیی بۆ سەری بڵندی
پیاوانێ ئەنووسیی لەو خوارە
کە هەور زۆر نزم‌و نەوییە

بۆ بەرزی چریکەی پەیامو باڵایان.
ئەنووسیی بۆ خوێنی پیاوانێ ئەنووسیی لەو خوارە
کە بەهەشت زۆر کەمە ببێتە کەژاوەی پێشوازیی
بۆ ڕۆحی ساماڵو بۆ ژانی سووریانو
بۆ خۆری ئاڵایان.

تۆ ئیستە ئەوینت ئەوەندە بە داری عاشقو
ئاسکی دڵخوازو هێلانەی گۆرانیی‌و
ژمارەی فەرهادو خۆزگەی سەوز پڕ بووە
کانییەك نەماوە.. چاوێکتی تیا نەبێ.
ڕێگایەك نەماوە.. دەستێکتی تیا نەبێ.
ئەشکەوتێ نەماوە.. سەرێکتی تیا نەبێ.
لاشانێك نەماوە.. شانێکتی تیا نەبێ.
گوڵجارێك نەماوە.. ماچێکتی تیا نەبێ.

ئەوەتا دەشت تەسکە بە بەری ئەم خەڵکەو ئەم وەرزە
لێرەوار وەکو دۆڵ سیخناخەو هەناسەی توولەڕێ سواربووەو
کراسی تاشەبەرد خەریکە لە بەری چیادا هەڵتەقێ.
ئەنووسی‌و ئەنووسیی.. کە شەو دێت تۆ بنجی پرسیاری‌و
چون مێخی دەوارت بە گیانتا ڕۆئەچی
کە شەو دێت هەمدیسان لاولاوی پرسیاری‌و
بە بەژنی گومانو پەنجەرەی خەیاڵتا هەڵئەچی.

خۆت لە خۆت ئەپرسیی
ئەشپرسی و ئەشترسیی
دەستی کۆرش ڕێگایە بۆ گوڵی میدیا یان شیرە؟!
دەستی کۆرش ڕێگایە بۆ ئەوەی هاوارمی پیا بڕوا؟!
دەستی کۆرش دە پەنجەی قولاپە لە ئاوی جەستەمدا
یان چرا؟!
دەستی کۆرش.. ماسییەو پەلکەگیا؟!
یان قرشی زەریایەو
شوێن بۆنی خوێنی من کەوتووەو هەر دێو دێو
نزیکە بگاتە پەریمو پێکەوە بمانخوا؟!

لە کۆچی ساڵێکدا، چوار وەرزی مێژووت دا
بە کۆڵی پرسیاردا. پرسیارت کلیلی بزربووی
نێوانی گەڵاڵەو خانە بوو.
لە کۆچی ساڵێکدا سەری تۆ تۆپێکی شووشە بوو:
هەموو ڕۆژ شمشێرێ ئەیخستە سەر نووکیو
بۆ گەمەی شاژنێ بە دەوری کۆشکێکدا ئەیگێڕا،
شمشێری سیحرباز لە ناکاو تۆپەکەی هەڵئەدا،
تۆپ ئەچووە ئاسمانو ئەهاتە خوارەوەو ئەکەوتە
سەر نووکی شمشێرو نەئەشکا. سیحر بوو،
ئەمجارە تۆپ ئەبوو بە کەروێشك کەروێشکیش
ڕایئەکرد بۆ باوەش شاژنو شاژنیش

قریوەی لێئەدا!
بەم جۆرە سەری تۆ تۆپێکی شووشە بوو
تا ساڵێك لە نێوان هەڵدان‌و گرتنەوەی شمشێردا
هات‌و چوو..
تا ڕۆژێك لە مارتاو لە بەردەم پاشادا
تۆپ کەوتە خوارەوەو تۆپ شکاو تۆپ ورد بوو، بوو بە خۆڵ
خۆڵێشیان هەر بە خۆت، بە لەشی بێ سەرت، گسك دا.
شمشێریش پێکەنی‌و چووەوە کیفەکەی!

تۆ ئیستە بێ سەریت. لە نێوان گەڵاڵەو خانەدا بەهاری بێ سەریت
داربەڕووی بێ سەریت. بازێکی بێ سەریت. فڕینت کوێر بووە.
ئەسپێکی بێ سەریت. کورڕژنت وێڵ بووەو سمکۆڵان لە
خوێنتا ئەکەیت‌و بە چاوی برینت ئەبینی‌و بەو چاوە
ئەگریت‌و بەو چاوەیش تەرمی خۆت ئەبینیت.
تۆ ئیستە هەڵگوردی بێ سەریت.
دیرۆکی بێ سەریت. تۆ سەرت دوێنێ شەو بە جێبی
ئاریان هەڵات‌و مارەیی خوێنەکەی وەرگرتی‌و هەڵات‌و
لە بەفری سنووردا جێیهێشتی. تۆ سەری ڕاکردووت
پێی وتی: من ئیتر سەرت نیم. من سەری بێدەنگییم
من سەری پایانم. من ئیتر سەرت نیم. هەڕە تۆ ئازادیت
لە فەزای خوێنیندا چۆن بفڕی. هەڕە تۆ، تۆ ئیستە
سەربەستی‌و دڵنیای چۆن بمری!

ئەو ڕۆژانە من خاچێکی بێ سەر بوومو
بە چواردەوری خوێنی خۆمدا خولم ئەخوارد.
کەڵەشێرێکی شیعر بووم، سەرو پۆپنەی شیعرەکانم
تووڕدرا بووە سەر مەرزەکەو سەگگەلی ساواك
ئەیخواردم. لەملایشەوە منی بێ سەر هەڵئەبەزیم
دائەبەزیم. ئەشمردمو نەیشئەمردم. هەر
لەسەر مەرز من خوێنی خۆم بە با ئەدا.
با ئەیبردو بەلای ڕاستدا دیوارێکی ناو سابڵاخو
بە لای چەپدا دیوارێکی ناو هەولێری پێ سواغ ئەدا.
من خوێنی خۆم بە با ئەدا. با ئەیبردو بە لای
ڕاستدا چادرێكو بە لای چەپدا چادرێکی پێ هەڵئەدا.
چادرەکان کەوڵی خۆم بوون. کەوڵی خاك بوون.
کەوڵی بەهارو نەورۆز بوون. کەوڵی کەرکووكو سنە بوون.
ئەو ڕۆژانە هەرزانیی بوو. من چەکەکەم لەگەڵ
دەسما، هەرسێکیانم بە یەکەوە ئەدا بە
یەك نانو کەباب. کەس نەیئەکڕین.
ئەو ڕۆژانە هەرزانیی بوو، شاخ ئەفرۆشرا،
شاخی ڕەسەن بە بیست تمەن. زێ ئەفرۆشرا،
زێی کەحێلە بە دە دینار. ئەو ڕۆژانە
هەرزانیی بوو، دەیان کۆنە ڕەشەبای هێزو
بەتالیۆن، دەیان پیاوی دوو زەردێنەی
ئەملاو ئەولا، لە نەغەدەو سلێمانی،

لەسەر شۆستە دانرابوون. لەسەر شۆستە
ڕیز کرابوون، تۆڵەکە بوون بە خۆڕایی،
ئەو ڕۆژانە من وەکو خۆم هەرچیم ئەدی
هەر بێ سەر بوون. من ئەگەڕام بۆ یەکێكو
سەری هەبێ کەسم نەدی. هەندێ ویستیان
قوڕەسووری ئەو بەهارە بشێلنەوە،
سەر دروستکەن بۆ خۆیانو نوێ ببنەوە،
هاتنو چوون گەورەی بێ سەر ڕێی لێگرتن.
تۆ خاچێکی بێ سەر بوویتو شانشکاوو
مەچەك شکاو گەڕایتەوە بەردەم مشار.
تۆ بێشەیەك بوویت لە دەستو لە تفەنگو
ئەژنۆی شکاو. هەموو شەوێ وەکو هەرەم
لە بەردەمی دوو فیرعەونی جل سپیدا هەڵئەچنرای.
هەموو شەوێ لە TVدا مەرگێکی نوێی
خۆتت ئەدی. بەرانبەر سەلکی بڕدراوی
شاخەکانتو بەرانبەر سەلکی بڕدراوی
خەونەکانت دائەنیشتی. خۆتت ئەدی:
پەنجەیەکت چۆن دەستێکت ئەکا بە پەنگ.
خۆتت ئەدی: قاچێکت چۆن هەموو بەژنت
ئەکا بە پەنگ. خۆتت ئەدی ئەبووی
بە تارمایی عارو خۆتت ئەدی کە خۆت
ئەخۆی. خۆتت ئەدی لەمبەرەوە وەکو

مشکی ڕشانەوەیت. خۆتت ئەدی لەو
بەرەوە ڕاپۆرتێکی دارقەنارەییت. چیات
ئەدی پشتێنی خۆی لەملدایەو دیل کراوەو
هەردوو دەستی هەڵبڕیوە بۆ سەرەوە.
چیت نەئەدی! کێوت ئەدی بەو زلییە
ملپان ملپان هاتۆتەوەو لەناو مەیدانی
شارێکدا دانیشتووەو پێڵاوی دارخورمایەکی
خەڵکی عۆجە بۆیاخ ئەکا. داربەڕووی گەورەت
ئەبینی، ملپان ملپان. هاتۆتەوەو،
لە چیمەنی یانەیەکدا بە فیکەفیکی جرجێکی
خەڵکی "تکریت" سەما ئەکاو قنگ بائەدا،
چیت نەئەدی! تۆ خاچێکی بێ سەر بوویتو
بە دوو باڵی بێ پەڕەوە، لە گێژەڵووکەی
هەرەسدا ئەخولایتەوە. کۆستێك بوویتو
بینت ئەگرت. ئەبووی بە گریانی ئاوو
ئەبووی بە ژانی ئەم خاکە بێوەژنەو لەوسەر
لە مەرزی خانەوە هەتاکو "دووز" تەپاوتلی
مێژوویەکی سەربڕاو بوویت هەموو شەوێ
ئەتلایتەوەو ئەتلایتەوە!
تۆ ئیستە بەردەوام ئێوارەی سەرخۆشیو
لە بادەی نوشوستی ئەنۆشیی.
پێش کورسیو پێش پەرداخ تۆ لەسەر مێزەکەیت!

چی ئەکەیت؟! کە وەختێ شاخ لە جێی خۆیەوە
کەم ئەکاو کەم ئەکاو تا ئەبێ بە بزنێو ڕائەکا.
چی ئەکەیت؟! لوتکە خۆی بە پێی خۆی بچێتە
دۆڵەوەو سەری خۆی بە ڕەژوو داپۆشێ؟!
بەرەو دوا ئاو بڕواو
باهۆزیش سەری خۆی هەڵبگرێ؟!

ئەتەوێ تۆ چۆن بی؟!
بە پانیو درێژی هەزاران فرسەخی چوارگۆشەی بەردو دار
هەزاران فرسەخی ئێسقانی ڕۆژگارم
لاسکێ نەبینی بە بەرزی دوو ملیم
بڵێ من: ئەی عەشقی ڕاونراو، ئەوێرم
حەرفێکت حەشار بەم گەر هاتی؟!
ئەتەوێ تۆ چۆن بی؟!
کە فرمێسك قەدەغەی هاتوچۆی لەسەر بێو
بڕواتو بچێتە سەر ڕوومەت.. بکوژرێ!
کە ستران قەدەغەی هاتوچۆی لەسەر بێو
ڕێگاکەی درێژ بێو بە بوولێڵ بگاتە ناو قژی
یارەکەت.. بکوژرێ!
کە شیعرێ کۆتری نانەوای گەڕەك بێو کازیوە
هەڵبسێو لە دەرگای ماڵ دەرچوو.. بکوژرێ!
کە کۆترێ پۆستەچی هەتاوو سێبەر بێ.. ئێوارە

هەر تۆزێ درەنگ بوو، نەگەیشتە ماڵەوە، لە ڕێگە بکوژرێ!

ئەتەوێ تۆ چۆن بی؟!
تۆ بادەی نوشوستی ئەنۆشیو
بەردەوام خەمێکی سەرخۆشیی!
سەرخۆشبە! بۆئەوەی سەری خۆت لە شوورەی
مسینو ژەندرمەی ئەم عەقڵەو لە سنوور قوتارکەی!
سەرخۆشبە! بۆئەوەی سەری خۆت بدەیتە دەست
خەونو لە خەونا ئەتوانی چارۆگەی خەیاڵی بێ سنوور هەڵبدەی!
سەرخۆشبە! وەکو مانگ سەرخۆشبە ئەوکاتەی
بۆ مەرگی ئاسۆیەك.. ئێواران خوێناوی ئاوابوون ئەنۆشێ.
سەرخۆشبە! چون زەریا سەرخۆشبە ئەو کاتەی
بۆ مەرگی "مانگ"ێکی ئێواران خوێناوی ئاوابوون ئەنۆشێ!
سەرخۆشبە! وەك دووکەڵ سەرخۆشبە ئەوکاتەی
خوارو خێچ ئەڕواتو بۆ مەرگی باخێکی ئێواران
خوێناوی ئاوابوون ئەنۆشێ.

سەرخۆشبە! وەکو هەق سەرخۆشبە ئەوکاتەی
بۆ مەرگی وەجدێکی ئێوارەی مەولانەی، ئێواران
خوێناوی ئاوابوون ئەنۆشێ.
سەرخۆشبە! وەکو ئەرز سەرخۆشبە
ئەوکاتەی بۆ مەرگی وەرزێکی خول ئەخوا

**بە دەوری ئاگرداو خوێناوی ئاوابوون ئەنۆشێ.**

**کە ئەچیتە ناو قووڵاییو بن بادەوە.. سەیر ئەکەی**
**ئەم دنیایەو سیاسەتو ماسی بۆگەن وەکو یەکن.**
**کە ئەچیتە ناو قووڵاییو بن بادەوە.. سەیر ئەکەی**
**قاچاخخانەو قومارخانەو هۆڵی UN وەکو یەکن.**
**کە ئەچیتە ناو گەرداوەکەی مەیەوەو سەیری ئەکەی**
**کوردستانو کاولستانو دۆزەخستان وەکو یەکن**
**کە خۆت ئەدەی بە دەم لێشاوی بادەوەو سەیری ئەکەی**
**خۆتو گەمیەیەکی وێڵو مێژوویەکی سەر ئاوکەوتوو**
**وەکو یەکن.**

**تۆ چی ئەکەی؟**
**تۆ ئیستە نەفرەتی بەفرێکی ژێرکەوتووی**
**تۆ ئیستە لە کیفی شیرێکدا پاڵکەوتووی**
**کە سەری بڕاوتی لەلایە.**
**تۆ ئیستە لە ژووری پەتێکدا دانیشتووی**
**سێدارەی گۆرانیو شیعرتی لەلایە.**
**چی ئەکەی؟**
**شەوێکە سنەوبەر ڕائەکاو بە پێی خۆی**
**ئەچێتە تابووتی خۆیەوە!**
**شەوێکە ئەستێرە بە پێی خۆی ڕائەکاو**

ئەچێتە ناو تۆڕی خۆیەوە!

شەوێکە باپووسکە بە پێی خۆی ڕائەکاو
ئەچێتە زیندانی خۆیەوە!
شەوێکە ترووسکە بە پێی خۆی ڕائەکاو
ئەچێتە ناو گۆڕی خۆیەوە!

ئەی خاچی دووباڵی گریانو
ئەی خاچی بێ سەرو بێ شاخو
ئەی خاچی نیشتمان خۆڵەمێش.
تۆیش ئەبێ بە پێی خۆت ڕاکەیتو
بچیتە مەنفاکەی خۆتەوە!

ئەمە کۆچی ڕەشی یارەو ئەمە کۆچی
پووشو پەڵاشی مێژووەو
ئەمە کۆچی کاروانسەرای یادگارەو
کۆچی کۆچەو
هاوینەو خێڵ بەرەوخوارە!
وا ئیستەیش لە شێوەی سەرابو دووکەڵی پەرتپەرتا
بەرەوخوار، مەراقی پێشەنگت لاوازو قژبژن. شپرزە،
تێکەڵە لە ڕەنگی پەڕیوی بەرزەردی مەولانەو
لە مۆردی وەریوی ڕیشەکەی ئەزمڕو

**لە پێڵووڕێزانی سەفەری ئەم وەرزە.**

**بە تەنیا تۆ ئەڕۆی هەر خۆتو جانتایەك بەرەوخوار.**

**کەچی تۆ چاوانت پڕن لە: دێهاتی فرمێسكو**

**لە نالیو لە حاجیو**

**جانتاکەت پڕە لە: دەربەندی زریکە.**

**بە تەنیا تۆ ئەڕۆی هەر خۆتو جانتایەك بەرەوخوار.**

**کەچی تۆ ناو گەرووت پڕە لە بارانی کوژراوو**

**لە بەردی گریاوو، جانتاکەت پڕپڕە**

**لە وردە دڵۆپی خنکاوی باڕێزە.**

**بە تەنیا تۆ ئەڕۆی هەر خۆتو جانتایەك بەرەوخوار**

**بەڵام تۆ گیرفانی سەردڵت کەرکووکی تێدایەو**

**باخەڵت پڕە لە دەریاچەو دارگوێزو دار چوالەو**

**جانتاکەت پڕە لە گردۆڵکەو لە وەردو**

**دوا شیعری ناو سەریش جمەی دێ:**

**لە قاسپەی کۆچکردووی دوانامەی نێوانی شارو شاخ.**

**جمەی دێ لە باڕەی کارژۆڵەی ناو زیلی دابڕاو**

**لە دایکیو، جمەی دێ لە زڕەی بازنی**

**شکاوی دەستی باخ!**

**جمەی دێ لە کاڵێو جمەی دێ لە بڵباس.**

**جمەی دێ لە ڕیشی مام وەیسی پڕ لە تف**

**جمەی دێ لە نووزەو کڕووزەی تەشیەکەی خاوەرو**

**جمەی دێ لە قیژەی گوڵەکەی کاکەلاس.**

دوا شیعرەو جمەی دێ..
جمەی دێو جمەی دێو جمەی دێ:
لە وردە ئاوێنەی شکاوی سامالّمو
لە هاڕەی وردوخاش بوونی ڕەنگ
لە هاڕەی وردوخاش بوونی دەنگ:
جمەی دێ لە بۆڕەی گابەردی، کوژراو بە: تی ئێن تی.
جمەی دێ لە نالّەی لاپالّی لاق پەڕیو
جمەی دێ لە زیکەی لاسکو لە جووکەی بنچکو
جمەی دێو جمەی دێو جمەی دێ
لە مەرگی ڕەنگاوڕەنگ.

ئیستاکە تۆ بۆیە هێند وردی
ئەشکەنجە بێژنگی زامت بوو.
ئیستاکە تۆ بۆیە هێند تەڕی
گریان خۆی مالّت بوو.
ئیستاکە تۆ بۆیە ئەوەندە خول ئەخۆی
گێژەن خۆی بالّت بوو.
ئیستاکە تۆ بۆیە ئەوەندە سەرخۆشی
بادە خۆی یارت بوو.
ئیستاکەیش تۆ بۆیە ئەوەندە عاشقی فوراتی
چونکە تۆیش سیروان بووی سەردەمێو
لە هەمان سەرچاوەی

عەشقەوە ئەهاتی!

ئەم غەمگینە! فوراتە یان چارەنووسی لێڵی دایکم
سەربەرەوخوار ئەبێتەوە؟! یاخود مێژوومەو ڕاوئەنرێ؟!
ئەم خەمبارە! فوراتە یان شاخە شیعری مەراقێکەو
تواوەتەوە؟! یان لاوکەو شل بۆتەوە؟!
یان باڵاگریانی خوایەو بە ناو گیانی مندا ئەڕوا؟!
ئەم ئاوە ئەرخەوانییە، هی جەستەی خۆڵەسوورەکەی لای مەرعەشە
ئەو وەختەی باران باوەشی پیائەکاتو توند ئەیگوشێ؟!
یان سترانی دارگێلاسە ئەو وەختەی ئەبێ
بە عەشقی ئاڵی وەرزو خاك ئەینۆشێ؟
ئەم ڕۆیشتنە بە پەلەیە هی فوراتە؟! هی شەپۆلە؟!
یان ئەمە غاردانی ڕەوەجوانووی ژانەو
لۆقەی قوڕو لیتەی کۆستەو بازدانی ناسۆری
لەو سنگ کوتانی هەڵپژانە؟
ئەم سامدارە پێچاوپێچە! ڕووبارەو ناوی فوراتە؟!
یان مارەکەی لە خاچ ئالاوی جەستەمەو ڕێی نەهاتە؟!
تۆ فوراتی! تۆ ئاوێزانی مەراقیو
لە نەوەی ڕێگەی نەهاتی!
ئەوەتەی هەی تۆ سۆراخی گەورەی ئاوی
تۆ بەردەوام ئەو پرسیارەی
ئەڕژێیتە گوێی بوونەوە

تۆ خۆت شوێنیو تۆ خۆت کاتی.
تۆ فوراتی.. تۆ منی وەختێ ئەهەژێی
لە لێڵبوونتا، تووڕەبوونم، پەستیم،
ڕقم ئەنووسیتو لە ئارامتا: خاوبوونەوەم
ڕوون بوونەوەم ناو لێئەنێی!
تۆ منی وەختێ کۆچ ئەکەی.
منیش تۆم وەختێ کۆچ ئەکەم.
کە پێکئەگەین لە یەکتردا ئەتوێینەوە
هەردووکمان هەر تینوێتینو
یەك یەکتری ئەخۆینەوە!
ئەی دەستی هەمیشە تەڕم.. بە هەوری کۆچ..
ئەی قژی هەمیشە تەڕم.. بە دڵۆپی ئاوارەیی.
ئەی وشەی هەمیشە تەڕم.. بە شەونمی بێهوودەیی.
من لە کەنار نزیکترم بە تۆ.. تۆیش لە شیعر نزیکتری بە من.
من لە بەهاری وەریندا هاتووم بۆ لات. من بە نیازم
شەپۆل شەپۆل بتنووسمەوە. من بە نیازم
چەندین عەشقی لەناو قوڕدا خنکاوی تۆ، چەندین
تەرمی پێکەنینو جوانەمەرگی ناو دەنگی تۆ. بدۆزمەوە!
من لە بەهاری وەریندا هاتووم بۆ لات.
من لە کەنار نزیکترم بە تۆ.. تۆیش لە شیعر نزیکتری بە من.
ئەی هاوڕێ! ئێستە ماندووم.. تازە هاتووم
ئەی هاوڕێ! تۆ فرمێسکێکی درێژو

شیعر هاژەو
منیش وشەو
لە نێوانی هەردووکتاندا وا بە نیازم تۆزێ بنووم!

ئەخەوی‌و ئەو خەوە ماندووەت بەستێنەو
وەك شەپۆل ناوبەناو لێی بدات. تەڕ ئەبی.
ئەخەوی‌و شمشاڵی ئاوی شەو "جیکۆر" و گۆرانیی
دوا باران پێکەوە ئەژەنێ.
ئەخەوی‌و لانکەی ئاو وەك تاسەی هەڵچوون‌و داچوونی
فورات خۆی.. ئەتبات‌و ئەتهێنێ.

ئەخەوی‌و لە خەوتا تۆ هێشتا هەر لەولای
هەر "زینوێ" چراتە
تۆ هێشتا هەر لەوێی. پلووسکی بەفراوی کاوانی‌و
هەتاوی کەنەفت دێ‌و دەم ئەنێ بە چۆڕەی ملتەوەو
ئازادیی باڵاتە.
لە خەوتا تۆ هێشتا هەر لەناو بریسکەی بەفردای
بە زیوی مانگەشەو ئەنووسی‌و
باوەشت پڕ ئەکەی لە وردە ئاوێنەی تریفەو
دواتریش لە بەردەم دۆڵێکی تاریکدا ڕۆی ئەکەی!
هەر لەوێی. ئەو ڕۆژە ئەبینی. ئەو ڕۆژە دێتەوە،
تیا مردیت. ئەو ڕۆژە دێتەوە. ئەو ڕۆژە ئەبینی
گالیسکەی دزانی: سەرومل، دزانی چاوو گوێی،

فرۆشگای ناو پێنجوین
گالیسکەی مەرگی خۆت:
لە داری تابووتو لە تەختەی پرسەتو
لە خاچی جەستەت بوو.
ئەو ڕۆژە ئەبینی ئەو ڕۆژە دێتەوە تیا مردیت.
ئەو کاتەی کە مەمکی ئازادی ئەفرۆشرا بە دوو توور
لە خەوتا تۆ هێشتا هەر ماوی‌و
هەر پڕی لە خۆزگە.
لە خەوتا تۆ هێشتا هەر هیوای
هەر پڕی لە جۆگە.
گەواڵەی ئەم خەوە کابینەی هەورێکە هەر ئەڕواو
لە ناویا تۆ نووستوویت
ئەو کاتەی هەڵئەسی ئەزانی: نەماویت
ئەزانی تۆ مردوویت!
کاتێکە کە عوجاج ئەبارێ‌و
کە لقی دارخورماو کە قوللەی مەخفەرێ‌و
پۆلیسی بیابان ئەپرسن
لە کوێوە تۆ هاتوویت؟!
فورات نەبێ من لم ئەمخوات.
فورات نەبێ نامۆیی چۆن داڵدەم ئەدات.
فورات نەبێ تەنیایی چۆن ئاوی شیعرو
خەمم ئەدات؟!

فورات نەبێ ئەم مەراقە شۆخو شەنگە
ئەم کچی پاشای فرمێسکە
لە کوێوە حەز لە من ئەکات؟!
فورات نەبوایە چۆن ماسیی، ئەهاتنە ناو
سەرچناری مەنفامەوە؟!
فورات نەبوایە دارخورما کوا ئەمناسیٚو
قەتێی سەحرا چۆن ئەهاتە مێرگەپانی
نیگامەوە؟!
فورات نەبوایە گۆیژە کوا مەلەوانەو
خاكو خۆڵم لە تەشتێ ئاودا ئەخنکا!
فورات نەبوایە هەموو ڕۆژ چۆن ئەمتوانی
نەورەسی عەشقی کۆچکردووی چاوی وانم ببینمو
ئەویش هەموو ئێوارەیەك لەناو سنگما
شەقژن بکا!

هاوڕێیان!
فورات نەبێ چاوی ئازارم کوێر ئەبێ
کە ئەو چاوەیش نابینا بوو
ئیتر شیعرم چۆن ئەتوانێ لەم دوورەوە
یەکە یەکە گوڵی ژانو ڕەنگی کۆستو
جووڵەی خەمتان بەدیی بکات! هاوڕێیان!

"بەغدادی" ئەشکەنجەی قوڕاویی فوراتە. مەرکانەی

بەختێکی لیخنەو بەغدادی وەرزی ساڵ لە ناویا
زەردوویی هەژاریی گرتووە. بەغدادی ئاوێکی مل
کورتەو دەمی ئەو ناگاتە ئەم عەردە ڕەنگ زەردە،
گەر (ناعوور) نەیخاتە سەرشانی. بەغدادی
کوختێکی سەرەڕێی نێوانی سەرەتاو کۆتایی کۆچێکە.
بێژنگی سەفەرەو دڵۆپی هاتوچۆی مانەوەی
قەت پێوە بەنگ نابێ. ئەو وەختەی تەماشا
ئەیگاتێ ئەو وەختەیش جێی دێڵێ. بەغدادی
شاعیری ماسییەو نووسەری دارخورماو بەلەمی
تەنیایی‌و نانێکی برسییە: بەغدادی.
من لێرە لە ڕستەی قرتاوو
لە مەلی یەك باڵو
لە ئەڵقەی عاسیبووی ناو پەنجەو
لە شەوی بەختێکی وێڵ ئەچم.

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ ئیستاکە لی کەناری قەسیدەیت.
ئاوی شلوێی ناو خەویتو
سەحرای یادو و
تەپوتۆزی شپرزەییو
هەڵچوونو داچوونی چۆمی
ناو گومانی

تۆ ئیستاکە سەراب ئەکەیتە بەر خۆتو
نائومێدیی ئاودامانی!

ئا ئیستە زەمانی ترسێکی قۆچدارە، زەمانێ
شمشێرو سێدارەی تیا ئەڕوێ، زەمانی ترسێکی
خمخۆرکو مردنی چڕوپڕ. بەم بێشەی چیمەنتۆو
ئاسنەدا هیچ تیشکێ ناتوانێ، ئەستووریی
زەبروزەنگ ببڕێتو بێتە ژوور. زەمانی نەهەنگەو
قوتدانی شاخو داخ، قووتدانی شارو دێ، زەمانی
هاتنەوەی "دەیناصۆر". تۆ ئیستە ناوبەناو،
ئازارت وەك جانتا هەڵئەگریو ئەڕۆیتو سەر
ئەدەیت لە دیجلە. ئەچیتە پایتەختی
ترسەوە. هەنووکە، دیجلە وەك پشیلەی دەستەمۆ
ماڵییەو لاملی هەڵئەسوێ لە ملی دەیناصۆر،
بێ فزە، کڕە چون، شەقامی بەزیوو، بێدەنگە
بێدەنگە وەك تەرمی زۆر حیزب. ئەچیتە
پایتەختی ترسەوە: ئەبینی: ئەم شارە گەورەیە،
کۆیلەی خەساوەو، ئەسپێکی مل پەڕیو.
ناو بە ناو ئەچیتە مەیخانەی ناوسەری بەغداوە
هاودەمی مەرگی خۆت ئەبینی. هاودەمی ئەم کۆچەت
ئەبینی. هاوڕێی برینو قەسیدەت ئەبینیو
پێکەوە: سەرخۆشیی وەك شووشەی بەتاڵو

ڕۆژنامەی دڕاوی سەر دیجلە ئەتانبا. ئەتانبا
بۆ دوورگەی بێهوودەی دابڕاو لە دنیا، دابڕاو لە
زەمان، دابڕاو لە جێگا، دابڕاو لە مانا، پێکەوە
ئەچنە ناو جیهانێ: کە نەوەی کەس نییەو
بێ نەژاد. بێ ڕەنگەو بێ ڕەگەو بێ سەرەو،
پاشاکەی (سیزیف)ەو بەردەکەی پەیامەو
بۆشایی ئاواتەو سەرەنجام هیچەو هیچ!
سەرخۆشیی ئەتانباو ئەتانبا. بۆ دوورگەی
بێهوودەی دابڕاو لە دنیا. تف ئەکەن لە بوونو
لە زەویو لە ئاسمان، تف ئەکەن لە مێژوو، لە
خۆتان، تف ئەکەن لە شیعری عاقڵو بە پێوە
ئەچنە سەر سنووری قافییەو میز ئەکەن بە شەوی
خەیاڵی ڕۆمانسیو بە شەپقەی ئاغری پەخشانو
بووز ئەکەن بە وشەی ئارامو مەنگەوەو
یاخیبوون ئەکەنە ناونیشان!

تۆ ئیستە لە وەرزی سێدارەی وڵاتدای.
هەموو ڕۆژ ملێکو دوو ملو سێ ملت، پرشنگن
ئەوەرێن. هەموو ڕۆژ سەرێکو دوو سەرو
سێ سەرت ئەستێرەن ئەکشێن. تۆ ئیستە
لە وەرزی سێدارەی وڵاتدای. ئەم وەرزە
بە پیتەی مەرگی تۆ، هەزاران گەردنی

گەشاوەی گرتووە. ئەم هێشووی سەرانە
وەك بۆڵی گەییوی دارمێوێ توورەكەی
ڕەش ڕەشیان لە سەریان بەستووە. پەل‌و
پۆی سێدارە بڵاوە. پەتی دەس سێدارە،
درێژەو ئەگاتە گشت ماڵێ. گشت كونجێ.
ئاهەنگی سێدارە لە موسڵ‌و لە بەغدا تایبەتە
بەوانەی كە زاوای ئازادیین، ئەو وەختە
ژن دێنن، ئەو وەختە شووئەكەن كە ئەبنە
قوربانیی. ئاهەنگی سێدارە، بەردەوام مل ئەكا
بە شمشاڵ. بەردەوام كەڕەنا بە سەری
بڕڕاوت ئەژەنێ‌و فووی كۆچی كۆتایی پیائەكا.
تۆ ئیستا لە وەرزی سێدارەی وڵاتدای، ئەم
وەرزە بە پیتە بەرهەمی گوڵ هێرۆی گەردنت
ئەژمێرێ‌و ئەیانكا بە پەتی یادەوە. تۆ ئیستە
لە خشتی گەردنت دیوارێ هەستاوە، ئەوەندەی
دیواری دەرەوەی كۆشكەكەی كۆتایی بڵندە. تۆ
ئیستە لە وەرزی سێدارەی وڵاتدای. تۆ
بەژنی ناو هەوای بە پێوە لەسەر "با"
وەستاوی. تۆ ئیستا نیشانەی سەرومل سوڕمانی
ئاسمانی. نیشانەی فرمێسكی نیشانەی پرسیاری لە چاوی
یەزدانداو تۆ ئیستا ڕۆژانە گۆرانی‌و سروودی
خنكاوی. تۆ ئیستە ئەشكەنجەت لە عیسا

فوولێترە. تۆ ئیستا خاچێکی کە ئەفڕێ
بۆ ئاسمان بە باڵی سووتاوو بە لاقی قرتاوو
بە پەتی ملەوە ئەچیتە بەردەم خوا!

لێرەوە تۆ قاقای قەنارە ئەبیسی ئەو وەختەی
کە "سیانیان" یەکەمجار مردنیان بەرەو خوار
هەڵبڕی. لێرەوە تۆ قاقای قەنارە ئەبیسی
ئەودەمەی یەکەمجار لە بەردەم سێ کێوی
مرۆڤدا ترس‌و لەرز هەڵلەرزی. لێرەوە تۆ
قاقای قەنارە ئەبیسی ئەو دەمەی یەکەم
جار ئەڵقەی پەت: گاڵتەی کرد بە مەرگ‌و
بە جەللاد پێکەنیی. لێرەوە تۆ قاقای قەنارە
ئەبیسی ئەو کاتەیش تۆ بە تیشك
بە خامەی شەفەق‌و بە چوکڵەی ئەستێرەو
بە پەنجەی ڕێژنە بەربەیان ئەنووسیی.
لێرەوە تۆ شیعری زانەوەی بەردی نوێ‌و
زانەوەی قەندیل‌و شاخ‌و داخ ئەبیسی.
لێرەوە گوێت لێیە: سەرلەنوێ کە نالیی
هۆرەی دێ‌و لێرەوە گوێت لێیە: چی
ئەڵێ: مزگێنیی کاوانی مەولەوی.

ئەمە هەستانەوەی بەردی گۆڕە؟!

یان باڵگرتنەوەی خۆڵەمێش؟!
ئەمە لە دایكبوونەوەی نوێی سیروانە؟!
یان سەرلەنوێ شین بوونەوەی
مێرگەكانی دەستو پەنجە؟!
ئەمە گەڕانەوەی مەحاڵی دووكەڵە
ببێتەوە بە مەزراو باخ؟!
یان هەر وزەی خوا خۆیەتیو
ئەمجارەیان دابەزیوەو بووە بە شاخ؟!
ئەمە خەونی بزڕكاوی خاچەكەمە؟!
وڕێنەیەكی شیعرە ئەو وەختەی
كە لەرزوتای ترس ئەیگرێ؟!
یان زرنگدانەوەی گوێچكەی
ژوورەكەمە، ئەو كاتانەی نائومێدیی
زرنگەی دێو ئەبێ بە هەزار وردە ئاخ؟!
ئەمە هەڵسانەوەو یەكگرتنەوەی
پارچەپارچەی جەستەی ئەسپە كوژراوەكەی منە؟!
یان هاتنەوەی سەری خۆمە بۆ لای لەشمو
جارێكی تر ڕاستبوونەوەی
پشتی قەمووری مێژوومە؟!
خەو نییە. وا ئیستە ئەبینی: چۆن پۆلێ فەرهادی
كێوی نوێ. لە عەشقی شین باوی شیریندا ئەفڕنو
بە دەنووك لە بێستوون سەختتر كون ئەكەن.

خەو نییە. وا ئیستە ئەبینی: کە بەفر ئاگرو،
گۆرانیی برینو ئازادیی، قوربانیی لە باوەش گرتووە.
خەو نییە. وا ئیستە ئەبینی: دارخورما لەسەری
نەهەنگدا ڕوواوەو جۆگەیەك لە ئاوی سەرچاوەی
گیراوم بەربووە.

بەژنی خوێن بەرزترە یان بەژنی شیعر؟!
دەنگی خوێن گەرمترە یان دەنگی شیعر؟!
کێ گەورەیە؟! ئەوەی مەرگی خۆی ئەخاتە
جامانەوەو گرێی ئەداو ئەیداتە دەست
گوڵو بەفر؟! یاخود ئەوەی شیعر ئەنووسێو
وەکو دیاریی چەپك چەپك ئەیداتە دەست
گوڵو بەفر؟!
گەر ناوێری جەستەت بکەی بە ئاسکێو
سەربیبڕی بۆ قوربانیی.. خۆ ئەتوانی
شیعرت بکەی بە قوربانیی!
گەر ناتوانی خوێنت بدەی بە عەشقێکی
تینووی ئەمرۆ.. خۆ ئەتوانی
هۆنراوەت بکەی بە کانیی.
گەر ناوێری سەرکەویتە سەر سێدارەو
یەخەی مردن ڕاوەشێنی. خۆ ئەتوانی
شیعرت بکەی بە پێپلیکە بۆ بەیانیی.

گەر ئەترسیی تۆ بڕۆیتو بەفرو کرێوەی سەر قەندیل
ڕۆژێ ڕەقت بکاتەوە.. خۆ ئەتوانی
هەر لێرەوە شیعرت بکەی بە چیاو شاخی گۆرانیی.
لەم وەرزەدا تۆ چی ئەکەی؟!
کە شەڕ شەڕی دەستەویەخەی.. عەشقو تەورە.
کە شەڕ شەڕی دەستەویەخەی.. خاچەکەتو یەهودایە.
کە شەڕ شەڕی دەستەویەخەی.. شمشێرو بەردی چیایە.
من وەکو گوڵێکی کێویلە ئەچمە پاڵ ڕەوەزو
شیعری خۆم ئەنێرمە ئەو کەژەو
لایەنی بەرد ئەگرم!
من وەکو ڕێحانە ئەچمە لای ئەو وەردەو
شیعری خۆم ئەنێرمە ئەو دەشتەو
لایەنی ئاو ئەگرم!
من وەکو باڵندە ئەچمە لای ئەو کەلەو
شیعری خۆم ئەنێرمە ئاسمانو
لایەنی ئاسۆگەو
فڕینی بەرز ئەگرم.
تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ ئیستاکە بە نەهێنی زەردەخەنەی
گوڵەکانی ناو ئەشکەوتیو
بە نەهێنی ماچ ئەنێری بۆ قەندیلو
بە نەهێنی نامەی دەربەند وەرئەگریتو

به نەهێنی چرپەی داریو
به نەهێنی ئەباریتو
به نەهێنی گڤەت دێتو
تۆ ئیستاکە لە سەرەوە: دەفتەرە دەشتی خامۆشیو
قەڵەمێکی سەرکزیتو
لە ژێرەوەیش کارێزیتو جۆگەی شیعریو
هاژەی نامەو نەهێنیی خوڕەی سێڵاوی!

لە شاری ترسو بیمەوە. لەناو خودەی ئاسنینو
بەناو گەمارۆی دڕکەزیو لەناو چاوی شمشێرەوە
بە مابێنی دەمە تێغی ڕیزکراوو، بە مابێنی پاردەکانی
سێدارەدا، لە بێشەڵانی نێزەوە، بەناو دارستانی
گڕدا. خۆشەویستیی وشەی شەیدا، خۆشەویستیی
شیعرو چیرۆك. ئەبن بە بای وەشتو باڵدار
ئەبن بە نامەی شەقامو لە بوولێڵدا ئەبن بە
قومقمۆکەی لە خاك چوو، لە وێڵەدەرو گۆیژەوە
ئەپەڕنەوەو ئەگەنە ناو خێڵی دڵدار.
لەم وەرزە سوورەدا
کە شیعر تێکەڵی گڵ ئەبێ.. هێند نابا ڕووەکێ ئەڕسکێ
ئاڵ ئاڵە.. نە دەنکە هەنارەو، نە گوڵی ژاڵەیەو
نە گێلاس
ئەم بنجە تازەیە ئەو وەختەی بەر ئەگرێ

بەرەکەی تێکەڵە لە چێژی ئازارو

لە چێژی ئەوین‌و

بە شێوەیش هەر لە دڵ خۆی ئەچێ!

لەم وەرزە سوورەدا

کە چیرۆك تێکەڵی خاك ئەبێ.. هێند نابا ڕووەکێ ئەڕسکێ

شین شینە نە گوڵە وەنەوشەو

نە گوڵە مێلاقەی شین باوەو

ئەم بنجە تازەیە.. چێژەکەی تێکەڵە

لە چێژی مەراق‌و

لە چێژی فرمێسك‌و

بە شێوەیش هەر لە چاو خۆی ئەچێ!.

لەم وەرزە سوورەدا

کە سروود تێکەڵی بەرد ئەبێ هێند نابا ڕووەکێ ئەڕسکێ

مۆر مۆرە

نە گەڵای ڕێحانەو نە مۆردەو

نە گوڵە هێرۆیەو بەرەکەی تێکەڵە

لە چێژی زیندان‌و

لە چێژی هاوارو

بە شێوەیش هەر لە —دەم- خۆی ئەچێ!.

تۆ شیعرت نەکرد بە تەیری

ناو قەفەزی زمانێکی کلۆم کراو لەسەر ئاسمان

تۆ باڵی فڕینت نەبڕی
تۆ دەنووکت نەقرتان‌و
تۆ مردارت نەکردەوە.. وەکو کردیان.
تۆ شیعر ناکەی
بە هێلکەی پیسی زمان..
تۆ شیعر ناکەی بە لاکی مانای تۆپیو
بۆنی بۆگەنکردووی ڕستە بەرنادەیتە
ناو ڕۆژنامەو ناو گۆڤارو لووتی هۆڵ‌و
لووتی دیوان!

تۆ شیعرت بووە بە تەتەر وڵاتی ئەوین تەی ئەکا
بەیانیان زوو دیاریی کازیوە وەرئەگرێ‌و
ئێوارانیش پۆستی خۆرنشین لۆك ئەکات.
تۆ شیعرت بووە بە تەتەر وڵاتی ئەوین ئەگەڕێ
لە کوێستانێ هەور ئەخاتە ناو زەرفی سامالەوەو
بۆ دەشتێکی گەرمەسێری دووری ئەبات.
نامەی ئەم لوتکە ئەداتە دەس ئەو لوتکەو
هەموو ڕۆژێ بارانەماچ دابەش ئەکات.
تۆ شیعرت چۆتە ناو دڵی ئەم خاکەوە
بۆیە وەختێ گەنم ئەڕوێ‌و باڵائەکا
لە گوڵێکدا دەنکێ وشەی تۆی هەر تیایە.
تۆ شیعرت چۆتە ناو خوێنی ئەم خاکەوە
بۆیە ئەو وەختەی کارێزێ ئەتەقێت‌و

ئاو سەرئەکا..
لە جامێکدا قومێ شیعری تۆی هەر تیایە!
بۆ ئەم وەرزە. شیعرت کردووە بە هەگبەی کۆڵەپشتو
بە وردە نان. شیعرت کردووە بە ئاوی ناو مەتارەو،
بە دەنکە نوقڵی ناو گیرفان. بۆ ئەم وەرزە شیعرت
کردووە بە گونیەی پەردەی دەرگاو بە لەتە ئاوێنەی
ڕیشتاشینو بە قەڵەمبڕو بە پیلو بە لایتی
دەستی شەوان. بۆ ئەم وەرزە شیعرت کردووە بە
کلاو، بە کلێتەی گولونکەدار. بە گۆرەوی پووزەوانەو
بە قەمسەڵەو بە بەفرماڵو بە کەپری هاوینانو
بە ڕادیۆیەکی بچووکی ئاریەل شکاو. بۆ ئەم وەرزە
شیعرت کردووە بە زۆپای سوورەوەبووی زستانانی
مزگەوتی دێو شیعرت کردووە بە هەڵمی جلی تەڕی
بەر نێڵەنێڵی ئاگرو شیعرت کردووە بە ئاگردان.
بۆ ئەم وەرزە تۆ شیعری خوێناویت هەیە. وەکو
گژوگیای خوێناویی ناو تابووتو وەکو بەتانیو
جامانەو وێنەی ژنو منداڵی خوێناویی بەرباخەڵو
وەکو کۆنکریتی خوێناویی ژووری زیندان.
بۆ ئەم وەرزە وشەت سادەیە وەکو گیا
وشەت ساکارە وەکو نان.
وشەت بێ فیزە وەکو خۆڵ.
وشەت خوێنگەرمە وەك ترێ ڕەشکەو

ئێسك سووكە وەك دار چوالەو
دەنكەهەنار.

وشەت هونەرمەندیشە بە وێنەی
ئەندازیاری خانۆكانی جاڵجاڵۆكەو
جێی سەرسوڕمانەو تێڕامان:
وەك پوولەكەی پشتی ماسیو
وەك هەڵگەڕانی لاولاوو
كاژی مارو و
بەردی یەك لە سەر یەكی ڕەوەزو
تابلۆكانی خۆرنشینو
قۆزاخەی كرمی ئاوریشمو بەفری نووستووی
بەر مانگەشەوی حەپەساو!
ئەی خاچی شپرزەی خاكنشین!
وەختێتی كە مانگی گێنگڵت ئەم كاژی شەقامی ترسانە
فڕێدات. وەختێتی ئەم ماری مەراقە كاژێكی تازەتر.
تازەتر وەك چۆغەی خوێنی بەر تاشەبەرد بپۆشێو
لەبەركات. وەختێتیی تۆ ئیتر شوێن جێ پێی خەونی
خۆت، شوێن جێ پێی شیعری خۆت بكەویت. تۆ
شیعر سێبەری گەرووتەو دولبەرتەو هاوسەرتە. لە كوێ
بێ، تۆیش ئەبێ لەوێ بی. وەختێتیی بچیتە لای كەژێ
كە داری شیعری تۆی دەمێكە كردووە بە شمشاڵ،

وەختێتیی بچیتە قەدپاڵێ کە بەڕووی شیعری تۆی دەمێکە
کردووە بە سەنگەر. وەختێتیی بچیتە لای دەشتێ،
کە پەڕەی مێرگی خۆی بۆ دەنگت دەمێکە کردووە بە
دەفتەر. وەختێتییو وەختێتیی، کە ئیتر تۆ خۆێشت
زامێك بی لە نێوان زامانی کێواندا وەختێتییو وەختێتیی
تۆیش ئیتر ڕەنگێ بی لە نێوان ڕەنگاڵەی ستراندا.

ئەم هەموو شاخانە چی ئەکەن لەم ناوە؟!
هەزاران ساڵە تەماشای خوا ئەکەنو وەڕس نابن!
ئەم هەموو دارانە چی ئەکەن لەم ناوە؟!
هەزاران ساڵە تەماشای شاخ ئەکەنو
بە پێوەنو وەڕس نابن!
ئەم هەموو ڕووبارو چەمانە چی ئەکەن لەم ناوە؟!
هەزاران ساڵە تەماشای بەردەمی خۆیان ئەکەنو
ڕێ ئەکەنو کۆچەرنو وەڕس نابن!

یەکەم ڕۆژ بوو.. پەلکە گیایەك هاتە لاتو
سەربوردی خۆی گێڕایەوەو گێڕایەوەو
هەتا تۆی کرد بە شەونمێ لە چاوانیا.

یەکەم ڕۆژ بوو.. جۆگەیەکی ناو دارستان هاتە لاتو
سەربووردی خۆی گێڕایەوەو گێڕایەوەو هەتا تۆی کرد
بە گریانێ لە گەروویدا.

یەکەم ڕۆژ بوو.. باڵندەیەك –چاوێکی کوێر-
هاتە لاتو سەربوردی خۆی گێڕایەوەو گێڕایەوە
هەتا تۆی کرد بە هێلانە لە دەروونیا.

هەر یەکەم ڕۆژ کیژۆڵەیەکی یەك قاچی ئەو گوندانەیش
هاتە لاتو سەربوردی خۆی گێڕایەوەو گێڕایەوە
هەتا تۆی کرد بە پاوانە
لەو پێیەدا!

تۆ ئیستە لە بەردەم دەربەندی -بەرگەڵۆ-ی بە سامدای.
هەر ئەڵێی نیشانەی پرسیاریو بەرانبەر بێباکیی گەردوونێ
وەستاوی. ئەپرسیو چارەنووس لە دوور ڕا وەك
تەمی بناری ژیلوانو وەك چاوی خۆڵەمێش ئەبینی.
ئەپرسی بەرەو کوێ؟! ئەی خاچی بەژنی کورد! ئەی تەنیای
زەمانە! بەرەو کوێ؟ ئەی عیسای لەتو پەت، بەرەو کوێ؟!
ئەی خەونی زڕاوی ناو سەری ئەم عەردە کلۆڵەو تاقانەی
ناکامی ئەم هەموو سەرچاوەی خوێنانە؟! تۆ ئیستە لە بەردەم
دەربەندی بەرگەڵۆی پرسیاردا وەستاویو گەردنت
مۆمی خواو بەژنیشت داستانی دابانە!

هەر لێرە هەندێ جار ئێواران کە پەستیی
وەك گەرووی دەربەندی تەنگەبەر، ئەبێتە سێبەری

نشێوی تەنیایی‌و لە نێوان دوو شاخدا خەیاڵت
ئەگوشێ. هەست ئەکەیت تۆ خڵتەی ژینێکی
بێ هودەی لە بنی دۆڵێکداو، وەك خوێنی ڕژاوی
ناو زستان دەم‌و دەست ئەمەیی. هەست ئەکەیت
تەنیاییت تەنیایی مێژووتە. تەنیایی باوکتەو تەنیایی
دایکتەو تەنیایی چیاتە. تەنیایی خاچەکەی سەر
پشتتەو لەگەڵتا پشتاوپشت هاتووە. ئەوەتا وا
ئیستەیش لێرەدا، تۆو باوکت ئەبنەوە بە یەك‌و پێکەوە
تێکەڵی سەرابێ ئەبنەوەو بە شوێن پێی هەر هەمان
دیرۆکدا ئەچنەوە. ئەپرسیی شیعری چی؟! بێزاری‌و ئەپرسیی
شیعری چی؟! تۆ شێتی؟! لە دنیای خومپارەو
تی ئێن تی‌و سۆخۆدا گوڵی چی شیعری چی‌و دڵی چی؟!
بێزاری لەم مێژووە خەرەکە. لەم ئاوە وەستاوە.
لەم سەرەسواوە!
بێزاریت. لە ئاوی وەستاوی بەردەمتا. لە ئاوی
ئاوێنەی بەردەمتا. تەماشای خۆت ئەکەیت
هەمان سات ئەبینی: تۆ خۆتی‌و خۆیشت نیت!
تەماشای خۆت ئەکەیت. ئەچیتە ناو چاوی
خۆتەوە، سەیرئەکەی هەمان سات: ڕیشت دێ‌و
ڕیشت دێ‌و پیر ئەبی، ڕیش ئەبێ بە پەموو،
هەتاکو ئەبی بە شێخ سەعی. شێخ سەعی لائەچێ‌و
هەر خۆتی، ئەمجارە سیمای تۆ خرتر ەو، ئەمجارە

**تۆ ئەبی بە نەهری. ئەگۆڕدرێی هەر خۆتی**
**ناگۆڕدرێی هەر خۆتی.**
**ئەمجارە سمێڵت قەترانیو**
**ئەستوورتر. لە پەنا بەردێکداو لە خوێندا پاڵکەوتووی،**
**ئەمجارە ئەبی بە شێخ مەحمود، ساتێکەو شێخ مەحمودیش**
**لائەچێ، ئەمجارە تۆ ئەبی بە سمکۆ، ئەگۆڕدرێی**
**هەمان سات ئەمجارە لاوازیو ئاودامان جبەیەك**
**لەبەرداو تۆ ئەبی بە قازی.**
**بەم جۆرە سیمای تۆ هی خۆتەو هی هەموو،**
**بەم جۆرە لە ئاوی وەستاوی بەردەمتا، دەرسیمیو**
**وانیتیو پێنجوینیو سورداشیو سابلاخیو ورمێیتو**
**دواجاریش تەماشای خۆت ئەکەیت بەرگەلۆوی!**

**بۆ سبەی. نەء. شیعر دەستێکی دیکەیە بۆ سەنگەر**
**وا ئەڵێی. نەء وشەیش گوللەیە**
**نەء.. ڕستەیش کێڵگەیە بۆ چاوو**
**نەء.. هونەر هاواری جوانییەو**
**ئەسپێکی دیکەیە بۆ غارگەو**
**خەونێکە هەر دوارۆژ ئەیبینێو**
**هەر دیدەی پێغەمبەر. وا ئەڵێی.**
**ئیتر تۆ کەشکۆڵی پڕ لە خەو، پڕ لە باخ**
**پڕ لە تەم، پڕ لە شەو، پڕ لە ڕۆژ هەڵئەگریو**

تۆ چەرچی ناسۆری‌و تۆ چەرچی وشەیت‌و
گوند بە گوند ئەگەڕێی.

سەرئەکەی بە ماڵی گەنم‌و جۆی برسیدا.
سەر ئەکەی بە ماڵی کارێزی تینوودا.
ئەبیتە میوانی کاولاش‌و
ئەبیتە میوانی خۆڵەمێش.

تۆ ئەمشەو بە تەمای بباریێی.
تۆ ئەمشەو ئەتەوێ بسووتێی.
تۆ ئەمشەو شیعر ئەکەی بە فانۆس،
تۆ ئەمشەو شیعر ئەکەی بە بازو
بە سوورەچنارو
بە شاراو
بە کچە کافرۆش!
گوێگرت تێکەڵە لە داری چەند جارێك قاچ شکاو
لە گردی چەند جارێك سەرشکاو
گوێگرت تێکەڵە لە ئێش‌و ئازاری قوڕاویی
لە پیرە دارگوێزی دان کەل‌و
لە ڕەنجی سەروقژ خۆڵاویی.
گوێگرت تێکەڵە.. لە کۆنە تفەنگ‌و لە ئەسپی پەککەوتەو
گوێگرت تێکەڵە.. لە سووتووی زەمانەو
لە جوانووی تا ئیستە زین نەکراو!

## "بەشێك لە سوورەتی ئەوینی کتێبی شاخ"

تۆ بڵێ شاخ⋆ شاخی تەنیا⋆ شاخ ئەو دەمەی
کە بەردی خۆی ئەکرۆژێتو فرمێسکی خۆی ئەخواتەوەو،
زامانی خۆی ڕائەخاتو نامۆییش ئەدا بە خۆیدا⋆
تۆ بڵێ شاخ⋆ شاخی تەنیا⋆ شاخ ئەودەمەی
لەتاو ئازار ئەجووڵێتو ژان ئەیگرێو ئەورووژێتو
بە خوێنی خۆی ئەنووسێتو عەشقیش گڕی تێبەرئەدات⋆
تۆ بڵێ شاخ ⋆ شاخی تەنیا ⋆ شاخ ئەودەمەی:
ئەبێ بە دایك ئەبێ بە باوك ئەبێ بە یار ⋆ ئەبێ بە
ئەشکەوتی هاوار ⋆ تۆ بڵێ شاخ ⋆ شاخی مێژوو،
ڤیژەی سوتوو، ئاوی تینوو، تۆ بڵێ شاخ،
ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە شاخ!
من بە زمانی داربەڕووی ئێوە ئەدوێم ⋆ زمانی ئاخ،
زمانی داخ * یەکەم سوورەت لە باراننامەی ئێمەدا،
لە ژنەوە دەست پێئەکات ⋆ ئەمە سوورەتی ئەوینە
لە مەملەکەتی شیعردا ژن پاشایەو پیاو گەدایە،
لە مەملەکەتی عاشقدا، ژن سەرچاوەی خەونەکانە،
ژن پەیامی بەردەکانەو ژن ڕێگایە ⋆
لەناو جیهانی ئێمەدا ئەم سوورەتە: ڕەنگەو دەنگەو
سۆزەو زەنگە ⋆ بۆ میراتی بەردی شاخیش⋆ بۆ
میراتی چرای خەونیش، بۆ میراتی هەتاو و ئاو،

ژن نیوەیەو پیاو سێیەکە!

تۆ خاچی مار تێئالاوی
تۆ نەفرەتی ناو مەملەکەتی گوناهیو
تۆ باراننامەی عەشقێکی قەدەغەیتو
تۆ سوورەتێکی ئەوینی ڕافزیتو
لەم بەهەشتو لەو بەهەشتیش
دەرکراوی!

تۆ ئیستە لە زاری دەربەندا مەراقی ئاڵ ئاڵیو
هەڵئەقوولێی. تۆ ئیستە لە زاری دەربەندا،
دوو چاوی ڕوواوی سۆراخیو ڕۆژانە تابووتی
گولاڵە، تابووتی شەهیدان ئەنێژی!
تابووتی گولاڵە ئەمەندە زۆر بووە نە دەربەند
ئەیگرێو نە پێدەشت. باڵندەی شەهیدان ئەمەندە
زۆر بووە، نە ئاسمان ئەیگرێو نە بەهەشت.
لە شانی دەربەندا، ژوورەکەت هێلانەی هەڵبەستە.
هەر ڕۆژە هەڵۆیەك بە پەڕی خۆلاوی و بە باڵی
خوێناوییو بە کۆڵەپشتەوە دێت بۆ لات.
ئەم بازی شاخانە هەڵبەستیان خۆش ئەوێ
ئەوەندەی کە نانو کە گوڵو کە نوقڵێیان
خۆش ئەوێ. دێن بۆ لات. هەندێکیان کە

ئەڕۆن شیعرەکان لە باڵیان ئەپێچن بۆ ئەوەی
بیانبەن بۆ لووتکە. هەندێکیان ئەیانکەن
بە لەتە ئاوێنەو ئەیخەنە هەگبەوە. هەندێکیان
ئەیانکەن بە پیلی لایتو، هەیشانە ئەیانکەن
بە کاسکێت. دێن بۆ لات. لەم بازە سوورانەت
زۆر بینی. گەلێکیان هەر جارێك ئەتبینین،
ئەو جارەیش دواجار بوو. بازێکی گەرمەسێر ئەهاتو
لەگەڵ خۆی ماچێکی کەرکووکی ئەهێنا. ماچەکەت
وەرئەگرت. ماچەکەت ماچ ئەکرد. ماچەکەت
ئەکرد بە کارێزێ بۆ ماسی شیعرتو، ئەو
ئەڕۆی، هەڵئەفڕیو بۆ سبەی تۆ ئەتبیست
لە باوەش قەندیلا پێکراوە. بازێکی ڕۆژئاوا
ئەهاتو لەگەڵ خۆی شەمامەی پێنجوێنی
ئەهێناو شەمامەت وەرئەگرت. شەمامەت
ماچ ئەکرد. شەمامەت ئەکرد بە گومەزی
ئیلهامێ بۆ شیعرو ئەو ئەڕۆی هەڵئەفڕیو
بۆ سبەی تۆ ئەتبیست لە ئاسۆی "پردێ"دا نێژراوە.

هەرمێکەی دڵی تۆ ئەمانە فڕاندیان بە دەنووك
هەڵیانگرت بردیان بۆ گەرمیان.
گێلاسی چاوی تۆ ئەمانە فڕاندیان بە دەنووك
هەڵیانگرت بردیان بۆ ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات.

لاسکی پەنجەی تۆ ئەمانە فڕاندیان بە دەنووک
هەڵیانگرت بردیان بۆ:
باکوورو باشوورو
ناو شارو شارۆچکەو
دێ بە دێی ناو وڵات!
هەر بۆیەش تۆ ئیستە:
نە چاوت هی خۆتەو نە دەنگتو
نە دڵتو نە پەنجەت
تۆ تازە ڕووباری شیعرێکی
شەهیدان بوونەتە سەرچاوەت.

ژوورەکەت فڕۆکەی بەردینی خەیاڵتەو فڕگەی ئەو
پانتایی سەر لوتکەی کێوانتە.
ژوورەکەت بەلەمی بەردینیی خەیاڵتەو ئاوی ئەو
مەراقی لیخنی شەوانتە.
هەموو جار ژوورەکەت کە ئەفڕێ لەگەڵ خۆی
درەختی غەمگینی منداڵیو دایکتو
حەوزەکەی مزگەوتی حاجی حان هەڵئەگرێ.
هەموو جار ژوورەکەت کە سەوڵ لێئەداو
کەناری بەرگەڵو جێدێڵێ
خەرمانێك لە قژی دڵداریو خەرمانێك
لە وشەو گۆرانیی هەڵئەگرێ.

ڕابوردوو بۆ ماسیی تەنیایی ژوورەکەت
گۆمێکە ئەو ئاوەی لێبڕێ
زوو ئەمرێ!

تۆ دیسان ئەچیتە خەوەوەو ناو خەویش هەر بێشەی
پرسیارە. تۆ دیسان ئەچیتە خەوەوەو ناو خەویش
وڵاتی ئازارە.
تۆ بۆیە وەك دەربەند باسەڕە ماتیتو
وەك پێچی ناو گەلیی ئاڵۆزیی
چونکە تۆ دەروونت خوماوی کراسەڕەشەکەی
دایکتی هەڵمژیو
گیانیشت بوولێڵی تەنیاییو بێکەسیی!
تۆ بۆیە عەشقێکی وەکو داس کۆماوەی
تۆ بۆیە ڕەنگێکی وەك زەردە پەڕیوی
چونکە تۆ کڕنوشت بەردەوام بۆ خاکەو
چونکە تۆ ئێوارەی هەژاران ئەپۆشیی.

بەردەوام تۆ ژانی لوول خواردووی ئەو بەردەی
لە دەمی برینیا گوڵ شیعری سوور ئەڕوێ.
بەردەوام تۆ ژانی نەسرەوتی ئەو وەرزەی
کە دووانەی ئاگرو کڕێوەی ناوەختی لێ ئەبێ!

ئەگەڕێی یاڵەویاڵ ئەگەڕێی

تۆ مێژووی بزری‌و بۆ بزر ئەگەڕێی.
تانوپۆت لە داوی گومانەو
بۆ گومان ئەگەڕێی.
گوێ ئەنێی بە دڵی گڵەوە هاوارو پرسیاری
ڕەگی قووڵ ئەبیسیی
گوێ ئەنێی بە دڵی ئاوەوە هاوارو پرسیاری
سەرچاوەت ئەبیسیی
گوێ ئەنێی بە دڵی دارەوە هاوارو پرسیاری
لق‌و پۆپ ئەبیسیی!
ئەگەیتە هەر ڕێیەك
ڕێبوارە سۆراخێ دێ بە پیر ژانتەوە.
ئەگەیتە هەر گردێك
تینوێتی پرسیارێ ئەبێتە هاوڕێت.
ئەگەیتە هەر دەشتێك
گرێیەك لە گومان
زیاد ئەكات بۆ گرێت.
وەڕسیت، لەكەلی خەیاڵی تەنگەبەر، وەڕسیت.
تۆ ئیستە باڵندەی نامۆیی ناو خۆتی
بە چەشنی نامۆیی بنارێ بە لووتكەی.
تۆ ئیستە باڵندەی گومانی
بە وێنەی گومانی سەرەتا بەرانبەر كۆتایی.
تۆ ئیستە باڵندەی پرسیاری و، بێ سنوور

هەر وەكو پرسیاری ئەم ئەرزە لە گەردوون
ئەمجارە ئەتەوێ چوون نالی‌و عەشقەكەی
بە دووریت نزیكتر بیتەوە لە ئەوین!
ئەتەوێ ئەمجارە وەكو حاجی‌و فرمێسكی
لە دوور ڕا سووتانی غوربەتت
نیشانی خاك بدەیت!
ئەتەوێ نامۆیی چرا بێ‌و
بۆ دوور دوور هەڵفڕێ.
ئەتەوێ نامۆییت تێكەڵی نامۆیی جیهان كەیت
بۆئەوەی بە بەژنی هەڵبەستی گێتیدا هەڵژنی.
ئەتەوێ شیعرێ بی
هەر هەموو ئەشكەنجەو ئەوینی ناو دنیا
وەك خاچی مەسیح‌و چون سەری گیڤاراو
وەك گوێچكەی بڕاوی ڤان كوخ‌و
چون ڕامبۆی ئاوارە: بتناسێ!
تۆ خاچی مار تێئالآوی.. ئەو وەختەی مەسیح ئەبێ بە شیعرو
یەزدان دێ ئەیخوێنێتەوە!
تۆ گەواڵە هەوری كۆچی.. ئەو وەختەی سەفەر ئەبێ بە ژان‌و
باران دێ ئەیخوێنێتەوە.
تۆ فڕینی بەردو داری.. ئەو وەختەی كە كۆستت باڵ ئەگرێ‌و
خاك‌و خۆڵ ئەكرۆزێتەوە.
تۆ چرایەكی فرمێسكی.. ئەو وەختەی سلێمانی جێدێڵی‌و

ون ئەبیتو هیچ بادێك ناتدۆزێتەوە!

بەم شەوە شام لەبەر باراندا هەر ئەڵێی:
پەیکەری فسفۆڕی عەشتارەو
لە چرای مەمکەوە، بریسکەی تەڕئەدا لە چاوم.
هەست ئەکەم کەوێکی ئەزمرڕو
فڕینی وێڵ منی خستۆتە بەردەمی
شەوارەی ئەم شارە.

لە ڕێزەی دڵۆپی زیوینی بەر شەوقی گڵۆپدا
وەك پرژەی خەوێکی منداڵیی لێم بدا..
یان وێنەی ملوانکەی مرواری فریشتەی
ناو هەور، بە گرمە، هەڵوەریێو
بباریێ وا دیارە!
نامۆیی لە تەیری ون ئەچێ
ئەو وەختەی دووچاوی سەرسامیی
بە دەوری بۆشایی سۆراخدا ئەگێڕێ.

ئەمشەوم شەڵاڵی "بەرەدا"و
گۆرانیی "مهیار"ە.
ئەمشەوم سەرەتای سەفەری درێژی
تەماویی پرسیارە.

ئەی شیعری سەرگەردان بەرەو کوێ؟!
یادگار لە دواوە هاوارت لێئەکاو
هەنووکەت ئەسپێکی سەرکێشەو
ئایندەیش وەك ئەودیو تەمتومان نادیارە!
وا ئەمشەو شام پەنجەی بارانەو
سەری من: تارەکەی.
وا ئەمشەو شام سەمای سووتانەو
عەشقی من: ئاگرەکەی!
ئەبارێ باران و ئەبارێ غوربەت و ئەبارێ شیعری جوان
لەمەودوا من بۆ شام شمشاڵی بارانم و
گریانی ئەرخەوان!
تۆ ئیستە ئاخێکی سەروقژ بژیت و
شیعرێکی ڕیشهاتووی بێدەنگ و
لە ژوورسەر مەزاری ڕووتەڵەی
مەولانە وەستاوی.
لە چاوتا مێژوویەك قەتیسە.. فرمێسکە؟!
یان نمەی ئیشراقەو
پێی ئەڵێن دیمانەی مەولانە؟!
لە قوڕگتا کانییەك قەتیسە.. هەنیسکە؟!
یان گمەی کسپەیەو یان سۆزی
وەجدێکی مەولانە؟!
لە ژوورسەر ئەستێرەی گۆڕ غەریب وەستاوی و

ئەبینی: درەختی نوورەکەی خانەقاو
بای وەشتی شارەزوور لێرەیە!
لە ژوورسەر سیروانی گۆڕغەریب وەستاوی‌و
ئەبینی: مانگەکەی سەر "بەمۆ" لێرەیە.
وەستاویی گوێ ئەگری:
لە دەنگی بێدەنگی‌و
لە ڕەنگی بێڕەنگی‌و
گوێ ئەگری لە خۆڵی قەسیدەو
لە سووتووی نامۆیی!

وەستاوی‌و ئەبیسیی..
خۆڵەمێش چی ئەڵێ ئەو کاتەی
کە بیری بڵێسەی جارانی خۆی ئەکات!
داروبار چی ئەڵێن ئەو کاتەی
ڕووبارێ کۆچ ئەکات.
شاخەکان چی ئەڵێن ئەو کاتەی
تاڤگەو قەڵبەزە بارئەکەن!
وەستاوی‌و ئەشفڕی.
وەستاوی‌و تۆ خەونیش ئەبینی.
کە ئەفڕی چۆلەکەی سەر قوببەی گومەزی مەولانەی.
کە خەونیش ئەبینی مۆمێکی سووتاوی ناو قسنی مەولانەی.
لە نێوان فڕین‌و سووتاندا تۆ ئیستە

خەرمانەی تەنیاییو
عەشقێکی ناکامی زەمانەی!

بەر لە کۆچ غەریب بوو ئەو دەنگە
بە گەرووی شارەکەی.
بەر لە کۆچ غەریب بوو ئەو زامە
بە جەستەی شارەکەی.
بەر لە کۆچ غەریب بوو ئەو مەلە
بە ئاسۆی شارەکەی
بەر لە کۆچ غەریب بوو ئەو ڕەنگە
بە ڕەنگی شارەکەی.
مەولانە پەنجەرەی غەریب بوو بە ژووری ماڵەکەی.
مەولانە نیشتمان غەریب بوو
بەرلەوەی نیشتمان جێبێڵێ.
هەر لەناو شیعردا
مەولانە شیعرێکی غەریب بوو.
هەر لەناو گریانی وڵاتدا
مەولانە فرمێسكو چاوێکی غەریب بوو.

وەستاویو تەماشای توانەوەی خۆت ئەکەیت
تۆ ئیستە لە ژوورسەر مەولانەی پێشەنگی غوربەتدا
قەسیدەی ڕێژنەو لێزمەی کۆچێکی تازەیتو

**بە خوڕەم دائەکەیت!**

**شەوانیش "بەرەدا" ئەبینی تۆ وەختێ ئەیبینی**

**شەپۆلی سەرخۆشە. تۆ وەختێ ئەیبینی**

**ناولەشی هەر هەمووی گڵۆپەو ئەلەرزێ،**

**ڕووناکیی سەرخۆشە. خەیاڵت کورسییەك ئەباتە**

**کەناریو نزیکی کەمەری. هێند نابا تۆیش ئەبی**

**بە مەلی سەرخۆشی. تۆیش ئەبی بە لەنجەی**

**خوماری ئەم ئاوە سەرگەرمەو تا گڵۆپ لە**

**لەشیا بلەرزێو تا کورسی پێت نەڵێ کە هەڵسی**

**هەڵناسیو قوم بە قوم لە ئاوی سپێنەی**

**ڕەزەکەی دووچاوی ئەنۆشی.**

**هەر لە شام لە "بەرزە"**

**تۆ نەوەی میدییەکان ئەبینی**

**هەر لە شام تۆ نەوەی باپیرەی ئاسنپۆش**

**ئەیوبیی ئەبینی.**

**ملیۆنێك قفڵو دەم ئەبینی**

**ئەوکاتەی یەك کلیل هەر هەمووی پێکەوە قفڵ ئەدات.**

**ملیۆنێك باڵندەی سەر خابوور ئەبینی**

**ئەو کاتەی یەك چەقۆ وا لەسەر گەردنی هەموویان.**

**ملیۆنێك گوڵەجۆ ئەبینی.**

**ئەوکاتەی پێناسەی کێڵگەیان یاساغە.**

**ملیۆنێك گۆرانی ئەبینی**

قەدەغەن لە قورگو وان لەناو پشتێنەی سەوزدا.
ملیۆنێك بە ڕەگەز داربەڕوو ئەبینی
ڕۆژانە چووز ئەكرێن لە ناوكی دارخورما!
ملیۆنێك فرمێسكو
ملیۆنێك هەناری گوشراوو
ملیۆنێك ئازاری ڕووتەڵەو
ملیۆنێك لەم مێژووە یاساغە ئەبینیو بە چرپە
پێت ئەڵێن كە باوكی ئەوانیش هەر شاخە!

لێرەیش هەر زیندانی گوێزانو مقەستی باڵكردن
بۆ شیعرێ خەوی زیاد ببینێو
دەنووكی زۆر بگرێو
لە شوورە بەرزتر هەڵفڕێ. ئامادەو والآیە.
لێرەیش هەر دەمامك شانۆیەو
بەرگی بەر -پادشای ڕووتو قووت-
جوانترین كالآیە!
من دوێنێ لە یەرمووك مهیار بووم
بەردەوام لە كۆڵداو قامیشلیم خستبووە، سەرشانمو
شیعری خۆم لە قوببەی سەر دڵی مەولانەو
منارەی گەردنی ئەیوبیو
سەربانی مالآنی (بەرزەوە)
بەرەو خۆر هەڵئەفڕان.

من دوێنێ لە یەرمووك یارانی کەنفانی
کۆڕێکیان بۆ وشەی دەروێشی نالیم‌و
بۆ دەنگی سێدارەی قودسیم‌و
بۆ چاوی یارەکەم بۆ گرتم.
وا ئەمڕۆیش لە بەردەم پرسیاری گوێزاندام
هۆنراوەم لە چنگی ئەفسەری ئاسندا
جووکەی دێ‌و
هەتاوی گیراوم!
تۆ قژی گۆرانیت هەڵپاچراو
تۆ شیعرت وەك جانتای تلیاك‌و هێرۆین
مۆرکراو..
تۆ ئەبێ خەڵوەتی مەولانە جێبێڵی‌و
بەرەدا لە کۆڵت داگری‌و
تا باڵت بڕئەکا.. بۆ ئەودیو زەریاکان
هەڵفڕی‌و هەڵفڕی‌و هەڵفڕی!
تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ خاچەکەت وەختێ ئەفڕێ
لەم فڕگەوە بۆ ئەو فڕگە
غەریبیی ئەتگوێزێتەوەو
لەگەڵ خۆیدا شیعری ئاوارە سوارئەکاو
زامی کۆن‌و نوێ هەڵئەگرێ.
تۆ خاچی مار تێئاڵاوی، تۆ ناڵەناڵی بەسام‌و ترسناکی

فڕۆکەی بەجێهێشتنی، کە هەڵئەسێ.
تۆ زیکەزیکی درێژی پێچکەکانی گەیشتنی
کە وەختێکیش دائەبەزێ.
کە منداڵ بووی منارەکەی کاك ئەحمەدی سلێمانیو
سەردەمێکیش شاخەکانی پەڵەهەور
بەرزترین دووندو لووتکەی خەیاڵت بوون.
بەڵام ئەوا ئیستا بەسەر زەریای سپی ناوەڕاستدا
تۆ خاچێکی باڵگرتوویتو
لە ژوور شاخی هەورەوەیتو
قووڵایی ئاسمان ڕێگایە.
لەم بەرزەوەو لە پاڵ پەنجەرەی سەرپەڕدا
زەریا وەکو شیفۆنێکی شینی تۆخو
هەوریش وەکو لۆکەیەکی شیکراوە لە ژێرتایە!

لە هەرکوێ بی.. تۆ خاچی مار تێئالاوی.
لەسەر عەرد بی.. تراویلکەو فوارەی خۆڵی.
لە زەریادا.. گەمیەی ونو سەوڵی تەمی.
لە ئاسمانیش تۆ فڕینی نامۆییتو
تۆ ڕێگەوبانی دووکەڵی.

لە هەرکوێ بی.. لە ڕوانینتا تیلەی سەرنجێکی تیایە
ئەو تیلەیە غەریبییە. ئەو تیلەیە لە ئیستەدا

نە فرمێسکی چاوی خۆتەو نە تەمی سەر پێڵوەکانت.
ئەو تیلەیە ڕەنگە گیاندانی گوڵێك بێ لە بەهاری
نیشتماندا. ڕەنگە وەرینی مانگێك بێ لە ئاسمانی
نیشتماندا. ڕەنگە هەناسەی دایکت بێو فڕینێکی
خێرای کسپەی. ئەو تیلەیە ڕەنگە لەناو
جۆگەیەکی کوژراوەوە بێتە دەرێ. ڕەنگە تیلەی
ئێشی چاوی پەلکەگیا بێ. ئەو سەرنجە ڕەنگە
سەرنجی شیعرێ بێ کە پێش بیست ساڵ حەزی
لە خەمێ کردبێ. ئەو سەرنجە ڕەنگە سەرنجی پەنجەرەی
ئەو ژوورە بێ کە بلدۆزەر دێتە سەری.
لە هەرکوێ بی. لە سیماتا سێبەرێکی کڕی تیایە
ئەو سێبەرە غەریبییە. ئەو سێبەرە لە ئیستەدا
نە سێبەری قژی خۆتەو نە سێبەری بەر پەنجەرەو
ژوورەکەی خۆت. ئەو سێبەرە ڕەنگە سێبەری
سێدارەو خەیاڵێکی ناو زیندانی نیشتمان بێ.
ڕەنگە سێبەری ئێوارەی دوای ڕاگوێزانی گوندێ بێ.
ڕەنگە سێبەری فرمێسکی یارەکەت بێ. ئەو
سێبەرە ڕەنگە سێبەری ترسێکی چڕوپڕی شەقامەکانی
شارت بێ. ئەو سێبەرە ڕەنگە سێبەری تابووتی
شەهیدێ بێ.

لە هەرکوێ بی. خورپەیەك وا لەناو دڵتا

ئەو خورپەیە غەریبییە.
ئەو خورپەیە لە ئیستەدا
خورپەی ترسێکی خۆت نییە.
خورپەی ناو ماندوێتی نییە
ئەوە ڕەنگە خورپەی دڵی درەختێکی نیشتمان بێ
خورپەی دڵی خاكو خۆڵ بێ.
ئەوە ڕەنگە خورپەی دڵی کانییەك بێ
کە هاتوون بۆ داپۆشینی.
ڕەنگە خورپەی دڵی چیرۆکێ بێ
کە هاتوون بۆ: کوشتنی چیرۆکنووسەکەی
لە هەرکوێ بی. لەناو دەنگتا جۆرە گیرانێکی تیایە
ئەو گیرانە غەریبییە. ئەو گیرانە
گیرانی گەرووی خۆت نییە.
ئەو گیرانە ڕەنگە تاسانی شمشاڵو
ئاوازێکی نیشتمان بێ لەو کاتەدا
کە لە دواوە باڵەکانیان توند ئەبەستن.
ڕەنگە گیرانی (با)یەك بێ
کە کوتوپڕ هەڵئەکوتنە سەر ماڵەکەی.
ڕەنگە هەنسکی گریانی گوڵەلیمۆیەکی جوان بێ
ڕەنگە گیرانی ئاوەڕۆی هەڵبەستێ بێ
ئەو وەختەی ئەیشکێننەوە!
ڕەنگە ئەوە مەڵاس بوونی قەوزەی وەی بێ

PDF 4 KURD

به مەڵاشووی حەوزێکی هاوڕێتەوە!

تۆ کە ئیستە بە شێوەو ڕەنگ لە شەو ئەچی
ئەوە تاریکیی ژانێکی ناو دارستان وای لێکردی.
تۆ کە ئیستە بە باریکیی لە قامیشی دەشتێ ئەچی
ئەوە بۆشایی هەناوی خەمەکانی گەرمیان بوو وای لێ کردی.
تۆ کە ئیستە هەردوو چاوت بوونەتە دوو گوڵی ژاڵە
ئەوە گریانی کۆچڕەوی دارگێلاس بوو وای لێکردی.
تۆ کە ئیستە وا بێدەنگیو لە پەیکەرە بتێ ئەچی
ئەوە سامی کشو ماتیو چۆڵو هۆڵیی
ناو گوندێکی کاولکراو وای لێکردی.
تۆ کە ئیستەیش ڤنگی شیعرت توێتکە ناخواو

هەر ساتێكو لە شوێنێکی
ئەوە فرمێسکەکۆچەری لە بەفرەوە بۆ لای گڕەو
لە گڕەوە بۆ لای بەفری نێوان مەراقی مەولەویو
کۆستی نالی وای لێکردی!

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ پەلو پۆی سەفەرێکی زۆر دێرینەی
ئەم جیهانەی.
تۆ جانتایەکی سیخناخی

لە هەناسەی ساردو گەرمو
تۆ ڕاکردنی "شوێن"یتو
تۆ هەڵفڕینی "کات"یتو
تۆ کورسییەکی دوودڵیو
ژمارەیەکی سەرسامیو
ڕێگایەکی ئاڵۆزکاوی.

فلۆرەنسا:
لەسەر شەقامی شیعری سەوز ڕاوەستاوم
پڕ باوەشم لە گۆرانیی زەردو سوورەو
دوو کانیی شین بوون بە چاوم.
فلۆرەنسا:
یەکەم ماچی نێوان ئادەمو حەوایە
بووبێ بە شار.
یەکەم ئاوازی خودایشە
کە بۆ بەهەشتی دانابێ!

فلۆرەنسا:
لە بەردەمما وەك کۆمیدیای ئیلاهی
پەڕە پەڕە ئەکرێتەوە.
جارێك ئەمکا بە سەرەتا بۆ ئەوینو

جارێکی دی بە گوناهی بێکۆتایی.

فلۆرەنسا:
پایز هێنامی بۆ لای تۆ
پایز پایز تەنها ژنێ
لەناو ساڵدا من بناسێو
تێمبگاتو بشمژەنێ!
زستان ژنێکی تەمەڵە
لە کونی ژوورێ خزاوەو
هەر خەریکی پاڵکەوتنو باوێشکدانە.
بەهار ژنێکی گەمژەیە
وا ئەزانێ ئەم ژیانە
هەر بە جوانیی ڕواڵەتە!
هاوین ژنێکی بەرەڵڵاو خۆپەرستە
نە ماڵی هەیەو نە بەڵێن نە جێو ڕێگە.
ئەم سێ ژنە بەهەرسێکیان
ئەگەر نیو ئەوەندەی پاییز لەگەڵ کۆچما بگرینایە.
وەکو پاییز بۆ تەنیاییم یار بوونایە.
ئەوسا ساڵیش وەکو ئیستە
سپڵەو بێوەفا نەئەبوو بەرانبەرم
ئاوڕێکی لەم دڵدارە ئەدایەوەو
ڕێزێکی خەمی ئەگرتم!

فلۆرەنسا:

هەموو ڕۆژێ چۆمی "ئارتۆ" لانکەی ئاوە

بۆ شیعرێکی تازەزاوم. شەپۆل شەپۆل ڕامئەژەنێ.

هەموو ڕۆژێ چۆمی ئارتۆ نەورەسێکی دڵدانەوە

بە تەڵێ گوڵی مۆرەوە: ئەنێرێتە لای هەناسەم

من ئێستاکە هەردوو دەستم

وەکو کەناری چۆمی ئارتۆ

هەوارن بۆ وشەی تەڕو

ماسیگرەی بەر سنگ سپیو

شەقامن بۆ خۆزگەی نامۆ.

"دانتی" لێرە دائەنیشێ

ماڵی گوڵو ماڵی گڕی ئەو لێرەیە.

دانتی هەر لێرەیش ئەنووسێ

وشەی پشکۆو وشەی خونچەی ئەو لێرەیە.

لێرە ئەبێ بە گوڵدانو

لێرەیش ئەبێ بە ئاگردان.

لێرە دۆزەخ ئەکاتە بەر هزرەکانیو

لێرە بەهەشت ئەکاتە بەر سۆزەکانیو

لێرەیش ئەبێ بە نزایەکی نارنجیی

نێوان هەردوو گوڵو ئاگر.

ئەم شارە شاری ئەفسانەی ناو مەملەکەتی هونەرە

جادەو کۆڵان، دەرگاو دیوار، گۆڕەپانو باڵەخانەو،

باخچەو نزار هەموو بوون بە ژێر دەستو پێی پەیکەرەوە
پەنجەرە زاری پەیکەرە.
پایەکان قاچی پەیکەرن.
دەرگا هاواری پەیکەرە.
دیوار سنگی خواوەندێكو.
جادە: ڕووباری عەشقێکی هەڵکۆڵراوی ناو هونەرە.
قوببەکان مەمکی پەیکەرن
باڵەخانە بووە بە ئەسپ
درەختەکان بوون بە ژنو،
ڕمو نێزە بوون بە پیاوو.
بەردی بچووکیش بە منداڵ.
پەیکەر، پەیکەر، پەیکەر
وێنەو هونەر، وێنەو هونەر، وێنەو هونەر.
لێرە میکائیل ئەنجلۆ وەك گلێنەت لەگەڵتایە.
لێرە میکائیل ئەنجلۆ ئەبینی چۆن
لەژێر چەکوشی پەنجەیدا
ئاو هەڵئەقولێنێ لە بەردو
بەرد ئەکا بە گۆشتو ئێسكو
ڕۆحیش ئەکا بە بەریاندا!
لێرە میکائیل ئەنجلۆ ئەبینی چۆن
شەقام ئەهێنێتە قسە
باڵ ئەڕوێنێ لە دیوارو

سەری مەسیح
ئەکا بە زەنگی کڵێسە!
ئەمە شاری سەرسامییە
وەختێ کە دوو چاو بەش ناکا بۆ تەماشا!
ئەمە شاری تەلیسمە لەناو تەلیسما
وەختێ کە شیعر لاڵ ئەبێو
دەنگ ئەوق ئەبێو
قەڵەم وشە لە بیر ئەکا!

ئەگەیتە لای ڤینتسیای شاژنی ئاو
ئاوێزانی تاڤگەکەی بەژنی ئەبیو
ئەبی بە ئەستێرەی ناو ئاو.
ئەگەیتە لای کەرنەڤاڵی شەقامی ئاو، کۆڵانی ئاو
ئەبی بە ماسیی باڵداری دڵداری ئاو.
ڤینتسیا لەناو ئاودا لە دایك بوو
ئاو لانکەی بوو.. ئاو ماڵی بوو
ئاو خوێندنگاو.. ئاو ئەوینو
ئاو یاری بوو.
ڤینتسیا هەزار ساڵە دەمی ناوە بە ئاوەوەو
تێر ئاو نابێ!
ئەم تینوێتییە تینوێتیی عەشقی شارە بۆ چاوی ئاو.
لێرە زەوی ئەوەندە تەنگەنەفەسە

گوێت لە خیزەخیزی سنگی باریکەڕێو سنگی بەردە.
لێرە وشکانی لەبەر ئاو جێگەی نییە
نە خۆی هەڵگاو نە ڕابکا!
لێرە عاشق تەڕە وەکو گیاوگوڵی ئاو
لێرە شیعر تەڕە وەکو نەورەسی ئاو.

ئەگەڕێی بەڵام تۆ دوو کەرتی دوو جەستەی
دوو سەری‌و چوارچاوی، سەرێکت ئەوەتا لێرەیەو
گلۆڵەی سەرابی کۆچێکەو ئەوی تر وا لەولا
کاکۆڵی دووکەڵەو لە لەشی دیرۆکت هەڵئەسێو
لە گەرووی دەربەندو شاخانتا گێژەنی مەراقەو
یان پێچکەی کۆستێکەو بەردەوام خول ئەخوا.
دوو سەری، سەرێکت جانتایەو دوور ئەڕواو
ئەویتر بەردێکی ئەولایەو لە سەری شاخەوە
بەرەوخوار تل ئەخوا. چوارچاوی. دوو چاوت
ئەوەتان لێرەن‌و وەك ڕۆخ‌و بەستێنی ئەم
شارە ئاوییە تەڕتەڕن‌و قووڵایی دەریاچە
زوخاوێ ئەپێون‌و دوو ئاسۆن لە وەرزی
فرمێسکدا ئەوەرێن، دوو چاوی ئەولایشت
دوو گردی گەرمێنی ڕەشتاڵەن وەك
پێستی مەندەلی قرچەقرچ ئەسووتێن ئەگەڕێی
بەڵام تۆ سێبەری پەرتپەرتی، لە جەستەت

ون ئەبی لێرە بی یان لەولا هەر شەوی کەرت
کەرتی. تۆ مێژووی ونبوونو کوشتنی، ئاشکرا
بکوژرێی "موعینی"ت بە دزیش بکوژرێی
"زوبێحیت" تۆ مێژووی ونبوونو کوشتنو
خۆکوژیت. ئەگەڕێی بەڵام تۆ تارمایی
هۆشێکی پەرتپەرتی، ئەو کاتەی کە لێرە وای لە
ناو شیعرێکی ئەوروپای ڕووناکدا
هەمان کات لەولایشیو وای لەناو
گریانی شیعرێکی تاریکدا. ئەو دەمەی تۆ لێرە
لە ژووری شووشەداو لە نێوان گوڵاندا دانیشتووی
هەمان کات لەولایشیو کەوێکی ڕەشپۆشی
ناو پرسەی کاولاشی. هەمیشە تۆ جەستەو
تۆ بەژنی خاچێکی چوار پارچەیت. ئەو دەمەی
کە لێرە ئەبیتە بارانو ڕەهێڵەو ئەنووسیت.
هەمان کات تۆ لەولایت، یان شەختەی
سەقزیت یان ژاڵەی ماردینی یان تەمی
قامیشلیت. یان ئاگری کەرکووکیت.
تۆ مێژووی ونبوونو کوشتنو خۆکوژیت.
بە شیری ذوالفقار گەردنت هەڵفڕێ بۆ لای خوا
سابلاخیت. بە پرچی ژنێکی جوانکیلەی
مودێرن هەناسەت ببەستن دەرسیمیت،
بە لۆلۆی پشتێنی خەلیفەی ئەمەوی

نەورۆزت هەڵواسن، حەسەکەیت. بە ژەهری
چەپڕەوو ڕاستڕەوی جیهانیش ڕەق ببی
هەڵەبجەیت. کە خۆیشت خۆتت کوشت
ئەوساکە تابووتی درێژی هەر هەموو وڵاتیت!

ئیستاکە تۆ خاچی ژەهراویی ئەنفالی
ئیستاکە تۆ چاڵی قاقڕی ئەنفالی
تۆ زیلی ڕیزبەستووی بەردەمی جیهانی کوێریتو
تۆ بارەی دێهاتیو کرووزەی بەفرێکی ناو سەحراو
شیوەنی شۆڕەبیو
ڕازنامەی دڕاوی لای خوایتو
کۆچێکی ناو دنیای نەهاتی.
ئەنفالە
ئەنفالە
ئەنفال!
ئەنفالی سیروانی جەستەمە بەرەوخوار
بە خوێنو لیتەوە بە قژو گژوگیاو
بە ڕیشی مەولەویو بە باڵی قرتاوی
شیعرمو بە هۆرەی قوڕاویو
بە وەلی مەقامی کوژراوو
بە شەمی خنکاوی بەستەوە..
بەرەوخوار.. بەرەوخوار.. بەرەو خوار

ئەنفالی گریانی ڕووناکیو ئەنفالی بارانە
ئەنفالی خاکنامەو
ئەنفالی جریوەو
ئەنفالی ژیانە!

شاخ ئیستە پیاوێکە کەوتۆتە سەر چۆكو
سەری خۆی خستۆتە ناو لەپی دەستیەوەو
بەردەوام تەماشای مردنی خۆی ئەکات.
کەژ ئیستە ژنێکە درەختی قژی خۆی ئەڕنێو
بەردەوام زریکەی باهۆزەو، بە بەردی بن بنار
لە سنگی خۆی ئەدات. دەشت ئیستە ئەسپێکی
سەوزباوی گلاوە. بەردەوام نووزەی دێو
گژوگیای یاڵی خۆی ئەخواتو کوڕژنی برینەو
لە خۆری سوورباوی گەرمێندا هەڵئەکات.

درێژیی ئەم خاچی ئەنفالەو
درێژیی باشووری مەسیحم وەك یەکە
پانایی ئەم خاچی ئەنفالەو
پانایی باشووری مەسیحم چوون یەکە

گوناهی ئەزەلیی کام زەویو ئەستێرەی گومڕاهو
کام سزای ئەبەدیی تاوانم، بۆ ئەوەی هەمیشە هەڵقرچێم؟!!
کام خواوەند غەزەبی لێگرتووم بۆئەوەی هەر تاپۆی

نامۆیی‌و ته‌نیایی‌و شه‌وبم‌و بۆئه‌وه‌ی نه بمرم نه بژیم؟!
کام خواوه‌ند خاوه‌نمه‌؟! نازانم. کام شه‌یتان خاوه‌نمه
نازانم. نه ئاسمان گوێ ئه‌گرێ له خوێنم‌و نه دنیاو
نه دادو نه یاساو نه زه‌نگی کلێسه‌و نه قوببه‌ی
مزگه‌وت‌و نازانم من به کێ‌و من به چی سوێند بخۆم!
کێ په‌ناو کێ دالده‌و کێ که‌سمه‌؟! نازانم. من ئیستا
شاخێکی بێ سوێندم. سوێندی من دووکه‌ڵه‌و قسه‌ی
من خۆڵه‌مێش! هاوارم هه‌ر خوێنی مه‌یومه‌و
هه‌ر کۆچی سه‌ره‌ولێژ. ئه‌وه‌ته‌ی کۆچ هه‌یه کۆچ ئه‌که‌م
ئه‌وه‌ته‌ی گڕ هه‌یه ئه‌سووتێم.
ئه‌وه‌ته‌ی ئاو هه‌یه ئه‌خنکێم.
ئه‌وه‌ته‌ی تیغ هه‌یه قوربانیم.
ئه‌وه‌ته‌ی خاك هه‌یه بێ خاکم.
ئه‌وه‌ته‌ی شاخ هه‌یه من تلۆر ئه‌بمه‌وه‌و
ئه‌وه‌ته‌ی دار هه‌یه لێی ئه‌درێم!
من له پێش مووساوه ئاواره‌م.
پێش مه‌سیح من خاچم.
پێش قوڕه‌یش من زینده‌به‌چاڵ‌و
پێش حسه‌ین من سه‌ری بڕاوم!
ئه‌نفاله
ئه‌نفاله
ئه‌نفال!

تەماشای خۆڵ بکە.. بێژراوەی ئەشکەنجەی ساڵانم.

تەماشای دەوەنکە.. ترسی من چۆن ئەڕوێ.

تەماشای گردۆڵکەی ڕووتەنکە

بەختی دێم چی ئەڵێ!

تەماشای پەیکوڵکە.. ئازاری ڕسکاوم.

تەماشای وێرانەی دەنگم کە.. قەسیدەی ڕووخاوم.

تەماشای ئەوینی چۆڵم کە.. کۆچڕەوی منو یار.

تەماشای مەراقم.. ئاوێنەی وردوخاش.

تەماشای خوێنم کە.. گوڵجاڕی کوژراوم.

ئەو بازنەی کەوتۆتە ناو ئەو وەردەوە

ئیستە باسی دەستو پەنجەی نازدار ئەکات

بۆ ئەو قومرییە بێوەژنە.

ئەو گوارەیەی کەوتۆتە ناو ئەو ئاوەوە

ئیستا باسی گوێو لاملی کاڵێ ئەکات

بۆ ئەو ماسییە بێوە پیاوە!

ئەو دەفتەرە قوڕاوییەی لە لاڕێدا

"با"یەك ئەیلاوێنێتەوە

ئیستە باسی چاوەکانی کیژێ دەکات

بۆئەو بەردە سك سووتاوە.

ئەو کوڵەباڵەی بە تەنها هەڵواسراوە بەو دارەوە

ئیستە باسی شانو قۆڵو گۆرانییەکانی شوان ئەکات

بۆ ئەو لقە چڵ کوژراوە.

ئەو بێشکەیەی لە ناوەڕاستدا لەت بووەو
کەوتۆتە قەراغ ئەو چەمە
ئیستە باسی گڕوگاڵو زەردەخەنەی بڵباس ئەکات
بۆئەو شەپۆلە زامدارەی
کە بە هێواشی لێی ئەدات!

ئەنفالەو فڕۆکەی ئاسمانی ئافاتو
ئەنفالەو بای ژەهرو
بەهاری مەرگەسات.
ئەنفالەو شارێکی بە پێوە خنکاوو
پێنج هەزار مۆمیای کارەسات.
ئەنفالەو هەڵەبجە
هەڵەبجەو هەڵەبجە
هەرچی فرمێسکێ تا ئیستە کە داروبەردم ڕشتوێتی
لە لایەکو.. ئەم فرمێسکەیان لە لایەك
ئەم فرمێسکە نیشتمانی تیا نوقم بوو.
هەرچی مردنێ تا ئیستە کە شاخو داخم دیوێتی
لە لایەکو.. ئەم مردنەیان لە لایەك
ئەم مردنە سی ملیۆن خەمی داچڵەکاند.
هەرچی کوشتنێ تا ئیستە ئەم جەستەیەی من دیوێتی
لەلایەکو. ئەم کوشتنەیان لە لایەك
ئەم کوشتنە مردووەکانیشی ڕاپەڕاند.

هەرچی غوربەتی شیعرمە لە لایەك و
ئەم غوربەتەیان لە لایەك.. ئەم غوربەتە لە ڕۆژێکدا
هەموو دنیای بە خاچی ئاوارەم ناساند!
هەرچی شارانمە لە لایەك.. ئەم تاقەشارەیش لە لایەك
تاقەشارێ کە لە تروکەی چاوێکی شانزەی مارتا
لە یەك هەناسەی گیراوی ئەم سییەدا
بوو بە پایتەختی ئازاری وڵاتەکەم
باسی چی بکەم؟!
باسی چی بکەم؟!
چۆن سەوزەگیا ئەبێ بە تابووتی گوڵان؟!
چۆن بەهار ئەبێ بە کفنی سێ وەرزی تر؟!
چۆن چرکەیەکی ژەهراویی ئەبێ بەساڵ؟!
شەقام چۆن ئەبێ بە گۆڕی سەردانەخراو؟!
چۆن منداڵ خۆی، ئەبێ بە بووکەشووشەکەی؟!
باسی چی بکەم
گمە چۆن ئەبێ بە بەردو
باڕە چۆن ئەبێ بە دارو
حیلە چۆن ئەبێ بە هەورو
هاژە چۆن ئەبێ بە چەوو
هاوار چۆن ئەبێ بە لەو
هەوا چۆن ئەبێ بە دوژمن
باسی چی بکەم

ئەو ساوایە بۆ تێر ناخواو دەم هەڵناگرێ لە مەمکی دایك؟!
ئەو باوکە بۆ ئەو پارووە قووت نادات‌و دەس داناگرێ؟!
ئەو خوێندکارە بۆ پەڕەیەکی تازەتر ناکاتەوە؟!
ئەو شۆفێرە بۆ سلفەکەی لێنادات‌و ئیتر بڕوات؟!
ئەو حەماڵە بۆ کۆڵەکەی هەڵناگرێت‌و ئەو چەقی ڕێیە بەرنادات؟!
ئەو کیژە بۆ (چا)کەی بەردەمی تێکناداو بیخواتەوە؟!
ئەو کۆترە بۆ باڵەکانی کردۆتەوەو هەڵیشنافڕێ؟!
ئەو کچە بۆ ئەو سەتڵە ئاوە هەڵناگرێت‌و لێی ئەڕژێ؟!
ئەو ماچە بۆ تەواو نەبوو؟!
ئەو تەشییە بۆ خولێکی تری نەخوارد؟!
تاکێ گۆرەوی بوو بە چی‌و لە پێ نەکرا؟!
ئەو ئیمزایە بۆ هەر نەکرا؟!
ئەو جانتایە هەر دانەخرا؟!
دەرگایەك بۆ پێوە نەدراو
میلی ڕادیۆیەکی ناو کۆش
هەر بانەدراو هەر بانەدراو هەر بانەدرا؟!

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی
تۆ ئیستاکە ژەهرستانی وڵاتێکی تاق‌و تەنیای
لە هەواتا ژەهر ئەفڕێ‌و
لە زەویتا ژەهر ئەڕوێ‌و
لە نانتا ژەهرت ئەدەنێ‌و لە ئاوتا ژەهرت ئەدەنێ‌و

دنیایش وەکو ژەهراوییەك
دوای دەمو لووت هەڵبەستنی
دووراو دوور دێ بە پیرتەوەو
قەرەوێڵەی پەڕکراوی
ناو ژوورێکی گۆشەگیرت پێ ئەبەخشێو
تۆ خاچێکی ژەهراویتو
بۆیە شیعرت تووك بە سەریەوە نەماوەو
بۆیە وشەت وڕوگێژو
ناتوانی هەستیتە سەرپێو
ئیستا لەناو عەرەبانەی کەمئەندامو هاندیکاپی
دەوڵەتاندا دانراوی!!

نامۆ زۆرن. تەنیا زۆرن. برین زۆرن
خاچ زۆرنو مەسیح زۆرن.
بەلاّم تۆ ئیستا شاهەنشای تەنیاییو نامۆییو برینی.
بەلاّم تۆ ئیستا دیارترین مەسیحی سەر خاچو
دیارترین ئەشکەنجەی زەمینی.

هەڵەبجە کوژراوەو
تۆ پرسەت لە شیعرا داناوە.
هەڵەبجە کوژراوەو
خەیاڵت ڕەشپۆشەو

دووکەڵیو ئەڕۆیتو
ئەمجارە گریانت هەڵئەفڕێو
ئێوارەی هۆنراوەیش
شەلاڵی خوێناوە!

هەمدیسان ئێوارەی بارانەو، ئێوارەی تەڕبوونی
ئەگریجەی خەمانەو، ئێوارەی کەژاوەی زایەڵەی
یارانەو، ئێوارەی ئازاری سوورمەچن.
هەمدیسان دەلێ لێی گریانەو نمنمی
دڵۆپی زەنگیانەی چاوانەو، تاوتاوی سەر
هۆبەی دواکۆچی عاشقانەو هەمدیسان
دەلۆلۆی بارانەو هەنسکی تەنیایی شیعری من.
هەمدیسان بارانەو ئێوارە. بارانو غەریبیی پێکەوە
ئەبارێن. شیعرو کۆست پێکەوە دەس لە مل
ئەگەڕێن. بارانەو تەپو نم ئاوێتەی هەڵەبجەی
گیانمەو بارانەو تاڵ تاڵی ڕێزانی تێکەڵی سیروانی
ژانمەو هاژەکەی: شیعری من.
هەمدیسان بارانەو ئەبارێ، پێنج هەزار ئەستێرەی
کوژراوو پێنج هەزار ڕەنگاڵەی کوژراوو پێنج هەزار
پەپوولەی فرمێسکم بەسەردا ئەبارێ!

من گردی گوڵانمو ئەرخەوان بەسەرما ئەبارێ.

**من کۆچم‌و برژانگی ژیلوانم بەسەردا ئەبارێ**
**هەمدیسان بارانەو ئێوارە. هەمدیسان**
**دەلۆلۆی بارانەو هەمدیسان دەلێی لێی گریانەو**
**حەوشەکەی کۆتەڵیش.. شیعری من.**
**بارانەو.. ئێوارەو.. تەنیاییت ئەبارێ**
**چون هەوری، ناو ڕیشی، مەولەوی ئەبارێ.**

**خۆت ئەکەیت بە باڕی بچکۆلەی سەر سووچی**
**شەقاما، گۆشەیەك. کە تیشکی شین باوی**
**چرایەك -وەك خێل بێت- نیواونیو لێی**
**ئەدات. ئەیگریت. تۆ ئیستە بارانی سەرومل**
**شینیت‌و، بەرەوخوار، ئینجانەی تاریکیت.**
**ترووسکەی ئاگری نێو پەنجەت ناو بە ناو دوو لێوی**
**گوڵی شین ئاڵ ئەکات. بەرانبەر گۆشەکەت،**
**تابلۆیەك ئەتبینێ. ڤان کوخەو سلاوت لێئەکات.**
**ئەچیتە گێژەنی تابلۆوە، بایەکی نارنجی تۆ ئەبات.**
**ئاسمانی پایزەی تابلۆکەو دەروونت چوون یەکن.**
**ڕەنگی زەرد ئەپۆشیت. ئەبیتە وەرزێکی غەمگینی**
**جۆدرەو. ئەمجارە وەك باکەی سەر زەڵم**
**هەڵئەکەیت. دواتریش ئەبیتە بەردێکی بەردەمی**
**تاڤگەو پرشەپرش گریانی ئاوەکەی لێت ئەدات.**
**وەك دووکەڵ دێیتەوە باڕەکە. وەك ماری**

خاچەکەت پێچ ئەخۆیت. تۆ شیعری گەڕیدەی
خەیامیو ئەمجارەیش پەرداخێ مەراقی سووری تر
هەڵئەدەیت. لە تەیری پێوەبووی داو ئەچیت
تەماشای چواردەوری خۆت ئەکەیت. بۆ چاوی دەوروبەر:
تۆو کورسیو تۆو مێزو تەپڵەكو،
دووکەڵی جگەرە یەك شتن. هەست ئەکەیت کات
وێنەی مشارێ ئامادە وا لەسەر گەردنت چی ئەکەیت؟!
ڕابکەیت بە شوێنتا ڕائەکاو تۆ هەردەم ڕێبواری
نێچیرو نیشانەیت. کات هەردەم سێلاوەو
تۆ پووشوو. کات هەردەم ئاگرەو تۆیش سووتوو.
کات هەردەم زیندووەو تۆیش مردوو. ئەمجارەیش
پەرداخێ مەراقی سووری تر هەڵئەدەیت سەیر ئەکەیت
ژنێکی شەست ساڵەی گوڵفرۆش، کالاشین،
شیعرێکی چاوکاڵەو هاتۆتە بەردەمی مێزەکەت،
وەستاوە. شینپۆشی گوڵفرۆش، وا دیارە
هەر خۆیشی زەمانێ گوڵ عەشقی شین بووەو
وا ئیستەیش بای عومری کڕێوە لێی داوە. ئەم
ژنە لە کۆترە باریکەی ترساوی
دوای گرمەی هەور ئەچێ. سیمایشی لە سیمای
مۆم ئەچێ ئەو وەختەی ئەسووتێ. ئەم ژنە
وەك ئیستەی شۆڕەبیی گوێ زەڵم غەمگینەو
بێدەنگەو لارەمل وەستاوە. تەڵ تەڵی

گوڵ مێخەك ئەوانە لێی ئەكرن دڵدارنو
ژوانیان بۆ ماچی شین باوی ئەمشەوی ئەم
بارە داناوە. تەڵێكی لێئەكرێ. ئەو ئەرواو
ون ئەبێ. گوڵ مێخەك ئەخەیتە بەردەمت.
تۆ هەر خۆت ئەزانیت تەنیایتو نە ژنو
نە كچو نە یارو كەس نایە. تۆ هەر خۆت
ئەزانیت ئەم گوڵە سیس ئەبێت ئەمرێتو
كەس نایە. تۆ هەر خۆت ئەزانیت. دەستێكی
تر نییە ئەم گوڵە وەربگرێو كەس نایە.
تۆ پەنجە ئەخەیتە ناو قژیو گوڵەكە ناوئەنێی
هەڵەبجە. تۆ ئیستە هەڵەبجەی گوڵ مێخەك بۆن
ئەكەیت. ئەو وەختەی شەپۆلی هێواشی تانگۆیش
هات هەڵئەسیت. وەك چڵی چنارێ بای
هێور لێی بدات دەست ئەكەیت بە سەما.
تۆیش یاری خۆت هەیە تۆیش جووتی خۆت
هەیە: گوڵ مێخەك ناوقەدی باریكی ئەگریتو
ئەویش سووك سەری خۆی ئەخاتە سەرشانتو
وەكو دوو باڵداری لای كانی عاشقان وەكو
دوو لاولاوی ئاوێزان دەست ئەكەن بە سەما.
ئەچنە ناو جۆلانەی ڤالسەوەو خەونێكی
پەمەیی دوور دوور دوور ئەتانبا
وا ئیستە هەڵساویو گوڵ مێخەك لەگەڵتا

تێکئاڵاو تۆ بۆنی لاملی ئەکەیتو ئەویش هەر
بارانی کەژاوەی بەسەرتا دائەکاو دوا شیعرت
تەڕئەکا. کات ئەڕواو گوڵ مێخەك لە تەکتا.
کات ئەفڕێو گوڵ مێخەك فرمێسکە لە چاوتا.
تا وەختێ کازیوە لە دەرگای باڕئەدا،
تا وەختێ شەقامی خەواڵوو ئەبینن‌و
ڕۆژباشتان لێئەکا. ئەڕۆن‌و ڕەت
ئەبن بەرەو ژوور ئەبنەوە. هەتاکو ئەگەنە
ئەو شوێنەی پەڵەیەك خوێنی وشك، خەرمانێ
لە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ، کۆمەڵێك بنەمۆم،
هاوارتان لێ ئەکەن: پیادەڕەو، دوا شوێنێ
کە پاڵمێی لێ نووستو دوا هەوار کە ئاشتی‌و
ئەوین‌و بارانی لێ کوژرا. ئەوەستی. لەوێدا
ئەوەستی‌و هەڵەبجەی گوڵ مێخەك، ئەدەیتە
دەست خوێنی بێڕەنگو دەست مۆم‌و
دەست پاڵمێو بە تەنیایش خۆت لە تەك
گریانی دواشیعر، خاچێکی وێڵێتو هەمدیسان
کۆچ ئەکەیت.

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی..
تۆ خاچی گوڵ تێئاڵاوی
ئەمجارەیان خاچەکەی تۆ وەك دەموچاوی

ئازادیی پێئەکەنێ.
ئەمجارەیان خاچەکەی تۆ وەکو پرشنگ
لە ڕووباردا.. سەما ئەکا..
ئەمجارەیان خاچەکەی تۆ
لوتکەی شاخ ئەکا بە زوڕناو
شەقام ئەکا بە شمشاڵو
فووی پیا ئەکا!
ئەمجارەیان خاچەکەی تۆ
دەشتو دەر ئەکا بە تەپڵو
ئاو ئەژەنێو بەرد لێئەدا!
ئەمجارەیان خاچەکەی تۆ..
بووە بە داربەڕووی شایی
قریوەی سەوز لێئەداو
دەستەسڕی سەرچۆپییەکەی ئەستێرەیەو
دەسی دۆی ئەوینی سپی وا لە دەستا!
مارت هەر مانگی بەهارێکی گەمژە نییە.
مارت هەر مانگی ئاوسبوونی دارستانو
خوێنجمانی باخان نییە!
مارت هەر مانگی ئارایشتی ڕواڵەتی زەردو سوورو
پێکەنینی تەفرەدەری کەسکی گەڵاو لەنجەولاری درۆزنەی
گوڵزار نییە.
مارت هەر مانگی زەماوەندی شووکردنی

کچەکانی نەورۆز نییە.

مارت هەر مانگی گەڕانەوەی گەڵا نییە بۆ لای درەخت.

مارت هەر مانگی شەتاو نییە بۆ هەڵپەی ماچ.

مارت هەر مانگی خشڵ‌و تارای مێرگەکان‌و هەر ژنێکی

قژ درێژی بەر ئاوێنەی گۆمەکان‌و هەر لەشێکی گۆشتن نییە.

لە مارتا خوێنیش ئەپشکوێ

لە مارتا کسپەیش سەوز ئەبێ‌و گۆپکە ئەکا.

لە مارتا داری ئەشکەنجەیش گەڵائەکا.

لە مارتا ڕنوی مەراقیش ئەتوێتەوەو

زام ئەتەقێ‌و

مێژووی تۆڵەیش هاژە ئەکا!

مارت هەر مانگی بەهارێکی گەمژە نییە

مانگی زاوزێی شیعریشە.

مانگی هەڵپەڕکێی بەردیشە.

مانگی سەیرانی خەمیشە.

مارت هەر مانگی مەرگەوەڕو مەرگ نیە.

مانگی گەڕانەوەی هەموو شەهیدانە بۆماڵەوە.

مانگی هاتنەوەی مەولەوی بۆ هەڵەبجە.

مانگی هاتنەوەی نالی- شە بۆ خاکوخۆڵ.

مانگی بە یەکتر گەیشتنەوەی وەلی‌و شەمە.

مانگی بە یەکترگەیشتنەوەی دڵدارانی کچ‌و کوڕی ناو ئەنفالە.

مانگی هەمدیسان هاتنەوەی ئەسپەڕەش‌و

حیلەی گەلیو کەوی سووری بادینانە.

مارت هەر مانگی بەهارێکی گەمژە نییە..
لەم مانگەدا خەوی قوربانیش دێنە دی.
لە سەرەتای ئەم مانگەدا بەر لەوەی کانی بتەقێ
مێژووم تەقی.
بەرلەوەی گوڵێ بپشکوێ خوێنم پشکووت.
بەرلەوەی دارێ گوڵ بکا سێدارەکانم گوڵیان گرت.
لە سەرەتای ئەم مانگەدا ملی زەمانم وەرگێڕا بە لای خۆمداو
وەرزی ساڵو ڕۆژژمێرو زەویم گۆڕی.
لە سەرەتای ئەم مانگەدا بە کلیلێکی ڕانییە
دەرگام لەسەر یەکەیەکەی مانگو ئەستێرەی گیراوو
خەونی زیندانیم کردەوە!
لە سەرەتای ئەم مانگەدا بۆ یەکەم جار دوای هەزار ساڵ
توانیم دە ڕۆژ گۆیژە بەرمە ناو کەرکووکو
ڕەحیمئاوا بێنمە خانووە قوڕەکانی سلێمانی
شەتڵی ماچی پیرەمەگروون لەناو قەڵادا بڕوێنم.
لە سەرەتای ئەم مانگەدا
پیس لە ناو چەمی، هەستاوی، مندا نەما!
لە سەرەتای ئەم مانگەدا کۆتێك بوومو من بە تەمای
ڕاپەڕینی دوو پەنجەمو سێ پەنجەم بووم
لە دە پەنجەی هەردوو دەسما

کەچی دەستم لە دووانەوە بوون بە سەدو بە دووسەدو
هەزاران پەنجەم ڕاپەڕین.
لە سەرەتای ئەم مانگەدا
من تینوێتی مێژووی کاکی بە کاکی بووم
چاوەڕێ بووم سیروانێك و دوو سیروان و
چەم و دوو چۆمێك ڕاپەڕن
کەچی هەرچی شەقامێك و کۆلانێك و ڕێیەك هەبوو
لە جەستەمدا، ئەوانیش بوون بە سیروان و
هەموو پێکەوە ڕاپەڕین.
لە سەرەتای ئەم مانگەدا:
من دۆڵی کپی شەوێکی نەیار بووم و
چاوەڕێ بووم گرمەژنی چەند ئەسپێکم بمهەژێنێ..
کەچی هەرچی زۆرك و یاڵ و گردم هەیە
بوون بە ئەسپ و
پڕ بە هەموو وڵاتەکەم حیلاندیان و
هەموو پێکەوە ڕاپەڕین.
لە سەرەتای ئەم مانگەدا
من شۆڕشی دوودڵ بووم و
چاوەڕێ بووم هەر گاشەبەردی نێرینە و
داری ڕیشدار هەڵسنە سەرپێ و مەرگ هەڵبڕن.
کەچی لە زۆر جومگەی لەشما
پێش گاشە بەردی نێرینە و داری ڕیشدار

ژنە چناری وڵاتو ژنە گوڵو
ژنە سنەوبەر ڕاپەڕین.

لە سەرەتای ئەم مانگەدا
من دەستیشم لە زۆر ئەندامی بێ خێرو
ناپەسەندی ئەم جەستەیەی خۆم شتبوو
کەچی سەرلەنوێ ئەوانیش ژیانەوەو
لەبەر تاڤگەی عەشقدا خۆیان شتو
لەگەڵ ئەندامانی پاکی لەشما هەموو پێکەوە ڕاپەڕین.
لە سەرەتای ئەم مانگەدا
خوێنی یەکگرتووی گەلەکەم وای پێوتم:
گەر دڵداری بەرد بیەوێ شاخ هەلگرێ
هەڵی ئەگرێ.
گەر عاشقی ژین بیەوێ مەرگ بکوژێ
هەر ئەیکوژێ!
گەر دڵدارانی سبەینێ بیانەوێ
ئایندە بێننە ئێستاوە
هەر ئەیهێنن!
گەر عاشقی ئاو بیەوێ
"وان" بەرێتە لای "خانەقین"
ڕۆژێ ئەیبات!

گەر عاشقی چاوانی کەسکی ئازادیش

وەك سەرەتای ڕۆژانی مارت
بیەوێ خۆر داگرێتو
لە ستوونی بەژنی مێژووەی ببەستێو
لەسەر ئارارات هەڵێکات
ڕۆژێ ئەیکات.
ڕۆژێ ئەیکات.
ڕۆژێ ئەیکات!
بەڵام چۆن گوڵ لەسەر پەنگر دائەنیشێو
بەڵام چۆن خاچ دوور لە مارو دوور لە ئازار
ئەسرەوێتو
بەڵام چۆن "با" بێ ئەشکەوتی ژانو هاوار
هەڵئەکاتو
بەڵام چۆن من بێ کارەسات
تەنیا بمو
کە خۆم کۆچ بم
ئیتر چۆن کۆچ لەم ڕێگەیەم ئەبێتەوە.
کە من خۆیشم مەسیحێکی ئەم دەورە بم
ئیتر چۆن خاچ لە کۆڵ شانو
لە کۆڵ مانگو
لە کۆڵ ساڵم ئەبێتەوە.

تۆ خاچی مار تێئالاوی

تۆ پشکۆی سەرمابردەڵەو
تۆ هەتاوێکی تاریکو
تۆ تەنیایەکی ئاپوورەو
تۆ هەوایەکی خنکاوی!

لە پێشدا کارەسات تۆپەڵێ بەفری ڕەش بچکۆڵە
ئەوەندەی سەرم بوو
کارەسات بە ساڵدا خل بۆوە.. خل بۆوە
تۆپەڵە بەفری ڕەش داگەڕاو داگەڕا..
بە شەوی ڤیریندا داگەڕا..
بە خوێندا داگەڕا
بە ژەهرا داگەڕاو تل بۆوە..
زیندانو سێدارەی لە خۆوە هەڵپێچاو تل بۆوە
هەڵەبجەی هەڵمژیو ئەنفالی هەڵمژیو تل بۆوە..
گەورە بوو.. گەورەتر
من ئیستە سەرێکم پێوەیە لە بەڵا گەورەتر
من ئیستە دەستێکم پێوەیە لە ئازار درێژتر
من ئیستە چاوێکم پێوەیە لە زەریا بە ژانتر
من ئیستە نامۆییم لە شەختەی قوتبەکان ساردترەو
من ئیستا سووتانم لە دۆزەخ گەرمتر.

نالیی ڕۆی. بە دوایدا شارەزوور کۆچی کرد، وێڵ ئەبوو

حاجی ڕۆی. بە دوایدا شاری کۆ کۆچی کرد، وێڵ ئەبوو
مەولانەیش کۆچی کرد. بە دوایدا تانجەرۆ کۆچی کرد، وێڵ ئەبوو
چی ماوە؟!
وا ئیستەیش نیشتمان خۆی ئەڕواو کۆچ ئەکاو
شەهیدان بە دوایدا وێڵ ئەبن!

من ئیستە کۆچێکم ملیۆنێ سەرمەو
دوو ملیۆن باڵمەو هەر ئەڕۆم.
بەرەو ژوور من ڕێچکەی ترسێکی ڕەشپۆشی
هەڵاتووی ناو بەفرم، بەرەو ژوور هەر ئەڕۆم.
بەرەو شاخ من ڕیزی سیخناخی درێژی فرمێسکمەو
سەرێکم لە چاوی ئەشکەوت داو
سەرێکم لە چاوی شەقامداو هەر ئەڕۆم.
من ئیستە کۆچێکم لانکەمەو گۆڕەکەم لە کۆڵداو
بێ ئەوەی بزانم بەرەو کوێو بۆ ئەڕۆم؟. هەر ئەڕۆم
من ئیستە ئازادیی بێ سەرمەو
من ڕێگای ون بوومەو
من سەرمای مێژوومەو
کۆچێکی بێ مەنزڵ.. هەر ئەڕۆم!

تۆ باران یارت بوو، تۆ باران ژێی تارو
تۆ باران جۆلانەی خەیاڵو تۆ هەور پریاسکەی

کۆچت بوو کە شیعرت تێ ئەکرد. بە تاڵی ڕێژنەی
قژی ئاو برینی خۆت ئەبەست. یەکەمجار باران بوو
نەهێنی توانەوەی عەشقت‌و تەنیایی بەیتە دەست.
یەکەمجار باران بوو، ئەوینی چاوشینی کچێکت بۆ
بێنێ‌و ئەستێرە بە هێشوو بێنێتە ژوورەکەت.
تۆ باران یارت بوو. وا ئیستەیش نەیارەو سێلاوی
خنکانەو گریانی شەست کەری کۆچەکەت.
بێدەنگیی ناو شاخان کۆچیان کرد بۆ لای خوا،
ئەوکاتەی کە کۆچی بە گرمەی تۆ گەیشت.
هێوریی مانگەشەو لە گۆمدا، خەیاڵی
ڕۆمانسیی درەختی ناوکۆشی جۆگەکان
کۆچیان کرد بۆ لای خوا ئەوکاتەی
کە کۆچی بە ناڵەی تۆ گەیشت.

بەرد ژانی سەختی خۆی بیرچۆوە. کە ژانی ئێوەی دی.
زەمینیش کرووزەی پەلکەگیای بیرچۆوە..
ئەو وەختەی منداڵی ئێوەی دی.

خەیاڵی دووربینی دوورە دار
لە کەژی عاسیدا
ئەگەیشتە ئەو ڕۆژەی بیگەنێ‌و
بیکەن بە: چرپایەك بە مێزێك

کورسییەك بۆ شیعرو بۆ چیرۆك.
بەلام قەت
خەیاڵی دووربینی دوورە دار
بۆئەوە نەئەچوو لێرەدا بیگەنێو
بیکەن بە: دارە مەیت
بۆ دڵدار!

خەیاڵی سەوزەگیای بنارێ دوورە کێو
ئەگەیشتە ڕۆژگارێ دابێتو بۆ ژیان
بیکێڵن بۆ عەشقی گەنمو جۆ..
بەلام قەت خەیاڵی سەوزەگیای بناری دوورەکێو
نەئەچوو بۆئەوەی لێرەدا
ببێتە گۆڕستان
بۆ چاوو بۆ پەنجەو
بۆ قژی مندالان!

تۆ خاچی مار تێئالاوی
تۆ سەفەری کارەساتیو
قاچی کۆستیو کۆچی چاوی.

هەنووکە من لێرە لە شاری هەزاران دوورگەدا
بەلەمی شیعرێکی شەوانەی بێ چرام. ڕێم کوێرو بەندەرم بزرە.

من لێرە لە شاری هەزاران دوورگەدا
ئیستاکە بەلەمی هەڵەبجەی خنکاوم‌و فەنەری کوژاوەی
بورجێکی ماندووە ئەم سەرە!
من لێرە لە شاری هەزاران دوورگەدا
سێوێکی "ئالان"ی غەریبیی سەر ئاوم‌و
شەپۆلی نامۆیی خۆم ئەمبا.

هەنووکە من لێرە. لە "Mellanbyplan"
ژمارە 23 لە قاتی دووەمی خانویەك
گەڕەکی "Rinkeby"
گەڕەکی ئاوارەی تێکەڵ‌و فرمێسکی تێکەڵ‌و
زمانی تێکەڵی غەریبان..
هەر وەکو ئەستێرەی لێقەوماو لە شەوی باراندا
بەرانبەر "TV"یەك دانیشتووم
هەمووتان ئەبینم.. ڕووباری لێڵ‌و پێچ ئەخۆن
بەرەو ژوور ئەبنەوە
هەمووتان ئەبینم.. وەك چرای قوڕاوی‌و
وەك ئەسپی قوڕاوی‌و
درەختی قوڕاوی‌و
کارژۆلەی قوڕاویی بەرەو ژوور ئەبنەوە.
من چاوم بە سواری فرمێسکی باڵداری. فڕیوە بۆ لاتان.
من جەستەم بە سواری فڕۆکەی خاچەکەی. فڕیوە بۆ لاتان.

تەماشام ئاودامان تەڕتەڕە
هەر وەکو پلووسکی باڵاتان.
من ئیستە وشە نیم. من ئیستە بەتانییە شینەکەی
ئەو ژنەم لە قوڕدا چەقیوەو ناگاتە سەر هەوراز
من ئیستە قەڵەم نیم. من ئیستە ئەو نانەم
هەڵئەدرێو هەزار دەست بۆی ئەفڕێو
هەر بە ڕێی حەواوە ئەخورێتو ناگاتە سەر زەمین.
من ئیستە شیعر نیم. من ئیستا چاوانی ئەو ژنەم
کە پڕن لە تەمو لە ڕەنگو لە دەنگی هەڵوەرین.
من ئیستە شێرکۆ نیم. من ئیستە گۆریچەی زارۆکم
لەو کێوەو، من ئیستا دوو لێوی ئەو کیژەم
وەك مێژووم کەوتۆتە هەڵلەرزین.
من ئیستە شێرکۆ نیم. من ئیستە:
پێڵاوی جێماوی ناو قوڕمو
نایلۆنی دڕاوی نێوانی دوو بەردمو
گریانی ون بوونمو
خەوێکم کوژراوو
دەستێکم ئیفلیجو
ڕووبەری بەهاری کۆستێکم زۆر بەرین.
هەروەکو ئەستێرەی لێقەوماو لە شەوی باراندا
هەروەکو پەنجەرەی لێقەوماو لە وەختی شکاندا
بەرانبەر TVیەك دانیشتووم

سیمام قەت ئەوەندە ئالوودەی دڵۆپی تەنیاییم نەبووە.
دەنگم قەت ئەوەندە هۆگری باڕژنی ئاسکەکەی هەنسکم نەبووە.
ڕەنگم قەت ئەوەندە عاشقی پووشپەڕە زەردەکەی خۆرئاوام نەبووە.
لێوم قەت ئەوەنە هاودەمی لەرزینی دوا گەڵای درەختم نەبووە.
هەر وەکو ئەستێرەی لێقەوماو لە شەوی باراندا
هەر وەکو پەنجەرەی لێقەوماو لە وەختی شکاندا
بەرانبەر تێڤییەك دانیشتووم.
لە پەردەی تێڤێوە ئەو کیژە دەساڵەی
کە ئەڵێی ڕەنگاڵەی بەر نمەی گریانی شاخانەو
لە ئاسمان ون بووەو لە دایکی ون بووەو وەك
لاسکە سەمەلی بەر تەرزەیش ئەلەرزێ.
لە پەردەی تێڤێوە دێتەدەر ئەگاتە بەردەمەو
ئەکەوێ. هەڵئەسم باوەشی پیائەکەم. ئەیخەمە
بەر کوورەی ژوورەکەم. چیم هەبێ لە شیرو لە نانو
لە نوقڵو لە یاری منداڵان بۆی دێنم. هەر
هەمووی ئەخەمە بەردەمیو، پەتۆکەم ئەهێنم
پیائەدەم. ئەیدوێنم. تا ئەنوێ.

لە پەردەی تێڤێوە ئەو ژنە ڕەشپۆشەی
لە شەوی شیعر ئەچێو لە مانگی ئەوق ئەچێو لە دواوە
جێماوەو ڕەزێکە سڕبووەو نازانێ چی بکاتو
چی بڵێ، لە پەردەی تێڤێوە، دێتەدەر

ئەگاتە بەردەمم‌و ئەکەوێ. هەڵئەسم. دایکمەو
مێژوومە باوەشی پیائەکەم. لە پێشدا پاڵتۆکەی
بەر خۆمی پیائەدەم. چی مابێ‌و چی هەبێ لە خۆراك
بۆی دێنم. دواتریش ئەیخەمە جێگەکەی دایکمەوەو
لێفەکەی ئەویشی پیائەدەم. ئەیدوێنم. تا ئەنوێ.

لە پەردەی تێڤێوە دێنەدەر. ماڵەکەم چەند
بگرێ دێنە دەر. ماڵەکەم پڕ ئەبێ لە گریان،
لە باران، لە قوڕو لە هەڵمی کۆچتان‌و لە
بانگ‌و لە هاوار، لە پارچە نایلۆن‌و لە چیلکەو
چەوێڵ‌و لە وشکە زریکەو لە قیژەی زۆر تەڕو
لە دەستی فڕیوو، لە ئەژنۆی شکاوو، لە ساوای
بەر مەمکان. چیم مابێ ئەیهێنم. لەبەرما چی
مابێ. کلێتەو مشەماو کراس‌و پانتۆڵ‌و
دەرپێم‌و گۆرەویم. هەر هەمووی دائەنێم،
ڕووت‌و قووت ئەبمەوە. بە ڕووتی ڕائەکەم،
ئەچمە دەر، من شێتم، من شێتی کۆچتانم، بە ڕووتی
ئەچمە دەر، ئەگەمە سەر شەقام. بە کوردی‌و
سویدی بانگ ئەکەم: ئەی دنیای چەپ‌و ڕاست
دوای گازی ژەهراوی دوای نانی ژەهراوی‌و
ئەنفال‌و کوشتنی هەڵەبجەو ئەم کۆچە: چی ماوە
بمدەنێ‌و چی ماوە بمدەنێ!!

من ئیسته دەریاچەی مەراقم
ئەسپێکی شین باوی مەنگترە.
من ئیسته ئاسمانی دڵتەنگی کۆچەکەم
خاوەنی "مانگ"ێکی سووورباوی گەشترە!

من ئیسته باڵندەی گڕگرتووی ناوبەفری ئەم ڕەوەم
بە دەنووك لە شووشەی پەنجەرەی گشت گێتی ئەداتو
من ئیسته هاوارم وەك مۆمی کافووریی داگیرساو
شار بە شار ئەڕواتو
ئازادییم سەرئەکات بە دەرگای ماڵاندا
وەك هەتاو!

ئەم کۆچە گەورەیە کۆچێکی دووسەر بوو
لەم سەریان کە ڕۆیشتم ماڵەکەم، گەڕەکم،
شارەکەم بزر کرد.
لەو سەریان ئەو کاتەی هاتمەوە
ئەوینی ناو دنیاو
جیهانم دۆزییەوە!

ئەم کۆچە کلیل بوو کلیلی سیحراویی
بە فرمێسك دەروازەی ئاسنی کردەوە،
بە چۆڵ بوون پڕبوونی دروستکرد.

ئەو وەختەی کە دووریش کەوتمەوە

لە ماڵێ دابڕام

لە دنیای نزیکتر کردمەوە.

کامێرا.. کامێرا.. کامێرا

گەر چاوی هاودەمی کامێرا نەبووایە

کێ بەژنی بارانو غوربەتی ئەم کۆچەی ئەبینیم؟!

گەر چاوی ئێشکچی کامێرا نەبوایە

کێ ڕەنگی پەڕیوی ئێوارەی ئەم کۆستەی ئەبینیم؟!

گەر زارو گەر گەرووی کامێرا نەبوایە

کێ ناڵەی ئەشکەوتو

کێ دەنگی داربەڕوو

کێ نووزەی پەلکەگیای ئەبیستم؟!

گەر دەستی تەلیسمی کامێرا نەبوایە

ئازادیم بەو هەموو خوێنەوە چۆن ئەچووە ماڵانی دنیاوە؟!

گەر پەنجەی ڕووناکی کامێرا نەبوایە

ئەم کۆچە چۆن ئەبوو بەم مانگەو

ئەم خاچە چۆن ئەبوو

بەم پردە؟!

شۆڕشی کامێرا شۆڕشی بینین بوو

دژی چاو بەستنەوەی ئازادیم.

شۆڕشی کامێرا شۆڕشی بیستن بوو

دژی دەم بەستنەوەی باهۆزم.
شۆڕشی کامێرا شۆڕشی فڕین بوو
دژی باڵ بەستنەوەی هەڵبەستم.
شۆڕشی وێنە بوو.. بەرانبەر متبوونی بۆشایی.
شۆڕشی دەنگو ڕەنگ.. بەرانبەر بێدەنگیو بێ ڕەنگی.
شۆڕشی ژیانو نیشاندان.. بەرانبەر مردنو شاردنەوە.
شۆڕشی ئەوینو گەیاندن.. بەرانبەر ڕزینو هێشتنەوە!
کامێرا.. کامێرا.. کامێرا
سوپاس بۆ کامێرا
بۆ چاوی کامێرا
بۆ دەنگی کامێرا
بۆ دەستی کامێرا
بۆ قاچی کامێراو
سوپاس بۆ ئەوینی ناو دنیا!
تۆ خاچی مار تێئالاوی
تۆ سەفەری بێ کۆتایی مەراقیتو
تۆ ڕۆژنامەی بەیانیانو ئێوارانی سەرابیتو
مێژووی وێڵیو
زیندانی زیندانکراوی!

زۆرت دی. وەك بەردی سەر چیاو چون داری دارستان،
وەك خۆڵی ڕێگەوبان: ڕەشەبای دەم تیژو ڕەقەڵەو

زبرت دی. زۆرت دی. چون لی گوێ زەریایش
شەپۆلی ئەشکەنجەی شینو مۆر، گەرداوی سەر گەردان،
کەفاوی مەراقو هەڵچوونی تووڕەییو داچوونی هێمنیی
زۆرت دی. تۆ کەشتیو تۆ سەوڵی خنکاوی زۆرت دی.
تۆ شاخی زۆرت دی: ئەوکاتەی کۆچ ئەکەن. ئەوکاتەی
کە ئەگرین. ئەوکاتەی کە ئاگری عەشقێکی ئەبەدیی
لە خۆیان بەرئەدەن. زۆرت دی: خەمت دی ئەو وەختەی
کە ئەبێو کە ئەڕوێ. مێژووت دی ئەو وەختەی کە
نێچیر ئەخواتو ئەو وەختەیش کە ئەخورێ. تۆ هەقی
زۆرت دی ئەو دەمەی کەوڵ ئەکرێن. گوناهی زۆرت دی
ئەوکاتەی کە باوەش بە خوادا ئەکەنو تاوانی زۆرت دی
ئەو وەختەی لە خاكو لە خوێندا ئەچێنرێن. زۆرت دی
تۆ گوڵی دڕندەو تۆ ئاوی ناپاكو تۆ بەردی ناسكو
تۆ غەدری ڕازاوەت زۆر بینی. گوڵدانی ژەهراویو ئینجانەی
خوێناویی زۆرت دی. تۆ شیعری فێڵبازو تۆ وشەی
خائینو شۆڕشی قاچاخچیو سەرکردەی پوتت دی. لە پێستی
هەتاوو فریشتەو پەریدا دزت دی. لە پێستی مەسیحو
حەللاجو بابکدا پیاوکوژی زۆرت دی. پیاوانی قاوغو
پووچت دی. زۆرت دی. ژنت دی ئەو وەختەی کە ئەبن
بە قولاپ. ژنت دی ئەو وەختەی کە ئەبن بە لاولاو.
هاوڕێی خۆتت دی کە لەودیو پەردەوە پەنجەیان بە چەقۆ
ئەفرۆشتی. زۆرت دی. خۆتت دی ئەودەمەی

ئەترسی خۆتت دی ئەودەمەی کە ئەبوو بپرسی‌و
نەتپرسی. خۆتت دی گیاکەڵەی هەڵە بووی. خۆتت دی
ملێکی شکاوی ناو قۆرت‌و پەلە بووی. زۆرت دی.
چیت نەدی؟! زۆرت دی‌و مەخابن تا ئیستەیش
لە ڕق‌و ئەوین‌و نامۆیی‌و تەنیایی نەگەیشتی!

هەنووکە ئازادیی ئەسپێکی شەفەقەو هێناتە ماڵەوەو
سەرتاپای جریوەی مژدەیەو بریسکەی خۆشییەو
یاڵ بە گوڵ. ئازادیی وەکو گوڵ وەکو مانگ هاتۆتە ماڵتەوەو
چون چرای ئەفسانە هاتۆتە بەردەستت، بۆئەوەی
بیبەیتە ناو گەوەی شاخەوەو بۆئەوەی ڕووناکیی
بکەیتە بەیداخ‌و لە گیانتا هەڵیکەیت. ئازادیی وەك
گوڵەبەڕۆژە، چاوەڕێی پەنجەتە تۆوی کەیت،
ئازادیت ئیستاکە وەکو سکی گەرمیان، وەك سکی
ئەم خاکە قوپاوە برسییە. ئازادیت کاولاشە. چاوەڕێی
شارایە، چاوەڕێی هەویرە کە بیکەی بە پارووی ئەو
دەمە تەنیایە. ئازادیت برسییەو ئازادیت ڕەجاڵە
ئەوکاتەی ئازادیی برسیی بوو:
شاخ ئەژنۆی ڕۆیشتنی نامێنێ.
ئاو بەستەو گۆرانیی نامێنێ.
ماڵ دەمی نامێنێ تا ماچی تۆ بکاو
هەرێزی پێکەنین زەرد ئەبێ‌و

سالێ ئەمرێ!

ئازادیی وەك دارتووی حەوشەكەت هاتۆتەماڵتەوە
وا ئیستە خەونێكی زۆر گەورەت ڕۆژانە وەك كێڵگەو
وەك شەقام، وەك دەرگای ماڵەكەت لەگەڵتە.
وەك ئەسپێ لەبەردەم ڕابوونتا وەستاوە.
چون بەیار، ئازادیی چاوەڕێی كێلانتە
چاوەڕێی باران‌و یەكبوونی زامانتە.
ئەم ئەسپە زێڕینەی بەربەیان
ئەوەندە لەسەرت ئەوەستێ
نەیخەیتە تاریكی‌و درەنگان.
ئەم ئەسپە زێڕینەی ئازادیی
ئەوەندە لەسەرت ئەوەستێ
بێزاریی نەیگاتێ‌و برسێتیی چوارپەلی نەشكێنێ!
جڵەوی ئەم ئەسپە زێڕینە لە دەستی خۆتدایە
ئەم ئەسپە زێڕینە ئەوەندە چاوەڕێی تۆ ئەكات
كە چەتە نەیگاتێ‌و كوڕژنی نەفڕێنێ!

بەیاریش ئەوەندە چاوەڕێی بارانی تۆ ئەكات
باگژی وەڕسبوون، بە ڕەوە كوللەوە نەیگاتێ‌و
لە گیانیا هەڵنەكات!

ئازادییت وەك مەلی خوێناویی هێنایە ماڵەوە

**وا ئیستە لە سنگتا ئەخوێنێ. لە سنگتا هەڵئەفڕێ.**

**سنگی تۆ ئاسمانە. ئەم مەلی نگینیەیش،**

**ئەوەندە لەسەرت ئەوەستێ. ئەوەندە هۆگرتە.**

**قەت سنگی بۆ نەکەی بە قەفەز. ئاسمانی ناو سەرتی**

**بۆ نەکەی بە زیندان. ئەم مەلەیش برسییەو چاوەڕێی**

**خەرمانی تۆ ئەکا!**

**ئازادییت.. برسییە.**

**ئازادییت.. مانگێکی نەخۆشە.**

**ئازادییت.. وێرانەی کاولاشە.**

**ڕەنگو بۆی ئازادیی لە باخچەی گیانتایە.**

**پێخۆرو خەرمانی ئازادیی**

**بە تەنها لە کێڵگەی ناو لەپی دەستایە!**

**یەکبوونی چراوگی زامەکان.**

**یەکبوونی تانوپۆی کسپەکان.**

**یەکبوونی لاوکو حەیرانو**

**لە یەکدا توانەوەی ئەم عەشقە**

**گۆڕینی ئەم سەرە بە ملو شانەوە**

**گۆڕینی ئەم دەنگە لای خۆتەو لای خۆتە!**

**ئازادییت برسییە:**

**هەزاران دروشمی سەر خامو سەر دیوار**

برسێتیی کۆترێك تێر ناکات!

ئازادییت کاولاشە

خەرمانێك لە قسەو سەروتار

ڕووبارێك لە هاشەو لە هووشەو

شەپۆلی چەپڵەدار

جامێ ئاو پڕناکاو

کراسێك ناکاتە بەر زامو

چرایەك لە ماڵی تاریکدا هەڵناکات!

لەسەر ڕێی ڕۆژاندا.. لەسەر ڕێی مانگاندا.. لەسەر ڕێیساڵاندا

وەك ترێ چاوەڕێت قرپۆك بوو.

ئەو دەستە هەر نەهات کە مژدەی کردبێ بە گەنم.

ئەو دەستە هەر نەهات کە قسەی کردبێ بە دەرمان.

ئەو دەستە هەر نەهات کە کفنی کردبێ بە کاڵا.

هیچ نەهاتو.. هیچ نەهات!

تۆ خاچی مار تێئاڵاوی

تۆ هەتاوێکی تاریکو

تۆ تەنیایەکی ئاپوورەو

تۆ هەوایەکی خنکاوی

هەمدیسان تۆ سەرت خول ئەخوا بە دەوری

بازنەی گوماندا بە دەوری مەرگێکی تازەداو

له تەیری گێژ ئەچیت. له ڕێگەی ون ئەچیت.
تۆ ئیسته وای لەبەر وەیشوومەی شەڕێکی دەروونتا.
شەڕێکی ناو سەرتا، شەڕێکی ناو خۆتا، هەر ڕۆژەو
بایەکی نەفرەت دێو هەر ڕۆژەی گەرداوی
خوێنێکت هەڵئەکاو هەر ڕۆژەی تۆفانی
مردنێ تۆ ئەبات. تۆ ئیسته تەنیاییت گۆڕێکی
گەڕۆکەو لەگەڵتا ئەڕواتو تۆ ئیسته نامۆییت
بەژنێکی تاریکەو پەلوپۆی خاچەکەت هەر ڕۆژەو
قولانجێ زیاد ئەکات.
هەمدیسان نەفرەتی خۆکوژیم هاتەوە،
نێو خوێنو هاتەوە کاولاشی ماڵەکەم.
هەمدیسان ئەم دەستم ئەو دەستم ئەکوژێو
ئەو دەستم سەری خۆم ئەدزێو
ئەم دەستم دەمی خۆم ئەدورێو
هەمدیسان من هەر خۆم چەقۆمو
هەر خۆیشم تەرمەکەم.

هەمدیسان من هەر خۆم سێدارەو
هەر خۆیشم لاشەکەم.
من هەر خۆم تفەنگمو
هەر خۆیشم نیشانەم!
پێکەوە گۆڕمو گۆڕهەڵکەن.

پێکەوە پەتایشم‌و قوربانیی.
پێکەوە کۆتیشم‌و ملیشم‌و
پێکەوە زیندانم‌و زیندانیی.
هەمدیسان من هەر خۆم مشارم‌و
هەر خۆیشم کەریتەم.
من هەر خۆم کلیلم‌و هەر خۆیشم قفڵەکەم.
پێکەوە نێچیرو داویشم
پێکەوە خنکاوو ئاویشم.
پێکەوە ئاگرو.. سووتانم.

من بۆ خۆم دزراوم‌و هەر خۆیشم دزەکەم.
من بۆ خۆم برسیم‌و هەر خۆیشم چەتەکەم.
چی ماوە؟! من بیڵێم..
من بۆ خۆم ئیستاکە بە پەنگ بووی دنیام‌و
هەر خۆیشم پەنگەکەم!

تۆ خاچی مار تێئالاوی
لەم ڕۆژگارە دوو کەرتەدا تۆ ئەو چاوەی کە بۆت نییە
نیوەی دایکی خۆت ببینی.
لەم شەوگارە دووکەرتەدا
تۆ "نالی"تو بۆت نییە دهۆك ببینی.
تۆ "خانی"تو بۆت نییە هەولێر ببینی.

تۆ خاچی مارتێئالآوی تۆ مەراقێکی دووکەرتی
تۆ نیشتمانی بڕڕاوەی لەناو قەداو
تۆ مێژوویەکی بڕڕاوەی لە کەمەرداو
لەملاوە تۆ هەڵبەستێکی بێ قاچیتو
لەولاوە تۆ شانۆیەکی بێ سەریتو
تۆ گۆرانیی لە ناوەندا پچڕاویتو
پەنجەی لە دەست بەجێماوی!
ڕۆژانە شیعرێکی ڕیشنو خوێناویت وەك بەرداش
وڕیتو وەك پووشو پۆلاشی دەم گێژەن
کاسیتو ئەچیتە دەرەوە. ڕیشنی وەك پرسەی
هەمیشەی گەرمێنو پرچنی وەك تەکیەی قادریو
وەك نەقشیش ئەستێرکی خەلۆەتی بێدەنگیت.
ئەچیتە دەرەوە، ئەو وەختەی ڕێ ئەکەیت،
لێڵی وەك خابوورو قەمووری وەك پشتی دابانو
ڕەنگ پەڕیو وەك کەرکووك. ڕۆژانە شیعرێکی
ڕیشنو خوێناویت. خوێناویت بە خوێنی وشەی
خۆت. ئەچیتە دەرەوە، خوێناویت
بە خوێنی کۆتەڵی شینی خۆت. ئەچیتە دەرەوە
وەك بەرداش وڕیتو وەك گردی دوا بە دوای
بۆردومان کاسیتو ئەچیتە دەرەوە.
کە ئەڕۆیت تۆ لەبەر خۆتەوە وەك ئیستەی
خانەقین وڕێنە ئەکەیتو شێتی وەك میری

سوور. ئەڕۆیتو تۆ لەبەر خۆتەوە هۆبە
هۆی هۆرەتەو هاواری ئێڵەکەی ئارانتەو
هاواری کۆچەکەی عەنبەرتە وەك دەشتی
شارەزوور. ئەچیتە دەرەوە. وەك ئیستەی
ڕێو بانی نیشتمان، وەك خەڵکی وڵاتی خۆکوژیی
تۆ ونیو بزریو نازانی بۆ ئەڕۆی، نازانی
چۆن ئەڕۆی؟! ئەچیتە دەرەوەو تەنیاییت
دووکەرتە. تۆ نیوەیت. ئەڕۆیتو لە سەرتا
نارنجۆك ئەتەقێو تی ئێن تی ئەتەقێو لە
سنگتا خومپارەبارانەو ئەڕۆیتو تۆ
نیوەیت. ئەڕۆیتو ئەمجارە دووکەرتیو
سێ کەرتیو چوارکەرتیو ئەڕۆیتو تۆ بنە
سلاوەیت، تۆ دەستی پەریوی یوسفیی
بامەڕنیت، تۆ سەری هەڵەبجەیت. ئەڕۆیتو
دڵۆپی خۆڕایی خوێنی خۆت بە کاولاش ئەفرۆشی.
ئەڕۆیتو دڵۆپی خۆڕایی خوێنی خۆت ئەژمێری.
کۆستەکان ئەژمێری. بێوەژن ئەژمێری.
سالانی بابردوو ئەژمێری، بێشومار،
تۆ خەونی هەڵکێشراو، ئاوارە ئەژمێری.
ئۆردوگای برسێتیی ئەژمێری. هەر ئەڕۆیت،
تەنیا نیت تۆ سەری بڕڕاوی مێژووی خۆت
لەگەڵ خۆت ئەگێڕی. تۆ تك تك ئابڕووی

خۆت ئەکەیتە ناو زەرفی نایلۆنی بانگەشەی
شوومەوەو بۆ دنیای ئەنێری. تۆ سەری بڕڕاوی
براکەت وەك تاجەگوڵێنەی سەرکەوتن لەگەڵ
خۆت ئەگێڕی. تۆ پەنجەت تیرۆری خۆی ئەکات،
تۆ سەرو تۆ دەستو تۆ قاچی: کوێستانیو
ڕێناسو حەللاقو فرانسیس ئەخەیتە ناو
کیسەی خۆڵەوەو لە ڕێگەی پۆستێکی پیسەوە
بۆ دنیای ئەنێری!

ئەڕۆیتو هەست ئەکەیت. تۆ ورد ورد ئەگۆڕێی،
تۆ ئەوەی پێشوو نیت. دەست ئەدەیت لە
گوێچکەت درێژەو ئەمجارە درێژتر. دەست ئەدەیت
لە دانتو هەست ئەکەیت تیژترەو درێژتر. کەڵبەتە.
تەماشای پێت ئەکەیت نینۆکت وەکو درەوش
پێڵاوی دڕیوەو هاتۆتە دەرەوەو درێژە،
ئەمجارە لە دەستت ئەڕوانی ئەبینی تیسکنەو
تاڵەمووی ڕەش ڕەشەو درێژە. لائەدەیت،
ئەچیتە بەردەمی ئاوێنەی کۆگایەك. کە سەیری
خۆت ئەکەیت تۆ بوویتە "دراکۆل". تۆ
ئیستە تینووتەو هەر حەزت لە خوێنە. ئەگەڕێی
بۆ یەکێ خوێنەکەی لە خۆت بێ بۆئەوەی کە بینی
پێوەنێی. ئەڕۆیتو دەوروبەر: ئەپارتمان

شەقام‌و دوکان‌و ڕێستۆران، هەموویان
ئەگۆڕدرێن ئەبن بە بێشەڵان. ئەڕۆیت‌و
ئەمجارە مرخەت دێ‌و مرەت دێ‌و تۆ جیرەی
کەڵبەت دێ‌و ئیستاکە تۆ وا بووی بە ورچی
خوێناویی دارستان!

ڕۆژانە شیعرێکی ڕیشن‌و خوێناویت ئەچیتە
دەرەوە، وەك بەرداش ورپیت‌و وەك
پووش‌و پەڵاشی دەم گێژەن کاسیت‌و ئەچیتە
دەرەوە. لە بەری "Gamlastan" کۆڵانی
باریکی ڕەواندز پێت ئەگات. ئەوساکە
تۆ بۆنی بارووت‌و منداڵی سووتاوو تەماشای
ئابلۆوقەی مردنی خۆت ئەکەیت. لەبەری گەملەستان،
ئەچیتە ژێر چوخمی کۆنەوە، چوخمەکەی
سەرشەقام پێت ئەگات، ئەتگرێ‌و ڕاتئەگرێ‌و
سەعاتێك هەر باسی شێداریی نامۆیی‌و
نسیەکەی تەنیاییت بۆ ئەکات. بەرەوخوار
تۆ ئەڕۆی هەست ئەکەیت، قاچێکت مان
ئەگرێ لە هاتن، لەگەڵتا نایەت‌و جێتدێڵێ‌و
سەرەو ژوور ئەو ئەڕوات. ئەمجارە خۆت
ئەکەیت بە گچکە باڕێکدا، ئەچیتە دووکەڵ‌و
ژاوەوە، وەکو لەقلەق ئەچیتە سەر

کورسیی لۆقدارو ئانیشکت ئەخەیتە سەر
باڕو بادەکەت تێئەکەیت. خوێنەکەت
هەڵئەدەیت. دووکەڵو ژاوەیەو تۆ
خۆیشت ئیستاکە دیرۆکی خانێکی ئاژاوەیت.
تۆ خۆیشت ئیستاکە هاواری چەقۆیتو
زریکەیماڵیتو شەقژنی ئاوارەیت.
لە دەستی ڕاستەوە. ژنێکی سەرتاپا سوورپۆشت
لاوەیە، گوڵچاڕێ گوڵاڵەو پەیکەری گوڵباخەو
لاتەوە وەستاوە. جریوەی ئاڵ ئەدا لە چاوت.
نیشانەی بازنەی مسینی سەر سنگی پێت ئەڵێ:
ئەو چەپە. ئەو چەپەو ئیستاکە لە دەستی ڕاستەوە
لاتەوە وەستاوە. ئەو چەپەو لە بەفری ئەمڕۆدا
هەڵاڵەی بۆ ئێرە هێناوە. لە کلووی بەفرەوە
ئەچمە ناو قسەوە، لە سەرمای ئەمڕۆوە خۆم
ئەکەم بە ژووری دووانداا. ئەیدوێنم. ئەمدوێنێ.
ئەو وەختەی ئەگاتە ئەو پرسە ئاسانەی کە
من چیم؟! کە من کێم؟! پرسەکەم لێ ئەبێ بە
کێوێ. لە تاودا من دەستم ئەگلۆفم،
لاڵ ئەبم. ئەوەستم. من ئیستا شەرم ئەکەم،
شەرم ئەکەم، شەرم ئەکەم پێی بڵێم:
من کوردم!!

لەم مێژووە زڕەدا خۆمو خۆم تیغینو نێزەینو
ئەچینە ناو جەستەی یەکەوە. خۆمو خۆم
بڕبەندین لە قەدی یەکتردا. خۆمو خۆم
گابەردین تل ئەدەین دێینە خوار هەر
بەسەر یەکتردا. خۆمو خۆم گوێزانین ڕائەکەین
بە جەرگی یەکتردا.
خۆمو خۆم تاوانو شایەتین پێکەوە.
خۆمو خۆم سێدارەو جەللادین پێکەوە.

ئازادیی! کامەیە ئازادیی؟!
ئازادیی ئەسپێکی شەکەتەو ئەشەلێو
هەموو ڕۆژ بارئەکرێ لە فیشەك!
نیشتمان! کامەیە نیشتمان؟!
ئەو عەردەی هەموو ڕۆژ دوو سێ جار ئەیکوژین؟!
ئەو دەشتەی کە بۆتە تاتەشۆر!
ئەو شاخەی کە بۆتە دارەمەیت!
ئەو بەردو ئەو قوڕو ئەو چەوو ئەو لمەی
زیندانی لێ زاوە؟!

کامەیە نیشتمان؟! کامەیە ئازادیی؟! نازانم..
ئەو ئاوەی بە ڕۆژی نیوەڕۆ سەرچاوەی ئەدزین؟!
ئەو یارەی لە خەودا چاوانی ئەدزین؟!

ئەو هەورەی پێش باران بارانی ئەدزین؟!
ئەو مانگەی لە شەوی چواردەدا ئەیدزین؟!
نازانم کامەیە نیشتمان؟! کامەیە ئازادیی؟!
ئازادیی ئەسپێکی شەکەتەو ئەشەلێو
هەموو ڕۆژ بارئەکرێ لە فیشەك
ئەوەتا نیشتمان گەراجە بۆ تایەی قاچاخو
لۆرییە بۆ درۆی سەرمۆرو
گومرگە بۆ خوێنو بۆ خەمو جگەرەی ستۆكو
دروشمی ستۆكو.. بازاڕە بۆ سیمای سیاسیی مووزەوەر!
لەم مێژووە زڕەدا.. هەر دۆزەخ ئەزێتو
هەر شمشێر سك ئەکاو
مەرگەوەڕ ئەبێتە پێغەمبەر!

هەمدیسان وا مارتەو ئێوارەی بارانەو
غەریبیم تەپو نم ئەبارێ. هەمدیسان وا مارتەو
تاوتاوی ڕێژنەی زامانەو سەفەری درێژی
باڕێزەی گریانەو غەریبیم شەست ئەکات.
هەمدیسان ئێوارەی بارانەو، من ئیستە لە گۆشەی
تەریكو شین باوی گازینۆی غەریبان دانیشتووم.
ئەوەندەی کوردستان تەنیامو ئەوەندەی شاخو داخ
ماندوومو ئەوەندەی دووکەڵی جگەرەم پەرتمو
ئەوەندەی دواچۆڕی ڕووباری ئەم شیعرە لێڵمو

ڕۆحیشم کوولەکەی تەمێکەو خەریکە تەق ئەکات.

هەمدیسان بارانەو ئێوارەی بارانەو چون

قەوزە وەنەوزێ گرتوومی.. نازانم بۆ مەرگە؟!

یان خەونی کازیوەو چوونەوە بۆ هۆبەی چاوانی

یارانە.. بارانەو بارانەو بارانە..

نیشتمان! کوا ڕانت؟! کوا بەردت؟! کوا سینەی خاكو خۆڵ؟!

بالیفی خەوبینین.. هەورەکەی سەرینم.

با تاوێ مەراقی هیلاکم.. مەراقی شەکەتم

لە بنار "گۆیژە"تا ڕاکشێ..

تا خەونی قەسیدەی داهاتووی

تازەتر ببینم!

ستۆکهۆڵم

تێنستا

1995– 1996/4/8

(با) بەشەلەشەل هەڵئەکات !

لەم قوتبەوە (با) ئەگەڕێتەوە دواوە..

ئەگاتەوە یەکەم کۆڵانی زوبانم

لەبەر دەرگایەکی نزمی چلەکاندا.. دائەنەوێ
بۆنی منداڵییم ئەکاتو گوڵەخەونم هەڵئەمژێ
بۆنی منداڵییم.. چون بۆنی کارژۆلەیەك، پەلکە گیایەك
چون بۆنی دەنکە چوالەیەك
هەر زوو تێکەڵ بەبۆنی گریانی دایکمو
بۆنی لاواندنەوەی تەڕو
بۆنی گڵگەچی ژوورێکی کەسیرە بوو.
بۆنی شەو بۆنی ترسێکی زستانە بوو
بۆنی بۆیرشی[1] تەنیاییو بۆنی ئێوارەی هەژارییو
هەر زوو تێکەڵ بەبۆنی تیژی کەساسییو
بۆساردی لێفەی ڕێزاڵو
خەونی پەرتی ژیانم بوو.
بەفر ئەڵێ
حیکایەتی سپیی ئەڵێ:
گڕوگاڵت گڕوگاڵی شەمامە بوو
لانکەت گەڵا هەنجیرێكو
یەکەم وشەت بۆنی ڕازییانەی لێهات.

لە سێبەری بێستانێکی (مەلکەندی)دا تۆ خەیاڵی
بچکۆلانەی بەڕوولە بوویت، بەخاکەوە قرسا بوویتو
لەگەڵ گڵدا پێ ئەکەنیت. بەڵام ڕۆژێ بابلیسکێ[2]

---

[1] بۆیرش: بۆنی هەر شتێ کە لە شوێنێکی تەڕدا دانرابێو شێی هەڵهێنابێ.
[2] بابلیسك: گێژەڵووکەو گەردەلوول.

له بنجەوە هەڵیکەنیت. کەچی ڕۆژێ لەپڕێکدا،
له بەرزایی جریوەوە، له بەرزایی تریقەوە، خل بویتەوەو
کەوتیته ناو خۆڵەمێشی دۆڵێکەوەو لەچاو ون بوویت.
بۆنی ڕەزو بۆنی دایکم هەر یەك بۆن بوون.
بۆنی چیاو بۆنی باوکم هەر یەك بۆن بوون.
هەموو شەوێ ڕەزی چاو ڕەش
حیکایەتی هێشوویەکی هەڵوەریوی بۆ ئەکردم
هەموو شەوێ ئەو بێستانە پەرچەمو پرچ بۆن خۆشکەیە
تا ئەنووستم
حیکایەتی پەلكو گەڵای سترانێکی
ئەم زمانە داڕنراوەی بۆ ئەکردم.
بەفر ئەڵێ
حیکایەتی سپیی ئەڵێ..
کۆنترین دووکەڵ، دووکەڵی مانگە شەوێکی تەواری بێوەژن بوو.
یەکەمین بۆن لەو تریفه سوتاوەوە، له بۆکرووزی ئەو دەنگو
ڕەنگەو، له بۆسۆی ئەو کراسەوە گەیشته کەپووی منداڵییت.
لەو وەختەوە ئیتر کەپووت بوو بە کەپووی وڵاتەکەت،
لەوساکەوە دوورو نزیك بۆنی هەموو وەزەنێك و[3]
بۆنی هەموو ڕووداوێكو بۆنی هەموو نەهێنیەکانی ناو مێژووی
کۆنو تازەو دنیا ئەکەیت. بەبۆنکردن خەمو خۆشیی،
شاییو شینو، تاریکاییو روناکایی، له یەکتر جوێ ئەکەیتەوە.

---

[3] وەزەن: ئازار، خەم، پەژارە.

به بۆنكردن كارەسات ئەناسیتەوە. هەر بە بۆنیش تۆ چێژ ئەكەیت.
بە بۆنكردن ڕەنگەكانو ئاوازەكان هەڵئەبژێریو گوڵدانەكان
ڕیز ئەكەیتو وەرزەكان ئەنووسیتەوە.

تۆ بۆنەكان لەناو (با)دا دەرئەهێنی.
تۆ بۆنەكان ئەكەی بەدەنكە مووروی ڕەنگاو ڕەنگ
یەك یەك جیایان ئەكەیتەوە لە یەكتریی
تۆ بۆننامە ئەگریتەوە بۆ سەفەری دەنگەكانو
بۆ داهاتووی تەماشاتو
هەر بەبۆنیش ڕەنگەكان ئەخوێنیتەوە .

بینینم تاقیكردەوە.. تراویلكەی سەهویرێ[4] بوو.
بیستنم تاقیكردەوە.. گومڕای دەنگو لاوژێ بوو.
- گرتن- م تاقیكردەوە.. سڕبوونێكی بەردەوامی ناو دەسم بوو.
چێژیشم تاقیكردەوە.. پەلاسەجووی، ناو دەمم بوو
هەر قەڵەمی بۆن بوو مابێو
بۆ ئەمجارە شیعرێكی نوێی پێ بنووسم.

**( یەكەم گۆرانیی بۆنخۆشی ئەم بۆننامەیە بۆ تەوارێكی بێوەژن ئەڵێم ):**

❖ لەو گوێ ئاوە من دەسم دا لەپەرچەمی
سوورە چنارێك بێوەژن
لە پاشتردا دەستەكانم

---
[4] سەهویر: تارمایی و ڕێشكەو پێشكەی چاو.

بۆنی سورایی خۆرئاواو
بەلاڵوکی وەریویان گرت.
من خۆم هەڵسوو لە پەڕو باڵی زیوینی
کۆترە شینکەیەك بێوەژن
لە پاشتردا.. سەرو ملو لەشم هەمووی
بۆنی تەنیایی هێلانەو
ئاسمانێکی ئاخداریان گرت.
من ماچێکی ئەو گۆرانیە بێوەژنەی
ناو واگۆنی غەریبیم کرد
لە پاشتردا دەمو لێوو تووکی سەرم
بوون بە باخی هەوربردوو
بۆنی رێگا دوورەکانو
بۆنی لەیەك دابڕانو
بۆنی کەمانچەی چاوتەڕی دنیایان گرت۞

ئازار بۆنی نیشتمانە وێرانەکەی منی لێدێ.
بۆنی خوێن.. بۆنی مێژوومە.
بۆنی میدیەکانو بۆنی گاتاکانی زەردەشت
بۆنی شەرابو نوشوستی هەر یەك بۆنن.
چوارینەی بابە تاهیرو بەیتەکانی فەقێ تەیران
بۆنی کەشكو گوڵەگەنمو
مێخەك بەندی ملی کابانویان لێدێ.
بەفر ئەڵێ..

حیکایەتی سپیی ئەڵێ..

تۆ جوانوو بوویت.. یاڵت تازە گڕی ئەگرت

تازە بەتازە وەك ماسیی حەوزی مزگەوتی (حاجی حان)

لە ئاوێکی بەرهەتاوی ڕوونو قوڵدا مەلەت ئەکرد.

هەر لاکێشێکی چەند مەتریی جیهانت بوو، کە (بۆ) جەستەی

چوار سێدارە، بۆنی چوار پەت، لە پایتەختەوە گەیشتە

حەوشەکەتان، ماڵەکەتان، دارتووەکەو، ملوانکەو ئاوێنەی

دایکتو کتێبەکانی باوکتو، جانتای پەڕۆت، هەموو بۆنی

ئەوانیان گرت. ئەوانە بۆنی ئەوینو رووناکیی بوون،

هەڵتمژین. ئەوانە بۆنی قوربانییو ئازادیی بوون،

هەڵتمژین. بۆنی بەیبوونو قوربانیی زۆر دوور ئەڕۆن،

بۆنی رووناکییو قوربانیی هەر یەك بۆنن، ئیقلیم گیرن،

بەرد ئەبڕنو دار ئەبڕنو دیوار ئەبڕن.

سروود بۆنی بەڕووی سەر ئاگرو

بۆنی شاخی گڵەزەردەو ئەشکەوتەکەی هەزار مێردو

بۆنی گومەزەکەی ئەمین زەکی بەگو

شیعری (بێکەس)و (قانیع)یش

بۆنی هاواری ڕاستەوخۆی شارەکەمو

گڵەسووری دوای بارانیان لێوە ئەهات،

هەڵتمژینو گەورە بوویت.

تووی مەلیك ئەیگێڕێتەوە:

چاوی سەوزی کچۆڵەیەك، دوو پەپوولەی ناو ئەفسانە،

دووچرای کەسك، ئێوارەیەك هاتنە ناو گەلیی گیانتەوەو شوێنیان کەوتی، ئەبووی بە هەتاو ئەڕۆیشتی، ئەبووی بە سێبەر ئەڕۆیشتی. ئەبووی بە درەخت ئەڕۆیشتی، شوێنیان کەوتی. بەسەر تیشکا بازت ئەداو لەمانگەشەو هەڵئەنووتی. خۆرنشین ڕەنگی ئەکردیو گۆرانیی تەڕی ئەکردیو لەناو بۆنی زەردو سووردا ئەتلایتەوەو لە هەورا پاڵ ئەکەوتیتو سروەیەکیش دایئەپۆشیت. چاوی سەوزی کچۆڵەیەك، بوون بەخەونی کەسك بۆ تۆو هەتا ئیستەیش بۆنیان ئەکەیت. هەتا ئیستەیش شوێنیان کەوتوویت.

بۆنی چاوی سەوزو بۆنی عەشقی سەوزو
بۆنی گەڵای چنارو مێو هەر یەك بۆنن.
بۆنی زەردەخەنەو بۆنی نێرگزو جێ ژوان هەر یەك بۆنن.
لەناو بۆنی چاوی کەسکا بووی بە مێرگو
لە خەمی جواندا توایتەوە .

( بۆنی خاڵێکی بچووکی سینەت ئەکەم
هەردوو چاوم ئەنووقێنمو ئەگەمە بنار هەردێكو
سەرم ئەکەم بەناو کۆشی پەڵەیەك ڕێحانەی رەشدا.
بۆنی چەند تاڵێ لەو قژە زەردەت ئەکەم .
هەردوو چاوم ئەنووقێنمو ئەگەمە ناو سفتیکێك[5]و

---

[5] سفتیك: دەشتایی نێوان دوو شاخ .

لەبەرایی گوڵەزەردا ڕائەکشێم.
بۆنی فرمێسکێکت ئەکەم، هەردووچاوم ئەنوقێنمو
ئەگەمە خوار کاریزێكو سەرم ئەکەم بە تەنکاوی ئەستێرکێکدا
بۆنی ئاخێکت ئەکەمو هەردووچاوم ئەنووقێن و
ڕائەوەستم هەتاکو بای بەفر دێتو
بەرەو زەنویرێکم ئەبات
بۆنی عەتری ناوت ئەکەم
هەردوو چاوم ئەنووقێنمو ئەگەمە ناو دیوانێکمو
ئیتر من چاوەڕێم هەتا ئاوی شیعر زیاد ئەکاتو
لەناو خۆیدا غەرقم ئەکات)

تۆ هەر بۆخۆت
شووشە عەترێکی زرافو باریکەلەی
سەر نەکراوەی
ئۆه گوڵاوم ! سەرت بێنە
با بە دوو پەنجەی ئەم عەشقە شپرزەیە
کڵاوی باخچە بادەمو بتکەمەوە
هەر بەجارێك لەچاومەوە بتقڵپێنمە
ناو ناخمەوە..
ئۆه گوڵاوم! دوو دڵ مەبە
تۆ لەلای من شووشەیەکی خاڵیی نابی.
من گوڵاوچی ئەم زمانەم، لە ئیستەوە

هەموو جارێ بۆ پڕکردنەوەی تازەتر
رۆحی شیعرو خۆشەویستیت بەیەکەوە ئەگرمەوە.

لە ئیستەیشدا.. دوای ڕۆیشتنت، لەجێ ژوان، من بۆنت گرد
ئەکەمەوە.
تەڵی بۆنت یەکە یەکە ئەخەمە ناو جانتای رەشی بن دەستمەوە.
بۆنت ئەبەمەوە ماڵێ. لە ژورەکەمدا دای ئەنێم. هەتا شەوێ.
شەو جانتای بۆن ئەکەمەوە. هێواش دەست ئەبەم بۆ بۆنت
تانەژاکێ. مشتێ لەبۆنت ئەڕوێنم، لەناو بۆنتا لەش و لارت
ئەبینمەوە. من دەست بە بۆنتا ئەهێنم. من بۆنت دائەگیرسێنم.
من بۆنت ئەدەم بە خۆمداو من وێنەی بۆنت ئەکێشم و
قوم قوم بۆنت ئەخۆمەوە.. بۆنت کاسێتی شەوانمەو گوێی لێ ئەگرم !
ئۆه ! گوڵاوم !
ئەو ڕۆژەی تۆ سەفەر ئەکەیت.. بۆنی شیعری نالی ئەگریی.
ئەو ڕۆژەی ئەگەڕێیتەوە.. من بۆنی نەورۆزم لێدێ.
ئەو ڕۆژەی کە تۆ پەست ئەبی.. من بۆنی گەرمییان ئەگرم.
ئەو ڕۆژەی ئەتریقێیتەوە.. بۆنی جریوەت لێوەدێ.
هەندێ جاریش کە ئەدوێیت و من تێت ناگەم
کە ئەتبینم بێ لەنجەیت و روحت سیسەو
هەر تاڵەمووی ئاڵۆزکاوی.
من ئەو رۆژە بۆنی شیعری بێ ناوك و
بێ ئاهەنگ و بۆنی وشەی مردوو ئەگرم.

له ئیستەیشدا. پێڵووم پەپوولەی ماندووە.. پێڵووم خەریکە
پیر ئەبێ
بەڵام چاوم.. نە ء وامەڵێ..
دوێنێ لەسەر ئەو شەقامە وردە خاڵێ
لە خاڵی خاڵخاڵۆکە بچوکتر.. لە دەنکە زەنگیانە وردتر
لە بەرۆکی جوانێکەوە کەوتە خوارێ دۆزیمەوەو هەڵمگرتو
کردم بەنوختەی دوای ماچی دێڕە شیعرێ.
قژم هێلانەی ماندووە.. قژم کەپرێکی روخاوە..
بەڵام سەرم.. نە ء وامەڵێ..
ئەم بەیانییە ئاوازێ.. لووستر لە ماسیی بوارێ..
تیژتر لە پەیتووکەی خەوێ، ویستی ئاسۆی خولیایەکم جێبهێڵێ
نەمهێشت دەرچێو گرتم.. کردم..
بە خرنگەی پاوانەیەك..
بۆ پێی شەمێ..
پێستم دەواری ماندووە.. پێستم زەمانی رێ رێیە..
بەڵام شیعرم.. نەء وامەڵێ..
من هەر بۆ خۆم وشەی (جوان)ی ناو زمانی کوردیی خۆیم
بەسەر ناچم.. من هەر بۆ خۆم..
سەمای شیعرم.. بەسەرناچم..
هێندە نابێ لەسەر هەلگورد باڵۆنە هەوری شیعرێکم
پڕکرد لە بۆنی ژیانو دامە دەس (با)یەکی دوارۆژ
بەڵام پێم وت: باجارێ ئەو، هەربێو بچێ.. هەر بێو بچێ

کە من نەمام ئەوساکە با بێتە خوارێو
شەست دارڕژێ !.

سەر ئەکەمەوە بە کۆشی بۆنەکانی رابووردودا
ئەگەمە ناو دەغڵی حەرفو کەروێشکەی وشەی تیا ئەکەم
ئەبم بە گوێچکەی گڵمتكو
کەپووی رستەو
گەمیەی کتێب ئەئاژومو
من (مەمو زین) ئەخوێنمەوە.
بۆنی ڕیشی خانیو بۆنی نێرگزەجاڕ هەر یەك بۆنن.
بۆنی شپرزەیی مەمو بۆنی لاولاو هەر یەك بۆنن.
زین بۆنی تانجیکی لێدێو
(مەم)یش بۆنی کەناری زێ.

(مەمو زین) ئەخوێنیتەوە.
پەنجەرەی مۆردو وەنەوشە
لەسەر شیعر ئەکەیتەوە.
خەیاڵێکی بۆندار ئەتبا؛
مەمو زین دێنە سەر تاقی پەنجەرەکەت
پەنجەرەکەت بۆنی جزیرەو بۆتانو دیجلە ئەگرێ.

بۆنی تاوانو مەرگەوەڕ هەر یەك بۆنن.

بۆنی بۆگنتك‌و[6] مەرگەوەڕ هەر یەك بۆنن.
لەگەڵ ئەستێرەی كشاودا ئەكەویتە ناو (وان)ەوە
لەگەڵ خولیای دڵداراندا ئەخولێیتەوە..
لەجەژنی خاك‌و درەختا
لەگەڵ خانی ئاگری نەورۆز ئەكەیتەوە
عەشقێك ئەتكا بەبڵێسەو بەبڵێسە
دارستان ئەنووسیتەوە.
بڵێسە بۆنی غیرەتی مەمی لێدێ‌و
قژی (زین)یش بۆنی زمان.

( لەنێوان من‌و زماندا
ئەوەی هەبوو هەر مەرحەبای ڕۆژانە بوو.
تا ئەو كاتەی ئێوارەیەك هات بۆ لام‌و
لەگەڵ خۆیداو لە هەورێكدا
خولیای شیعری بۆ هێنابووم
لەو وەختەوە ئیتر تەواو تێكەڵ بووین‌و
لەو وەختەوە ئەو بۆتە ژان‌و برووسكەو
لەناوەوە پێچ ئەخوات‌و
لەسەرەوە لێم ئەدات‌و
منیش باپووسكەی[7] بارانم.

---

[6] بۆگنتك: بۆنی میوەی رزیو.
[7] باپووسكە: كرێوەی بەفر بەباوە.

لەنێوان منو بۆنیشدا ئەوەی هەبوو

هەر مەرحەبای ناوبەناوی لای باخێكو

لای شاخێكو لای چەمێك بوو

تەنها ئەو وەختە تێكەڵ بووین

كە شەوێكیان لەگەڵ خۆیدا پڕ بەكۆشی ولاتەكەم

بۆنی سووتانو قرچانی خەونی ژنو

منداڵانی بۆ هێنابووم..)

دەشتی وەیس ئەیگێڕێتەوە:

وادەی كۆچی نارەوەن بوو. لەگەڵ بادی خۆش مروووردا.. هەناسەكان سەر هەڵئەگرن بۆ بیابان. لەگەڵ بادی خۆش مروووردا..

پەڕەسێلكەی فرمێسكەكان پووشو پەڵاش ئەگوێزنەوە. ئەستێرەكان بارگەو بنەی جریوەكان ئەپێچنەوە، بۆ یادگار ئەسرینی حوجرەو خانەقا ئەهۆننەوەو ئەیكەنە گەردنی غوربەت. باران ئەڕواو وادەی كۆچی نمەی شیعرە. باخان ئەڕۆن، وادەی كۆچی سنەوبەرە. لە نیشتمانی (بابان)دا جێی پەپوولە نابێتەوە. لە هێلانە بەردینەكەی دڵی دایكا. جێی كزەباو ئەم شەماڵە نابێتەوە. غەریبیی شەوێكی رووتی بەر لاسامەو[8] ناو تۆفانە. لەگەڵ هەموو هەنگاوێكی نارەوەندا، ئاخێك لە سینەی خاكەوە سەر دەردێنیو

---

[8] لاسامە: ریژنە باران.

هەڵئەتۆقێ. لەگەڵ هەموو شەقامێکی ئەم ئازارە کۆچەرەدا
داخێك لە سینەی بەردەوە دێتە دەرێو لەبەر گڕەی
سەبوونێکدا هەڵەپڕووزێ.
ئاوڕ لە چی ئەدەیتەوە؟
خواحافیزی لە کام وەفاو لە کام ڕەنگی کوژراو ئەکەیت؟
خوێنەکان ئاشت نەبوونەوە..
(میران) سەریان نەدا بە تۆو دایان بەدەم بای شێتەوە.
ئاوڕ لەچی ئەدەیتەوە؟
نارەوەن ئەڕواو لقی ئەو بەدەم وڕێنەی گەڵاوە
سەمایەکی دەروێشانە لەحزوری
بارانەکەی پەڵەی ڕۆحو عەشقا ئەکا!
بۆنی نارەوەنو بۆنی چارەنووسی نادیار هەر یەك بۆنن.
بۆنی خۆرنشینی وەیسو بۆنی ئەم کۆچە، یەك بۆنن.
بۆنی حوجرەو بۆنی بێزاریی یەك بۆنن.
بۆنی شێداریی تەنیاییو بۆنی سەفەری فرمێسكو
بۆنی سێوی سەرهەڵگرتوو
بۆنیماڵئاوایی دوایی هەر یەك بۆنن.
( ئەو.. سەرەتا
ئەو بەتەنها پڕیشکێکی تاقانە بوو
کە لە باڵی هیجرەت بۆوە.
ئەو.. سەرەتا
ئەو بەتەنها دڵۆپێکی تاقانە بوو

که دیدەی حەسرەتێ ڕشتی.
پریشك کەوتە ناومانەوە
دڵۆپ کەوتە ناومانەوە
تەماشاکەن! لەوساکەوە..
پریشك چۆن بوو بەم ئاگرەو
دڵۆپ چۆن بوو بەم زەریایەو
تەماشاکەن! ئاوو ئاگر بەیەکەوە
هەتاکو کوێ تەنینەوە!.)

پەنجەرەی ژوورەکەت ئەڵێ:
کەپووت بووە بە کەپووی چوخمەو شەقامو ئیستە
بۆنی شەوەزەنگو ئیستە بۆنی گەرمەسێرو ئیستە
بۆنی گوڵە لیمۆی ئەوینێکی تازە ئەکەیت!

وا بۆن بووە بە چاوو گوێ
بەبۆن ئەبیسیو ئەبینی
(ئەڵلاوەیسی) بۆنی پێدەشتو گژوگیاو لۆشی[9] لێدێ.
(ئەڵلاوەیسی) بۆنی مامز ئەهێنێتە ناو ژوورتەوە
ئیستە بۆنی دەنگی (عەلی مەردان) ئەکەیت
بۆنی عەشقێ لە گەرمادا ئارەقی کەرکوك دەرئەداو
زەنگوڵ زەنگوڵ بەلاملی زەنگەنەدا دێتە خوارێ.

---

[9] لۆش: ناوی گیایەکی بۆنخۆشە.

بۆنی عەشقێ: لەژێر سێبەری کەپرێکی باڵای (شوان)دا
ئەبێ بەمسکی ئاسکێو بەرامەکەی سیحرێکی نوێت
پێ ئەبەخشێ. بە رێو بانی بۆندا ئەڕۆی. ئەگەیتە
مەنزڵی (خاوکەر) لەوێ بۆنی سملی مێژوویەکی دوورو
بۆنی خاڵی کوتراوی سەر هەنیەو چەنەو بۆنی لبادو سەر
زینو جاجمێکی کۆنە ساڵو بۆنی نانی جۆی برژاوو
کاڵەکی نێو بێستان ئەکەیت.
گڕە ئەڵێ: بۆنی هەڵقرچانی کسپەو
بۆنی گەرمییانو بۆنی برین هەر یەك بۆنن.
کەپووت بووە بە کەپووی دەشت:

لە شەواندا بۆنی لەتانی[10] چوار دەورو، بۆنی تریفەی
فێنكو تروسکایی گوڵ ئەستێرەو بۆنی ناسۆر هەڵئەمژیی.
بە ڕۆژ بۆنی ئاخاوتنی زمانێکی قەندەهاریو بۆنی سادەیی
مرۆڤە دڵ گەورەکان هەڵئەمژیی.
سەر ئەکەیتە سەر ڕانی مێرگ
خەوێك دێتە باخەڵتەوە..
بۆنی ڕەشکەو خەنەی لێدێ.. ئەو ئەڕواتو خەوێکی
دی بە کاوخۆ دێو ئەمجارەیان ئەم خەونەیان
بۆنی پونگەو مەشکەی لێدێ.
( تەواو هەر بە وێنەی قەتێ

[10] لەتان: کرێو بێدەنگیی تەواو.

تا وشەم نەجووڵێتەوە
لە خاکی جوێ ناکەیتەوە.
وەکو بەڕووی دووانەی بەیەکەوە نووساو
وەهان پەنجەمو پەنجەی بەرد
تەواو هەر بەوێنەی خۆشاو
هەتا دەنگم نەخۆیتەوە
تامی نووسینی من ناکەیت.
گوێم لێ بگرە! خرمە خرمی دەنکە تەرزەی
سەر ڕەشماڵو بارینی وشەی ناو سەرم
هەر یەك شتن.
تۆ ئەم خەیاڵانەم بۆنکە
یان بۆنی نانی سەرساجو یاخود بۆنی
دەنکە قەزوانی شینی ناو کاسە دۆیەکیان لێوەدێ.
من بەسەری سەدەی بیستو یەکەمەوە شیعر ئەنووسم
بەڵام هەرگیز نیازم نییە کوڵەباڵو
کەپەنكو فەرنجیو شاڵو فەقیانە
لە شیعرەکانم داماڵم!)

بەڵام کەپووم نەبوو بە کەپووی کوێستانو گەرمییانو
کەپووی ژیان. تا بۆنە ناخۆشەکانم هەڵنەمژیی.
هەتا بۆنە هەرە هەرە چەوساوەکان، هەرە هەرە بەدبەختەکان
هەرە هەرە خوێناویەکان، هەرە هەرە زۆردارەکان

هەرە هەرە دیلەکانم هەڵنەمژیو هەر هەموو کاسیان نەکردم!.
بۆنی کۆڵانە گولەکان.. لەساڵی رشانەوەدا..
بۆنی هەڵقرچانی پێستی دەردەداران. بۆنی تاریکایی
زیندان.

بۆنی ترس. بۆنی نەبوونی. بۆنی قامچی. بۆنی
جەستەی ئەسپێونی سیاسەتو بۆنی کاکۆڵی رشکنی
باپیرانو بۆنی باتلاَخی سەدەی درۆو بۆنی قەنارەی
چوار دەورو بۆنی ئیدریسی بدلیسیو بۆنی دزان.
بۆنی خیانەتو بۆنی کەلاکی تۆپیو یەك بۆنن.
بۆنی چڵكو بۆنی سووخۆرەکانی سیاسەت هەر
یەك بۆنن .

بۆنی بۆگەنکەو[11] دیکتاتۆر
بۆنی لوتاوێژو[12] بۆنی چەتەکانی میلیشیاو
بۆنی شەڕی براکوژیو بۆنی دزو ئاپخانەکان هەر
یەك بۆنن

**( بۆگەنکەی دزو پیاو کوژان لە لوتاویژی ئەمڕۆدا.**
**کامێرای شاراوەی شیعرو چەندین کورتە دیمەنو**
**کورتیلە چیرۆکی ناو ئەم بۆننامەیە )**

---

[11] بۆگەنکە: ئاژەڵێکە لەڕێوی بچوکترە، لەبەر ئەو بۆنە ناخۆشەی لێیدێ هیچ ئاژەڵێکی تر ناتوانێ بچێ بەلایدا.
[12] لوتاوێژ: بۆگەنی ئەوتۆ کە مرۆڤ ناچار ئەبێ لوتی بگرێ.

**یەکەم:** وەختێ باڵات هەرمێی ئەگرت

ئەو گوندانە بۆ ئەوینت دڵیان هەموو بەرچنە بوو.

( تۆ بۆنی بارانی پەڵەو

بۆنی سەمەلت گرتبوو)

وەختێ دەستت جۆگەی ڕوونو

سەرت گوڵە بەڕۆژە بوو

ئەو دەشتانە بۆ ئەوینت لەشیان هەموو

ئاوێنە بوو

(بۆنی لیڤای[13] تازە زاوو

بۆنی سەوزەگیات گرتبوو)

گوندەکانیش، ئاخ گوندەکان !

ئەوەی مابوون

وەکو کاوڕ سەرت بڕین

هەتاوت وردو خاش کردو

ئاوت کوشتو

ئاوێنەکانت کوێر کردو

بەرچنەت پڕ کرد لە برین.

تۆ ئێستاکە ئەو باڵایەی کرم ئەگریو

ئەو مێژووەی ئەتکی ڕۆژگارت ئەکەیتو

ئەو دەستەیشی

کە شەو داهات

---

[13] لیڤا: بەرخی تازە زاو.

مەمکی دایکی خۆت ئەدزیی !

( **تۆ ئێستاکە بۆنی ئاودەستی مزگەوت و**
**بۆنی کاولاشی ناو گوندو**
**بۆنی مەیتخانەت لێوەدێ** )

**دووەم:** درەنگانێ لە ژوورێکی لەش قوڕپیندا
چرایەك ئەکوژێتەوەو
ژنێك هێواش درێژ ئەبێ و
لە تابوتی کوڕەکەیدا شیعرێکی ڕەشپۆشەو ئەنوێ.
لە خەویا ئەیبینێتەوە.. دێتەوە ماڵ
باوەشی پڕە لە مۆمی داگیرساوو
قژی بووە بە گوڵ هەنار.
- بۆنی هاوینی لێوەدێ -
لەخەویا ئەیبینێتەوە.. تاقانەکەی کەڵێکە سوور
دێتەوە ماڵ
لەسەر تەختی نێوچەوانی بە گەورەیی
ناوێك. ناوی جەللادەکەی هەڵکەنراوە.
ژنە بەدەم شەپۆلێکی زریکەوە دائەچڵەکێ و
هەموو لەشی ئەنیشێتە سەر بۆنی ترس..
چەند دەقیقەیەك درەنگتر.. لە ژوورێکی مەڕمەڕیندا
چرایەك ئەکوژێتەوەو

پیاوێك هێواش پاڵ ئەکەوێو
لەناو لۆکەی خەودا ئەنوێ
- بۆنی دەسەڵاتی لێدێ -
لەخەویا ژنێك ئەبینێ بووە بە هەورێکی شێتو
بووە بە شەوێکی شێتو
دێتە ماڵێ.
ژنەکە ئەناسێتەوە
وەختێ ئەگاتە بەردەمی
ژنە دەستی درێژ ئەکاو
چەرمی سکی ئەکاتەوەو
سەری کوڕەکەی دەردێنێو
بەرامبەری ئەو ڕای ئەگرێ.
پیاوەیش بەدەم هاوارەوە دائەچڵەکێو
لەشی بۆنی تیژی رقو
چاوی بۆنی تۆڵە ئەگرێ
(بۆ بەیانی
هەر لەبەر ماڵە تابووتدا
لانکرۆزەرێ، گای ئاسنەو بەهەجۆکەو[14] ڕائەوەستێ
لە پشتەوە چوار چەك باز ئەدەنە خوارێو
ئەمجارەیشیان دەرگای تابووت ئەشکێننەوەو
بۆنی تاوانیان لێدێتو ئەچنە ژووری!).

[14] بەهەجۆك: توورەو عەصەبیو شێتگیریی.

**سێهەم:** -   نابێ ئەبێ شتێك هەبێ

ئەو بێشەیەی شێت کردبێ

ئەگینا بۆ دێتە سەر ڕێم.. یەخەم ئەگرێ !؟

- ئەی تەورەکەت لەبیرچۆوە؟!

- نابێ ئەبێ شتێك هەبێ ئەو چەمەی تووڕە کردبێ

ئەگینا بۆ وا چەمووشەو ئەمداتە بەرچەپۆکانی ئاوو

واخەریکە هەر بەڕاستی بمخنکێنێ.

- خۆت گێل مەکە

ئەی تۆ جۆگەیەکیت نەکوشت؟!

- نابێ ئەبێ شتێك هەبێ ئەگینا بۆ باران ئەمساڵ

هەر سەرێکیشی لێ نەدام؟!

- ئەی شارای پار کێ سووتانی؟!

- نابێ ئەبێ شتێك هەبێ ئەگینا بۆ

ئەو شەقامەی بیست ساڵ بوو هەر دەستی خۆم بوو

کەچی ئێستا کە ئەمبینێ ڕوخساری خۆی وەرئەگێڕێ‌و

لەو بۆنە خۆشەی جارانیم پێ نابەخشێ؟!

- خۆت گێل مەکە

ئەی ئەو شەوەت لە بیر چۆوە

چوویتە سەری چاوت دزی‌و ئاودیوت کرد؟!

**چوارەم:** نەهێنیم لای شەوێك دانا

بۆ بەیانیی کە چوومەوە

نەهێنیی بوو بوو بە مەڵو باخی گشتیی

- بەڵام مەلو باخی گشتییان لێ دزیم -
لە باخیشدا چەند خەونێکی خۆم شاردەوە
وەختێ دەرمهێنانەوە .. خەون بوو بوون
بە نوقڵو بە بووکە شووشە بۆ زارۆکان.
- بەڵام نوقڵو بووکە شووشەیشیان لێ دزیم -
لەناو کونە شاخێکیشدا
هەندێ خۆزگەی خوێناویی خۆم شاردبۆوە
کاتێ دەرمهێنانەوە..
ئەو خۆزگانەیش بوو بوون بە تاراو بە مۆمو
بوو بوون بە پۆلێ حەیرانی دوای راپەڕین
- ئەوانەیشیان هەر لێ دزیم -
لە ئیستەیشدا وابەنیازم هەرچی سروودێکم هەیە
هەرچی باهۆزێکم هەیە لە قەڵای گیانی ئێوەدا بیشارمەوە
تا ئەو ڕۆژەی هەڵئەکەنو
مەلو گوڵو باخی گشتیو تاراو مۆمم
لەسەر باڵی حەیرانەکان بۆ دێننەوە!

**پێنجەم**: من ئەمبینیت
وەرز وەرزی بەفرانبارو باپووسکە بوو
کەچی لەناو لەپی دەستتا
گوڵە خۆری تیا ئەڕسکاو
شانو ملت بۆ باڵندە کێویلەکان هێلانە بوون.
لە گیرفانتا هەر بەتەنها پووکە پووکی نانە وردەو

لالانەوەی وردە چەوو، وردە بزەی منداڵانو
دوو سێ شیعری ڕاونراوی ئێمەی تیا بوو..
بەرباخەڵت ڕۆژژمێرێکی قوڕاویىو
دوو تاڵ قژی چیرۆکێكو
هەندێ ڤیژەی تەڕی دەشتو
چەند ئاخێکی ساردو سڕی شاری تیا بوو.
لە سەردەمی ژانو گوڵدا.. تۆ ئەتتوانی:
بە وردە نان.. دەغڵی ئەوینی ئەو خەڵکە هەمووی بکڕی.
بە وردە چەوی گۆرانیی، شەدەی سەری هەرچی شەپۆلی ڕووبارە بیانبەستی.
بە تاڵە قژ.. دارستانەکان بێنیتە جێگە ژوان.
بە خوێندنەوەی دووکەڵێکی ناو ڕۆژژمێر..
سامالْ ببەیتە ئەشکەوتو
بە ڤیژەی تەڕ هەوری نەزۆك ببارێنیو
بە بەردە ئەستێی هۆنراوەیش بەژنی شەوگار داگیرسێنی.
من ئەتبینم.. لە زەمانی
شەمشەمە کوێرەو.. قاچاخچیو
لە سەردەمی سیاسەتو زەلکاویشدا..
سەرت بووە بە جامخانەی ئاڵتونچییەکان
ئەیناسمەوە: ئەو هیلالە هەڵواسراوە
دەمو چاوێکی دزراوی مانگی بێوەژنی منە.
من ئەتبینم: گیرفانەکانت پڕن لە قاقای باڵەخانەو
پڕن لە باوێشکی خانووی زەوت کراو..

هەر هەموویان ئەناسمەوە.. ئەو پێکەنینی یاقوتو پیرۆزانە
خوێنی بەردو مەوجدانەوەی ئازارێکی شینی منە.
لە بەرباخەڵتا مێژووی دز کڕ کەوتووەو
رۆژگاری پیس هەڵ ئەهێنێو
من ئەیبینمو ئەیناسمەوە: ئەو ملوانکەی مرواریەیش..
کە لەملی کۆشکێکتایە.. ئەوەیش هەر سیو دوو دانەکەی
هەڵوەریوی.. شەقامێکی جەستەی منە.
تۆ بۆنی شەمشەمە کوێرەو
بۆنی.. بۆدڕی حەرامو
بۆنی.. لاستیکی سوتاوو
بۆنی.. ڕشانەوەت لێدێ !.
بۆن ڕێگامەو
ئەمباتە ناو کون بە کونی ڕەنگو دەنگو تەماشاوە
تۆ هەتا بۆنی بەزەییت لەلا خۆش بوو،
راکشابووی.. قاچت نەبوو..
هەتا بۆساردی بێوەییت بۆن ئەکردو
هەر بۆنەکانی هێورییت هەڵ ئەمژیی
تۆ خەم ساردبووی.. دەستت نەبوو
کە بۆنی یاخیی بوونت کرد.. ئیتر ئەوسا هەستایتە پیان
کە بۆنی تووڕەبوونت کرد.. ئیتر ئەوسا تۆ لەناو بۆندا هەڵتکرد.
بۆنی سوور لەشتی داچڵەکان، باگەڕی[15] بۆن گێژی دایتو

[15] باگەڕ: گەردەلوول.

بارانی بۆن تەڕیانکردی‌و بووی بە ئاسمان.
بۆنی یاخیی بوون‌و بۆنی ئەسپە کەحێلەکان هەر یەك بۆنن.
بۆنی ڕاپەڕین‌و بۆنی هەڵۆ قرمزیەکان هەر یەك بۆنن.
من ئەبێ دانی پێدانێم
بۆنی گەلێ وشەو ڕستەم
بۆنی ڕۆحیان تێکەڵ نەبوو
بۆیە هەر زوو بابردنی.
من ئەبێ دانی پێدانێم
لە جێی ئەوەی شیعر بکەم بە مرواریی بنی زەریا
کەچی بۆ خۆم من کردمن
بە تەختەو پووش‌و پەڵاش‌و
ئاوەڕۆی لیخن بردنی.
لە تاقەکانی ژوور سەرما
من گوڵدانی بۆنم زۆر بوون
بەڵام بە یەك ڕۆژ دوای مەرگی (کانی عاشقان)
گشتیانم دەرهێنایەوەو لە بەردەمما ریزم کردن:
سەرلەنوێ بۆنم کردنەوە
گوڵدانی فرمێسکم.. شکان.
گوڵدانی بەزەییم.. شکان.
گوڵدانی هێوریم.. شکان.
گوڵدانی بێ دەنگیم.. شکان.
ئەوەی بەتەنها هێشتمەوە

هەر گوڵدانی بۆنی گیانی (راپەڕین) بوو.

چیا ئەڵێ:

بە دەم چریکەی بەردەوە.. تۆیش باڵت گرت.

بە دەم ئاوازی ئاوەوە.. ئەبووی بە پژەی گۆرانییو

لە ڕووخساری خۆشەویستیی هەڵئەپرژای..

بەفر ئەڵێ.. حیکایەتی سپیی ئەڵێ:

نەهێنیو کولوو سپیی بوون.. خوا سپیی بوو

لە ئاسۆیەکی سپیدا بۆنی رەنگە سپیەکانی

ئەودیو خەیاڵی خۆت ئەکرد

نەتئەزانی لەبەرچی لەناو سپیاتی تەماشاتا

(مەحوی) دێتەوە پێش چاوت؟! ئەتبینیەوە:

هەردوو دەستی لقە زیو بوون، ڕوانینەکانی پەموو بوون.

چاوەکانی گوڵە هەرمێی بەیانیانو هەورێکی خاو کاکۆڵی بوون.

نەتئەزانی ئەم خەیاڵە سپییەی تۆ

بۆچی بەردەوام پرسیاری سپیی ئەگرێ؟

نەتئەزانی بۆچی (مەحوی) هاتۆتە لات؟! لێی ڕائەمای،

سەری نیشانەی پرسیار بوو.. پریشکی ئاگرێکی سپیی لەناو ڕیشیەوە

ئەباریی. برۆی پەپوولەی سپیی بوون. لێی ڕائەمای:

هەستت ئەکرد هەموو جارێ مۆمی سپیی ئەتوێتەوەو دیسان

دروست ئەبێتەوە!. لە (مەحوی)دا تۆ ئەتبینی:

زمان بووە بە نوری خوا، وشە بووە بە گەردیلەی تیرێژێکی

نەهێنیی خوا. هەستت ئەکرد، ئەوەی کە مەحوی ئەیبینێ
تۆ نایبینی. هەستت ئەکرد ئەوەی مەحوی بۆنی ئەکا،
بۆنی ناکەی، تۆ ئەتبینی خەون ئەچێتە سەر ڕانیو شیعر
ئەنووسێ. وەجدێك ئەبێ بە خەرمانەو دایئەپۆشێ.
لەناو یەك دەنکە گەنمدا ئەبێ بە تاڤگەی شیرو لەسەر باڵی
یەك پەروانەیش بەرەو ئیشراق ئەسووتێتو ئەتوێتەوەو هەڵئەکشێ.
بۆنی مەحویو بۆنی نەهێنیی مردنو
بۆنی باروونەو[16] گومانە جوانەکانیش هەر یەك بۆنن.
بۆنی ڕەنگە سپیەکانو بۆنی کازیوەو ئیشراقو
بۆنی وەجدی پڕ پەپوولەو یەزدان یەکن.
(مەحوی) ئەمخاتە ناو گەرووی پرسیارەوە
ئەمکا بە سۆراخێکی وێڵ،
لە نێوانی رەحمو قەبرا.
(مەحوی) ئەمخاتە ناو دەنگی گومانەوە.
(مەحوی) ئەمخاتە ناو بۆنی گومانەوە.
(مەحوی) ناهێڵێ داسەکنێم لە مەنگیدا
ئەمداتە دەست گەرداوی شێت
ئەمداتە دەست پرسیاری شێت
لە نێرینەی وروژانی قوڵاییدا !.
ئەمداتە دەست گێژەنەکان
نامداتە دەست گوڵو لمو

[16] باروونە: ناوی رووەکێکی بۆنخۆشە.

به چەقەنەی دانە بەردو ناو تەڵزمی بووندا  ئەمبا.
ئەو پڕوپووچیی ژیانو ئەو پڕوپووچیی مردنو
تراویلکەی ئەم سەفەرەی
نێوان  بێشکەو گۆڕەکەی خۆم نیشان ئەدا.
(مەحوی) ناهێڵێ داسەکنێم وەکو (وەڵام)
(مەحوی) ناهێڵێ من هەرگیز سەقامگیربم وەکو (یەقین)
بۆیە ئەو منی کردووە
بە هەڵچوونو بە داچوونو
بە زمانێکی دڕدۆنگو بە شیعرێکی پڕ لە (بەڵام) !



بۆن ڕێگامەو قیبلەنماو
ئیتر ئەمبا.
بە تەوێڵی ئەو کێوەدا دڵۆپی نوور هاتە خوارێ
ڕاستیی بۆنی خودای لێهات.
لە هەناوی دۆزەخەوە ئەهرەمەنێ هاتە دەرێو
دۆزەخ بۆنی  درۆی لێهات.
(قابیل) ڕقی تیژکردەوەو
شەڕ بۆنی مردنی لێهات .
بەیانییەك خۆشەویستیی لە کازیوەدا هەڵقوڵیو
هەتاو بۆنی عەشقی لێهات.
تا ژن نەبوو بەهەشت بۆنی لێوە نەهات.

گوڵ بۆنی منداڵیی گرتو دڵنیایی بۆنی ئاشتییو
خیانەت بۆنی تاریکییو خاك بۆنی قوربانیی گرتو
نیشتمان بۆنی دایکانو ئازادیی بۆنی ئاسمانو
لاوێتیی بۆنی بەهێزییو پیرێتیی بۆنی لاوازییو
زەریا بۆنی بۆنەپندیو گومانیش بۆنی هەموویان.
لە نزیکی منیشەوە شیعر بۆنی خەونی گرتو
برسێتی بۆنی وەزەنو، وەزەن بۆنی چەوسانەوەی گرتو
کوردستانیش هی هەر سێکیان!
چیا ئەڵێ
حیکایەتی پشکۆ ئەڵێ:

عەشقێکی سەرکەش بردیتی. کەوتیتە ناو دۆزەخێکی مێژووەوە.
بەهەشت قرچە قرچ ئەسووتا. گوناهەکان لە ئاگردا پژوپۆی
نوێیان دەرئەکرد. گەورە ئەبوون. چیلکەو چەوێڵو ساورمە[17]
لەشی تۆ بوو. کەوتیتە ناو جەهەننەمی ئەم دنیاوە..
لەناو شاخدا کەڵەکێوی قۆچەکانیان داگیرسابوون.
لەناو شاردا سەری دژیای[18] ژنەکانیش مەشخەڵان بوون،
بێشەیەك بوون لە پرسیارو لە مەرگی خۆیان ڕامابوون.
تۆ بەتەمای حۆرییەك بووی وەکو زنە بۆت هەڵقوڵێ
تۆ بەتەمای ئەسپی سپیی نێو داستانی خونچەو سووتووی
نیشتمان بووی. تۆ بەتەمای زیندووبوونەوەی قوربانییو

[17] ساورمە: داری وشك.
[18] دژیا: بژو ئاڵۆز.

گەڕانەوەی (پەری خان) بووی، تۆ بەتەمای دەستی
ئاو بووی.. قوربانیەکان: ڕۆژهەڵاتی سروودت بوون.
قوربانیەکان: چرای شەوی بەربارانی ڕێی سوورت بوون.
کەوتیتە ناو دۆزەخێکی مێژووەوە . قوربانیی تڵەتڵ[19] سووتا.
باران سووتا. سروود سووتا. ئەوەی بەتەنها نەسووتا هەر تاوان بوو.

سەربەستیی بوو بە کێلانی خەنجەرێکو
خوێنی هەتاوی لستەوە.
ئازادیی بوو بە لەزاگی[20] بارانەکان.
ئازادیی بوو بەگۆرانیی چەقۆکانو
بە پلیکانەی دزەکان.

**﴿ چیرۆکی ئەو تەوارە بێوەژنەی دوای هەڵۆکەی مێردی بوو بەهاوسەری برسێتیو بۆسۆی تەنیاییو نائومێدیی لە سنگی داچەقاوێوە گەیشتە کە پووی ئەم بۆننامەیەیش ﴾**

لە حەوشەی پایزدا
دوا ئاراو ئەڕێژێ
تەنیاییو بێ پیاویو جلی ڕەش
پێکەوە ئەگوشێو ئەچێتە سەربانو
بە پەتی تەنافدا، جلەکان، خەمی تەڕ
کلۆڵیی خوساوو برسێتیی شیتاڵو
شەوانی نسرمی بێوەژن.. هەڵئەخا

[19] تڵەتڵ: کڵپەو نێڵە نێڵی ئاگر.
[20] لەزاگ: تابووت.

- ئەو بۆنی قوژبن‌و سیسرکی گرتووە -
ئەڕوانێ بۆ دوور دوور
لە پەڵە هەورێکی سپیدا
روخساری ئەسمەری مێردەکەی ئەبینێ.
ئەڕوانێ بۆ نزیك.. بۆ خوارێ‌و
لە ژاڵەی حەوشەدا
برینی گەشاوەی سەرسنگی ئەبینێ.
- ئەو بۆنی خوێنێکی مەییوی لێوە دێ -
بۆ لای راست ئەڕوانێ‌و ئەوەستێ
لەودیوی دیواری حەوشەوە.. بە ڕێگەی خۆڵێندا
کاروانێ ماشێنی چەکداری ڕەنگاو ڕەنگ ئەبینێ
بریقەی دۆشکایەك
ئاوێنەی مێژووی دز
ڕێك ئەیدا لەچاوی
لە پشتی یەکەمین جامەوە، روخساری بەهاری
هاوڕێی جارانی مێردەکەی ئەبینێ
دوو دەستی ئاڵتوونیی‌و سەعاتی ئاڵتوونیی‌و
دوو لێوی بە خەندەی ژنێکی ئاڵتوونیی تەنیشتی ئەبینێ.
کاروانێك تیژ ئەڕوا
تەپو تۆز روخساری ئەسمەری پیاوەکەی
ناو هەور دائەگرێ‌و لە چاوی ون ئەبێ.
خۆڵ بەسەر ژاڵەدا ئەبارێ‌و

تەنافی جلی تەڕ، خەمی تەڕ، پیس ئەبێو
ئەمیش وەك گوڵ هێرۆی لەوتانی
غەمگینو خۆڵاویی
لە گڵی سەربانداو
لە شوێنی گریانی تەنافدا ئەچەقێ!

ئازادیی بوو بەگۆرانیی چەقۆکانو
ئازادیی بوو بەگیرفانی جەردەکانو
بە بەرماڵی تەورەکانو
ئازادیی بوو بە زەڕەنگەر لە گوزەری سیاسەتداو
بوو بە بازرگانی جوملەی درۆی ڕەنگین
لە نێوانی شارەکانداو
ئازادیی بوو بە پیکابی تایەی قاچاغ
کێ ناونیشانی تەواوی ئازادیم نیشان ئەدات؟!
ئەم وشەیە بەپەنگ بووە
ئەم چرایە تەفرەدەری ڕێگاکانەو هەموو دەستێ هەڵیئەگرێ.
دەستی مەزدەو دەستی باران
دەستی خەلیفەو شمشێریش.
دەستی دار زەیتونو شیعرو
دەستی عیساو دەستی تەوریش.
هەموو یەخەیێ، بەرۆکێ، سەرو قژێ، ئەم گوڵە جوانە
درۆزنە، ڕمووزنە، ئێسك سووکە، ئەم گوڵە بێوەیو دڕندەیە

بێ جیاوازیی ڕەنگو ڕەگەز بە یەکسانی ئەدەن لەخۆ:

یەخەی حەجاج.. یەخەی حەللاج

سنگو بەرۆکی ژان دارکو، ئەگریجەی تانسۆ چیللەریش

قژی بێستانی هاوینەو.. قژی ئاوێکی بۆگەنیش

دڵی غاندیو مارتن لوثەرکینگو

مەرگەوەڕو ئەتاتورکیش.

هەموو قوڕگێ ئەم بانگە سپیو ڕەشەی

ئەم گمەی کۆترو ئەم قیڕەی قەلو داڵەی

لەسەر خۆی تاپۆ کردووە

ئەم وشەیە بەپەنگ بووە..

ئەم وشەیە پەشتەماڵێکی گوڵ گوڵە ئاخر کێ نایگرێتەوە؟!

پەشتەماڵی شۆڕشگێڕان، پەشتەماڵی دەوڵەتانو

پەشتەماڵی پارتیەکانو پەشتەماڵی گومرگەکان!

کێ ئەتوانێ ناونیشانی تەواوی ئازادییم باتێ؟!

هەموو بۆنەکان تێکەڵ بوون.. لەناو یەکدا ئاڵۆزکاون..

کەپووم لێیان هەڵ ئەنووتێ. بۆنکردنم چەواشەیە.

کێ ئەتوانێ بمباتە سەر جێ نزرگەی بۆنی ڕاستیی؟!

ئەوەتا ڕیشی کاسترۆ بۆنی تکریتی لێوەدێ

چەپ بۆنی ڕاستی لێوە دێو ڕاست بۆنی چەپی لێوەدێ.

لە ڤیستیڤاڵی پۆشینی دەمامکدا من شەوێکیان لە جەللاد

نزیك کەوتمەوە. جەللاد لەگەڵ قوربانیدا هەڵئەپەڕیو

ئازادییش یاساوڵیان بوو. لەو شەوەدا سەری (بێکەس)و

(مانگ)م دی لەسەر خوانی بازنەیی دالآشێکی پیرەلۆکە بەیەکەوە
دانرابوون، ئازادییش فەزای ژووریان بوو.
لەو شەوەدا
سەری گیڤارام ئەبینی بەلەشی ناپلیۆنەوە. لەشی بۆکاسام
ئەبینی بەسەری ژان ژاك ڕۆسۆوە. دەنگی غاندیم گوێ
لێ ئەبوو بەڵام دەمیش دەمو لێوی (مۆبۆتۆ) بوو. من
سەری لۆرکام ناسییەوە کەچی دەستی دەستەکانی فرانکۆ
بوو. لەو شەوەدا بۆنی جەللادو قوربانییو بۆنی فریشتەو
دڕندە چون بۆنی گوڵو شیاکە تێکەڵ بوو بوون.
کێ ئەتوانێ ناونیشانی تەواوی ئازادییم باتێ؟!

ئەو کورسییە کورسیی چراو پەروانە بوو
تەماشاکەن لە ئیستەدا کێ لەسەری دانیشتووە؟!
ئەو کلآوە کلآوی کلآوکوورەکەی باخی میری هەڵەبجە بوو
تەماشاکەن لە ئیستەدا وا لەسەری چ تەیرێکا!
ئەو گوارەیە گوارەی گوێچکەی دارسێوێکی شەقلآوە بوو
تەماشاکەن لە ئیستەدا وا لەگوێچکەی چ دارێکدا.
ئەو قەڵەمەش قەڵەمی پەنجەی گزنگو کازیوە بوو
تەماشاکەن لە ئیستەدا چ پەنجەیەك پێی ئەنووسێ
ئەو بۆنەیش بۆنی گیراوەی گوڵجارەکەی لەشی من بوو
تەماشاکەن لە ئیستەدا چ زەلکاوێ ئەیدا لەخۆی!
ئێمە میوەی ناو باخەکانی دروشمی دیموکراتیی سەر دیوارین

خێڵێ ئەمانخواو خێڵێ ئەمانجوێو تلێپەمان تف ئەکاتەوە.
ئێمە شەهیدی نەمریین هەموو جارێ دەقیقەیەك لەبەر
ئاوێنەی خوێنماندا ڕائەوەستن، بە بێدەنگیی قژی خەمیان
دائەهێنن - سوپاس.. سوپاس - . ژنەکانیشمان چەند
سالێ لە بەردەرگای پۆلاییینی بیروباوەڕدا ئەچەقن، برسێتییان
ئەیکا بە هەراو قرە قڕ. هەر بۆ ئەوەی ڕێیان بدەن بچنە ژورێو
خواوەندێکی نان ببینن. ئێمە تەلی زەردی کارەبای دزراوین.
بەلام دوایی لە پایتەختە هێژاکانی دراوسێدا، دوای توانەوەو
تێکەڵکردن ئەکرێین بەزێڕ (تێبینی: گوایە ئیتر چیتان ئەوێ!)
ئێمە بە قیست ڕیش ئەهێنین لەولاو ئێمە بەکاش خیانەتی
چاوڕەش ئەکڕین لەم لاو، ئێمە بەگۆڕینەوەی گوێچکەو دۆلاریش
سۆپەرمارکێت، ڤیڤۆ، ئیڤا[21] ئەکەینەوە لە ئەوروپا !



هەموو رۆژێ لەو مەرزانە
سیاسەت شیشی گومرگەو
ئەچێ بە قەبرغەی نیشتمانی هێژاو خۆشەویستدا
ئێمە ئیستە وەتەنێکمان هەیە کون کون
بووە بە بێژنگی مەرگو.. شاری پێ ئەبێژینەوە..
سەری پێ ئەبێژینەوە.. خوێنی پێ ئەبێژینەوە.. کۆستی پێ ئەبێژینەوە..
کێلی پێ ئەبێژینەوە..

---

[21] ڤیڤۆ، ئیڤا: ناوی بازاڕی گەورەی هەمەچەشن بە سویدی، وەکو سۆپەرمارکێت.

نیشتمانە نازدارەکەم
چەند ساڵ بوو مۆزی نەدیبوو
رۆژێکیان دیی هەتا شەهیدی ئەم رایکرد
قاچاخچیەکان توێکڵەکەیان بۆ هێشتەوە
نیشتمانە نازدارەکەم.. چووە سەریو
هەڵخلیسکاو بەدەمدا کەوت !.

سەرمان کولانەی سەگەلی
پەیڤە درەکانی خانو سوڵتان بووە.
(مانگ) لە ئاسمانەوە وتی:
بۆ ئەوان پەیڤی ماڵیی بوون
بۆخۆیشتان دیرۆکی هەوشار!
شاعیرێکیش لەسەر بانیژەی عەشقەوە هەردوو دەستی
هەڵدایە ناو دۆزەخەوەو شیعری سپارد بە ئاگرو ئەوسا وتی:
نیوەی هۆشی ژەنگ گرتوومو نیوەی جەستەی تەم
گرتوومو نیوەی دەنگی تلیساوەو نیوەی سەرنجی قرچۆکم
بۆنی بۆخنکی عەجەمو بۆگەمرخەی[22] رۆمی لێدێ.
نیوەی مێژووم مەیمونێکی دەم بەخەندەی لەش سووک
بووە. نیوەی جەستەم لێبووک بووە. نیوەی پەیڤم
قەڵافەتی درۆی کەتەو زرگی دەروێشی قاجارو ناڵی

[22] بۆخنکو بۆگەمرخە: گیای بۆگرتوو کە ئاژەڵ نایخوا.

سوارەی حەمیدیەو قلیانەکەی مەنسور بیللاو
نیوەی مێژووم لە شەوانی چوونە پەردەی بابی عالیو سەلّتەنەتا
بەربووك بووە!
ئەمە سەرە
یان پاژنەکێشی پێلاّوی میرالاّکان؟!
هەر دوێنێ بوو لە تەنەکەی زبلّی بەردەم مالّەکەی ئەنوەر
پاشادا لە ئەستەمولّ گندۆرەی سەری گەنیوی خۆم بینیەوە
تووڕدرابوو. تووڕ درابووم. من توێکلّێکی لول خواردوو بووم
لەو زبلّەداو هەر خۆیشم خۆم ئەلستەوەو هەر خۆیشم مێشو
مەگەز بووم وروکابووم.

ئەمە سەرە
یاخود مەنهۆلّی زێرابە؟!
پریشکێکی نیگام هەبوو
بردیان بۆ ئەوەی مۆمێکی لە حەرەمی خەلیفەدا
پێ هەلّبکەن. مۆمیان هەلّکردو چاوی من نەهاتەوە.
یاقووتێکی خەونم هەبوو. تووتییەکی خۆم فڕاندی
یاقووت ون بوو.. تا شەوێکیان
لە جەژنی سەری سالّدا بوو
لە پەنجەی ژنە تورکێکی مۆدێرندا من دیمەوەو
ناسیمەوەو.. خوێنی خۆم بوو ئەیجریوان!
ئەمە مێژووە من هەمە

**یان حەماڵی هەزارساڵەی خانو سوڵتان؟!**
**ئەمە وڵاتە من هەمە**
**یان عەرەبانەی دەسگێڕی برینو ژان؟!**

**ئەرێ (میرۆ) ئەوە کام (با) قەفی سمێڵی تۆی فڕان؟!**
**لە کام شەوداو کامە دزبوو لە پەناوە سەری دزیت؟!ئەوە کام**
**جرجی شەوگار بوو کرکراگەی رۆژگاری تۆی کرانەوە؟!**
**کامە پشیلەی کێویی بوو هەر بەکاڵیی هەموو غیرەتێکی خواردی؟!**
**ئەرێ (میرۆ) بۆ ناپرسی کێ حیلەی شاخی خەسانی؟!**
**بۆ ناپرسی ئەو بابۆڵەیەی ناو دەستت بۆچی ئەگری؟!**
**بۆ سۆراخی پێکەنینە کوژراوەکەی لێوت ناکەی؟!**
**بۆ ناپرسی دەنگتیان لەکام گۆڕستاندا شاردۆتەوە؟!**
**ئاخر (میرۆ) بۆ بەشوێن چاوو برۆتو ناوکی کەوتووتا ناگەڕێی؟!**
**بۆ ناپرسی نانی دەم بەزەردەخەنەت بۆچی نییە؟!**
**بۆ گوێت لە قوڵپی ئاوێکی بەختیارو ڕووخۆش نەبوو؟!**
**تۆ ناپرسی، قەت ناپرسی، بۆچی رۆژێ دڵت نەبوو بە باڵندەو**
**لە خۆشیاندا هەر هیچ نەبێ تۆزێ بفڕێ؟!**
**تۆ ناپرسی، قەت ناپرسی، بۆچی ڕۆژێ لە روخساری ژنەکەتا**
**تاقە گوڵێك چییە نەڕواو شەیەکی پێ نەکەنی؟!**
**تۆ ناپرسی بۆچی لانکەی منداڵەکەت هەر لەرزوتا ڕای ئەژەنێ؟!**
**تۆ ناپرسی، قەت ناپرسی، گردە گڕویەکەی دراوسێی جارانی تۆ**
**ئەو دارستانی ئاڵتوونەی لەکوێ هانیو بەچی کڕیی ؟!**

ئەریٚ میرۆ.. ئاخر میرۆ
تۆ بەتەمای کەی بژیت‌و
تۆ بەتەمای چ وەخت نەمری؟!
تۆ بەتەمای چ وەخت بۆنی
زریانێکی توورە بگری؟!



وا هەنووکەیش دوورگەکانی مەنفا ئەڵێن:
زەریا بۆنی سەرسامبوون‌و ترسی لێ دیٚ
بۆنی هاژەی هەتا هەتا، بۆنی شڵپ‌و هوڕی زەمان
بۆنی بێباکی و تەفرەدان.
بۆنی غەزەب، بۆنی گوناه.
چوویتە ناو مەنفای ئاوەوە.
تەلبەندی ئاو دەوری گرتوویت
بووی بەتۆڕی غوربەتەوەو
وەکو کیسەڵێکی ئاویی تەنها سەروملت دیارن
وشتراو[23] ئەتپێچێتەوە. . بۆ چەشێکی درە ماسیی .
تۆ هاوارێکی گیرخواردووی بنی زەریایت
تۆ شاخێکی بچکۆلانەی لەناو ئاودا عاسی بوویت‌و
دەنگت لە قوڕدا چەقیوە.
دەنگت بۆنی ونکردووە.

---

[23] وشتراو: شەپۆلی گەورەی نێرینەی ئاو.

تۆ برینێکی بێ بۆنی ئەم زەمانەی
تۆ بە پێی خۆت هاتویتە ناو
تووناو توونی بزر بوونو داوەکانی تۆفانەوە.
مەنفا بۆنی خەونی خنکاو.. بۆنی جەستەی کەشتیی خنکاو
بۆنی ماڵئاوایی یەکجارەکی و بۆنی مەرگی تەڕی لێدێ.
کەشتیی خنکاو مامۆستایە
زمان فێری زەریا ئەکات
وا ئیستە کە شەپۆلێ دێ بەیۆنانی قسە ئەکاو
شەپۆلێك دێو تورکیی ئەدوێ.
ماوەیەکە زەریای ئیجە
زمانی سێهەم فێربووە
شەپۆلێ دێ.. بەیۆنانی قسە ئەکاو
شەپۆلێ دێ.. تورکی ئەدوێو
لە دواییدا شەپۆلێ دێ شەڕواڵێکی
ئەو شاخانەی لەبەردایەو دەسماڵێکی ئەو کەژانەی
لەکۆڵدایەو.. کوردیی ئەدوێ..

مەنفا ئەڵێ:
تۆ ئەوینێکی راکردووی
خۆت لێرەیتو بەڵام گیانت بۆ وەیشوومە جێهێشتووە.
پاساوی تۆو کەفەژیلکە لەیەك ئەچن
نە زەریا بڕوای پێ ئەکاو نە وشکانیی.

راتكردووه.. تۆ گوڵێكی ترسنۆكی‌و
هەڵاتویت‌و لانكەی باخ‌و بناری خۆت جێهێشتووه.
راتكردووه.. شمشاڵێكی خۆپەرستی
هەر بەتەنها ئاوازی خۆت خۆش ویستووه.
هەڵاتویت‌و.. ئاخەكانی ئەڵڵاوەیسیت جێ هێشتووه.
راتكردووه.. تۆ هەر سەری دەفتەری خۆت دەركردووەو
تۆ هەر سەری قەڵەمی خۆت دەركردووەو
بەڵام جەستەی زمانەكەت
بەڵام سەری وڵاتەكەت
تۆپی پەڕۆو داهۆڵ بوون‌و
بۆ دۆزەخت جێهێشتوون‌و.. راتكردووه!
رەشەبا بێ.. كێوت ناوێ!
گەردەلوول بێ.. باخت ناوێ!
حیكایەتت بە برسێتی‌و
سەرنجەكانت بێ تەم‌و
شیعرەكانت بە نەخۆشی‌و
دایكی خۆیشت لەناو تاریكییا ناوێ!
پاساوی تۆو كەفەژیلكە لەیەك ئەچن
نە زەریا بڕوای پێ ئەكاو نە وشكانیی.
مەنفا ئەڵێ..
حیكایەتی ون بوون ئەڵێ..
كەوتینە ناو تونێلێكی درێژەوه..

خۆیشت مەراقی درێژی.
چویتەتە ناو تاریکایی کوناودەرو بن بیفەوە[24]
لە بن بیفا تۆ خولیایەکی شێداری
لەگەڵ شێدا ژەنگێکی نوێت هەڵهێناوە
- بۆنی هێلّی گریساویی
شەمەندەفەرت گرتووە -
لە واگۆندا
ئەبی بە رۆژنامەی خەوتووی سەر کورسیی چۆڵ
ئەبی بە تاکە دەسکێشی جێماو
بە ڕیکلامێکی تووڕدراو
- بۆنی بیرچوونەوەت لێدێ -
هەموو ڕۆژێ بە بن بیفداو لە واگۆنی ناو میترۆدا
دووکەڵێکی سەر ڕەشیتو هاتوچۆتە
تۆ لەجانتای دانەخراوو هەڵوەشاوی
بێ  خاوەنو تەنیا ئەچی
لەگەڵ هەموو لەرەلەرو تەقەتەقێکی تریندا
یادێکت خل ئەبێتەوەو
نیازێکت ئەپچڕێتەوەو
- بۆنی ون بوونت لێوەدێ -
تۆ زمانی خۆرەتاوی دەربەدەری
هەموو ڕۆژێ بە ژێر عەردا ئەچی بۆلای حەرفو وشەی

[24] بن بیف: بن ئەرز.

زمانێکی دیکەی خوێن سارد.. فێری ببی.
لە ویستگەکەی (رۆدماس گاتان)[25]
وشەیەکی بێ تاقەتیو ڕستەیەکی لەش داهێزراو. دائەبەزی.
لە پڕێکدا پەنجەی ساردی کزەبایەك
لەناو کونی تونێلەوە بەرەو رووت دێو
ملپێچت هەڵ ئەداتەوەو
دەستی تەزیو ئەدا لە پەڕەی گوێچکەتو دائەچڵەکی.
بەرامبەرت: لە ڕیکلامی گەورە گەورەی ڕەنگاو ڕەنگدا،
سەرنج ئەدەی.. سەرنجەکانت ئەشڵەژێن..
تەماشاکانت پەرت ئەبن
بەڕیز وێنەی دوا بانگەشە:
بۆ جوانترین کیسەی مەمكو بۆ مایۆکانی پەکینیو
بۆ خۆراکی قوتوی سەگو بۆ تازەترین قەنەفەو
بۆ تازەترین سوراوی لچو لێوو.. بانگەشە بۆ،
میوەجاتو کۆمپیوتەرو بۆیەی قژو.. بانگەشە بۆ
بادەو بیرەو، بۆ سەفەری دوورگەکانی خوارووی
ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو، بانگەشە بۆ پاڵێوراوانی
پەرلەمان ئەبینیتو لە بەردەمی یەك ڕیکلامیاندا
ئەوەستیت، تازەترین مۆدەی قژ تاشینی ئێرە،
- قۆچکەتاشیی - تۆ لێرەدا پێ ئەکەنیو سەری
خڕی قۆچکەتاشی منداڵانی گەرمیانت دێتەوەیاد

[25] رۆدماس گاتان: ناوی شەقامو وێستگەیەکی میترۆیە لە ستۆکهۆڵم.

لەو ئاستەدا ئیتر بۆنی خۆشی ژنو
بۆنی کراسی بەریانو بۆنی میوەو
بۆنی بیرەو.. بۆنی دوورگەو
بۆنی شارستانیی ئەگری.

بە قاڵدرمەی ڕاکردوودا بەرەو هەوراز سەرئەکەوی
بەلای ڕاستدا لائەدەیتو لەبەر دیواری مەڕمەڕدا ڕائەوەستی
- رۆژباش (سترن بێری)[26] رۆژ باش!
هەموو بەیانییەك سەعات هەشتو چارەك تۆ ئەیبینی،
سترن بێری لەهەمان شوێندا وەستاوە: شەپقەیەکی رەشی
قوچو لەژێر قەراغی شەپقەدا دوو سکڵی تەماشای
تیژو گەشو لە خوارتریش بە دوولادا سمێڵێکی بادراوی
نوك باریكو بە چواردەوریا ژنەکانیو نامەکانی
ئەویندارىو چەند لاپەڕەیەکی دەستنووسی شانۆکانی
هەمو ڕۆژێ تۆ سترن بێری ئەبینی لەو ئاستەدا،
بۆنی سەدەی نۆزدەهەمو بۆنی شانۆی (ژووری سوور)و
بۆنی قژی وشەکانیو بۆنی شووشەی مەرەکەبو پەڕەموچو
بۆنی هونەر، بۆنی قەیفەی پەردەی ئەستوور، بۆنی
خۆشەویستیی ئەکەیت. هەوای شانۆ هەڵئەمژیی. تۆ
ئەدوێیتو سترن بێری لێت تێ ناگا. لەوکاتەدا هەردوو چاوت
ئەنووقێنیو ئەچیتەوە بۆ لای (نالی):
نە کڵاوو نە دەمو چاو نە سمێڵو نە قەڵەمو

[26] سترن بێری: گەورەترین نووسەری سویدی.

نە وێنەیەکی حەبیبەو نە دوو دێڕی بەجێماوو
نە مێژووی ڕۆژی زایینو نە ڕۆژی کۆچو مردنو
نە کێڵو گۆڕی گۆڕستان. بزر بزر چون ئاخەکانی
شارەزوور.. بزر بزر وەك نیشتمان!.
تۆ ئەو ساتە بۆنی تیژی نائومێدیو
بۆنی پرسەو بۆنی کەساسیت لێوەدێ.

مەنفا ئەڵێ..
لەناو پۆلدا..
بەدەوری گەورە مێزێکی هێلکەییدا بوون بە ئەڵقە
دە زمانی سەرگەردانی کاکۆڵ ڕەشن.
ژنە مامۆستای سەر زەردیش هەر وەکو گوڵەبەڕۆژە
دێتو ئەچێ. ئەیەوێ ئەم زمانە سەرکەشەی ئێرە
تۆزێ رامکەن. سوارتان ئەکا. دەستێکی وا پێتانەوە.
سەرەتایە، بەڵام هەر کە دەستی بەردا
لە خلیسکایی زماندا یەکە یەکە ئەکەونە خوار
بە یەکتری پێ ئەکەنن.
ئیستە بۆنی ڕێزمانێکی ڕەقەڵەو
بۆنی کردار، ئاوەڵ کردار
بۆنی تەباشیرت لێدێ.

مەنفا ئەڵێ..
بە دیواری ناو پۆلەوە

نەخشەیەکی ئەم جیهانە.. بە زەمینو بە بەحرەوە
هەڵواسراوە..
نەخشەیەکی ئەم جیهانەو سەدان ئاڵا
لە ڕەشبەڵەکی سەمادان.
بەدەوری گەورە مێزێکی هێلکەییدا دانیشتوونو
بوون بە ئەڵقەی حەرفو وشە
ئەمڕۆ رۆژی قسەکردنی ئاڵایە
ڕۆژی پەیڤینی سونبولە لە هەوادا.
ئەمڕۆ لەنێوان دە خاکدا
لە مابەینی دە ئاسماندا
ڕۆژی گفتوگۆی نێوانی شاخو زەریاو
بیابانو دوورگەو نیمچە دوورگەی ناو دنیایە.
لە خانەکانی جانتاوە
نۆ دەست نۆ سونبول دێننە دەرەوە
سونبولەکان ئەبن بە باڵندەی ناو ژوور
لە دواییشدا بەسەر سەری گوڵە بەرۆژەو پۆلەوە
یەکە یەکە ئەنیشنەوە.
نۆ دەست هەژدە چاوی خۆیان لەسەر مێزەکە دائەنێن.
چاوەکان ئەبن بە چرای بچکۆلانەو هەڵئەسنو لەسەر تەختە
دیرۆکی گوڵو بارانو خۆڵو خوێنو لانکەی خۆیان ئەنوسنەوە.
تەنها دەستێ دەستی تۆیە
نە سونبولو نە باڵدارو نە گۆرانیو نە بارانی ئاڵای تیایە.

**دوو دەستی چۆڵ.. چون پێدەشتی دەوری کەرکوك.**

**دە پەنجەی چاو گریاناوی لە گیرفاندا.**

**ئەڵێی منداڵی ئەنفالن.. لە گیرفاندا.**

**دە پەنجەی ناو گەردەلوولێ.. لەتاو ئازار**

**کڵاوی نینۆك تووڕ ئەدەن.. لە گیرفاندا.**

**دە پەنجەی لاڵی زمانم**

**وەك دە وشەم لەبەردەمی ئەنقەرەدا**

**دە پەنجەی ماتی ژێر چارشێو.. لە گیرفاندا**

**وەك دە کیژم لە سنەدا.**

**لەم پۆلەیشدا تاقە جانتا جانتای تۆیە**

**کە نیشتمانێکی سیس‌و کە ئاسمانێکی لەت لەتو**

**کە ئاوێنەی ساماڵێکی وردو خاشی لە بندایە.**

**لەم ساتەدا**

**بۆنی نوشوستیت گرتووە**

**بۆنی شەڕی بەردو بەردی شاخت**

**بۆنی مۆمێکی کوژاوە**

**لەم ساتەدا..**

**بۆنی چاڵدێران‌و لۆزان لە لەشت دێ.**

**لە شەڕی بەردو بەردەوە**

**بۆنێکی نوێ بڵاوبۆوە**

**بۆنی ئاو وەختێ ئەکوژرێ.**

**بۆنی کۆست وەختێ ئەکوترێ.**

له ماچی دەنگو ڕەنگەوە
بۆنێکی نوێ بڵاوبۆوە
بۆنی باران ئەو وەختەی ئاڵ هەڵئەگەڕێو
بۆنی شەهیدیش ئەو وەختەی
که باڵ ئەگرێ.
له تێکەڵبوونی منداڵیی‌و وشەیشەوە
بۆنێکی نوێ بڵاوبۆوە.. بۆنی بێگەردیی ئەو وەختەی
له باوەشی خوادا ئەنوێو
بۆنی مانایش وەختێ ئەبێ بە یاقووتو
له قوڵایی سەمایەکدا ئەجریوێنێ.
له ڕامووسانی نێوانی
جەستەی منو غەریبییشدا
بۆنێکی نوێ بڵاوبۆوە
بۆنی شیعر ئەو وەختەی هەڵم ئەیگرێو
بۆنی بێزارییش ئەو وەختەی
ئەبێ بە نووکە توتڕکو
ئەبێ بە دەمە گوێزانو
لەناو گیانی مندا ئەڕوێ.

**لەشەڕی بەردو بەردەوە، کامێرای شاراوە نەما.**
**ئەم دیمەنەی خوارەوە، ساتەوەختێکی (میران)**
**ئەخاتە ڕوو، کە شەڕی جەستەی خۆی، گەورەی**
**کردو پۆشتەی کردەوەو بە پلیکانەی شەڕدا بەرەو**

ئەمڕۆ (میران) لە شەڕی بەردو بەردەوە هاتۆتەوە.
بزەیەکی خۆڵەمێشیی‌و تەپ‌و تۆزی قارەمانیی‌و
وردە گەردیلەی شانازیی لێ نیشتووە.
ئەمڕۆ (میران) لە شەڕگەی شاخ‌و شاخەوە هاتۆتەوە.
بەرەو ئاسمانی بارەگا پێکەنین‌و جامانەکەی
بەیەکەوە هەڵئەداتو چەند ساڵێکیش
تفەنگەکەی گەنج بۆتەوە.
ئەمڕۆ (میران) لە بەیانیی خوێناویدا..
جەنگێکی نوێی لە جەستەی خۆی بردۆتەوە..
کەپکی کەللەی خۆی گرتووە
بەرزایی سەر شان‌و ملی کۆستەکانی خۆی گرتووە.
ئەمڕۆ (میران) لە شەڕگەدا سەرکەوتووە
بە (گەچاوی) باییبوونێ برینەکان سواغ ئەداتو
بە قریوە شەقامەکان دائەپۆشێ‌و سەرکەوتووە.
وڵات دەهۆڵەو لێی ئەدات.
وڵات زورنایەو ئەیژەنێ. سەرکەوتووە
پەنجەکانی دەستی ڕاستی
بەسەر پەنجەکانی دەستی چەپیا سەرکەوتووە.
قاچی ڕاستی قاچی چەپی خۆی ڕاوناوە.
ئەمڕۆ (میران) لە نەبەردی خۆی‌و خۆیدا، دیلی هەیە

چاوی خۆی‌و برۆی خۆی‌و کەپووی خۆی‌و
گوێچکەکانی خۆی گرتووە.
ئیستە (میران) قسەکانی بۆچڕوکی لەشی هەردوو
مەزراو ڕێ‌و بانیان لێوەدێ .
ئەمڕۆ میران هەموومانەو
بۆنی سەدان ساڵ پێش ئەمڕۆو
بۆنی پەیڤ‌و بۆنی ستوونی ڕۆژنامەو
ژووری کۆنترۆڵی تێ ڤێ‌و
بۆنی مایکرۆفۆنی ڕادیۆو
بۆنی گشتمانی لێوەدێ..
مەنفا ئەڵێ:
پەنا ئەبەیتە بەر باڕو
کەفی بیرە ئەکەی بە کڵاوی خەیاڵ
مەراقێك دائەگیرسێنی‌و ئەیکەی بە مۆمی سەرمێزو
لەنێوانی شەوقی تەڕو پەرت پەرت بوونی دووکەڵەوە
ئەڕوانیتە کۆتایی ساڵ..
بە لێژایی هەورەکانی خۆرئاوادا
گۆرانیت ئەچۆڕێتەوەو
ئەبی بە دوورە هاڵاوی زەریاو کەنار.
پەنا ئەبەیتە بەر بۆنی کچی سەر باڕ
قژی ئەکەی بە کەپرەکەی (هەڵەدن)و
چاوی ئەکەی بەکانیەکانی (مێرگەپان)

تاڵەمۆکان ئەکەی بەڕێی گەڕانەوەو
ئەچیتەوە کۆنە هەوار.
پەنا ئەبەیتە بەر گەردن، پەنا ئەبەیتە بەر مەمان
لە گەردندا ئەچیتەوە بەر قەڵبەزەی بەفراوانو
لە مەماندا ئەچیتەوە لای رنۆکانی هەورامان.
پەنا ئەبەیتە بەر دەنگی گڕو قرتاوی سەرخۆشێ لەولاتەوە
پەنا ئەبەیتە بەر ڕستەی هەڵوەشاوو حەرفی نیوە بەخەبەرو
چاوی تەپی نیوە نوقاو، بەلاپلاو چاڵو چۆڵیی،
کۆڵانی دەنگی سەرخۆشدا، بەڕێو بانی بۆنی مەیدا،
ئەچیتەوە سەرچنارو، قاچی شیعرت تێکەڵو پێکەڵ
ئەبێتو بەملاو بەولادا ئەکەویو هەتا باهۆزێکی کەتە
قۆڵت ئەگرێو ئەتباتەوە لای سەرخۆشانی شارەکەت.

ئەچیتەوە لای بەرسیلەی قسەکانیان
ئەچیتەوە ناو گیرفانی ستارخانیو
ئەبی بە دەنکە قەزوانی سوێرو
ئەبی بە شووشەی چارەکی نیوە خاڵیی
بەر باخەڵی مراخانیو
بەیەك جگەرەی پەناگوێو
ئەبی بە دەنکە کولەکەو.. ئەبی بە قاشە خەیارو
قاشە لیمۆو.. قاشە ترۆزیی ناوسووری سەر
دەسرێکی ڕاخراو!.

من ئیستاکە بۆنی بادەی سەرچنارو
بۆنی شەقامی سەرخۆشی شەستەکانو
بۆنی ئێوارەی سەرخۆشی حەفتاکانو
بۆنی نوکتەی عەرەق پیارژاوی ئەوسای
(عیزەت یەکپارچە)م لێوەدێ!

بیرەیەكو دووانو سیانو چوارو...
دیسانەوە کەفەکانیان ئەکەی بەکڵاوی خەیاڵ.
ئیستە سەرت وەك هۆڵی شەوی زستانەی پڕ دووکەڵو
ژاوەژاوی یانەی کۆنی مامۆستایان قورس بووە.
چاوت گەڵای شۆڕەبییەو داتخستووە. ئەڕوانیتە وێنەکانی
نەخشاوی سەر قوماشی مێز. وێنەی سەرمێز. تابلۆیەکی
هەڕەمەکیی، پەرشو بڵاو. سەرت بە وردە قوڕقوشمی
شەڕی ناوخۆ قورس بووە. چاوت گەڵای شۆڕەبییەو
داتخستووە. پەڕۆی سەرمێز گەورە ئەبێو وێنەکان
ئەجوڵێنەوەو بار ون ئەبێو کچ ون ئەبێو وێنەکان
دێنە چاوتەوە، تۆیش ئەچیتە ناو وێنەوە:
لەسەرەوە ئاسمانێکی بێ دەربەستو گەواڵە هەورێکی
تووڕەو فڕۆکەیەك دوو پەروانە. لەولایشەوە پەڕەشووتێکی
نارنجیی. لەخوارەوە ڕووبارێکی بێ تاقەتو بەلەمێکی
زنجیرکراو. لەوبەر ڕووباریش باخچەیەك. وەکو باخچەی
پاشای (گۆران)، بەڵام ئەمیان نەهیچ خێڵێ لە دوژمنان

دەوریان داوەو نە ڕێگەکانی گیراوە.
سەرت قورسەو کەفی بیرە ئەکەی بە کڵاوی خەیاڵ
ئەچیتە ناو وێنەکانی قوماشەوە:
ئێستا موتاڵای کتێبی ئاو ئەکەیت‌و باخچەکە ئەنووسیتەوە.
ئێستا لە کەنار ئاوەکەی، کەس ناتبینێ. جلەکانت دائەکەنی‌و
ئەچیتە ناو ڕووبارەوە. ڕووبار کەمێ دائەچڵەکێ. تا ناوکی
شیعرت تەڕ ئەبێ. چەند هەنگاوێك‌و ئەگەیتە بەلەمەکە.
بەلەمەکە ئازاد ئەکەیت. بەلەمەکە پێ ئەکەنێ. بەرەو لای
خۆت ڕایئەکێشی. ئەسپی تەختە بەناو ئاودا ئەئاژوێت‌و
ئەگەیتە لای گوڵزارەکە. ئەچیتە ناو باخچەی پاشای بێ گاردەوە.
لەبەر گوڵ شیعر نابینی. لەبەر عەتر سەرت ناپەرژێ بنووسیت.
بووی بە نوقڵێکی کەڵەگەت. گوڵەکانیش بوون بەمنداڵی
زەردو سوور. لە سەد لاوە باوەش بە ئەژنۆتا ئەکەن. گوڵ
ئابلۆوقەی بۆنی ناخۆشی خستۆتە سەر ئەم گەشتەت. چ ئابلۆوقەیەکی
جوانە. دائەنەوی سێ چەپك بۆنی ڕەنگاو ڕەنگ ئەچنیت‌و
دێیتەوە ناو بەلەمەکە. دەستەیەك ماسیی هاتوون‌و
بەڕێت ئەکەن. ئەگەیتەوە کەنار ئاوو، ماسیەکان ئەگەڕێنەوەو
بەر لەوەی کە تۆیش دابەزیی، دوو سێ داری کورتە باڵای دەمی
بەستێن، چەپکەکانت لێ وەرئەگرن. چەپکەکان  وەرئەگریتەوە.
بە چەپکەوە لەگەڵ بۆندا باڵ لێك ئەدەی بەرەو ئاسمان.
دەستت ئەگاتە کەمەری پەڵە هەورو توند ئەیگری. خۆتی پێوە
هەڵئەواسی. تیژ تیژ ئەفڕی. فڕۆکەکە ئەگریتەوە.

ئەمجارەیان باریك باریك ئەبیتەوە، ئەبی بە تیشكیّو لەشووشەی
پەنجەرەوە، ئەچیتە ناو فڕۆكەوە. لەجێی جگەرەكێشاندا دائەنیشی.
شیعرو قاوە بەیەكەوە ئەخۆیتەوە، فڕۆكەیش زەمان كون ئەكاو
پەردەی هەورەكان دائەدڕیّو تیژ تیژ ئەفڕیّ. چەپكەكانت وەكو
خۆزگە لە باوەشدان. تەماشایەكی سەعاتی دەستت ئەكەیت.
لە دوای ئەوەی بۆنێك ئەكەیت، لووتت بزەیەك ئەیگریّ. بۆن دیّ،
بۆن دیّ، بۆن دیّ. بۆنی گۆیژەو وێڵەدەر دێت. بۆنی ژانو
بۆنی گردی شەهیدانو بۆنی قژی شیعرەكانی شارەكەت دیّ. چەپكەكانت
لە باوەشدان . تۆ ئەبیّ لێرە دابەزی. دیسانەوە باریك باریك
ئەبیتەوە. وەكو تیشكیّ بە ناو شووشەی پەنجەرەدا بۆی دەرئەچی.
چەپكەكان هەر لەباوەشتان. بە هەورا خل ئەبیتەوە. ئەگەیتە
پەڕەشووتەكە. بە دەستێكت پەتی پەڕەشووت ئەگریتو
بە دەستەكەی تر بۆنەكان. گوڵەكان گۆرانیی ئەڵێن. دڵیان
خۆشەو لەسەر سینگت سەما ئەكەن. بە هەورا خل ئەبیتەوە
ئەگەیتە كیشوەری باران، لەدایك بوونی باران ئەبینیت .
ئەگەیتە هەرێمی تەرزەو مەملەكەتی تۆفو زریان.
لە نزیكەوە مردنی، بوخارو هەڵم ئەبینی. شاژنی پرشنگ
ئەبینی. یەكە یەكە بەناویاندا تیّ ئەپەڕی. بەناویاندا
ئەخولێیتەوە. وردە وردە دائەكشێی بۆ بەرەوخوار.
زەوی بەرەو پیرت دێتو ئەگەیتە ئاسۆی سەرچنار.
هەزار مەترو پێنج سەد مەترو پەنجا مەترو لەپڕیش لەناو باوەشی
چناردا ئەنیشیتەوە. نیوەشەوێكی درەنگەو كەس دیار نییە.

گوڵەکان لەناو باوەشتا وەنەوز ئەدەن - ماندووی ڕێگان -
تۆ ئەبێ ئیستە بگەڕێی لەم شارەدا سێ ناونیشان ، سێ
ئەوین بدۆزیتەوە: ناونیشانی تازەترین بۆنی تووڕەی شیعرو
تازەترین بۆنی یاخی بوونی شانۆو تازەترین بۆنی ڕەشەبای
ناو گەرووی کورتە چیرۆك. ئەبێ بیاندۆزیتەوە. بیانگەیتێ.
تا هەرسێ چەپکی باوەشی ئەم سەفەرەی خۆتیان بەیتێ
لە پرێکدا تەقەیەك دێو پەرداخێکی سەر مێز ئەشکێ
سەر هەڵئەبڕم. خەو ون ئەبێ. بارِ دێتەوە جێگەی
خۆیو کچی سەر بارِ وەك بزانێ من لە کام
گۆمدا نوقم بووم، لەو دوورەوە سەیرم ئەکاو پێ ئەکەنێ
هەڵئەسمو بارِ جێدێڵمو
درەختێکی سەرخۆشمو ئەچمە دەرێ.
لە دەرەوە کڵاوی کەف بائەیباتو
من هەست ئەکەم لەسەر جادەی شەوێکی تەڕ
قەسیدەیەکم ئاوارەو.. بۆنی گۆڕِ غەریبیم لێدێو
وشە وشە وا ئەوەرێم..
ئەوسا ئیتر گۆرانییەك.. بەدەم بای وەشتی ئێرەوە بۆ خۆم ئەڵێم:
(ئەم کۆشکانە هیچیان نەهاتنە خەومەوە
ئەم وەرزانە هیچیان نەهاتنە ساڵمەوە.
ئەم ژنانە هیچیان نەهاتنە چاومەوە.
ئەم بۆنانەیش هیچیان بۆنی وشەیەکیان خۆش نەکردم!.
ئەوەی کە دێتە خەومەوە

هەر کۆڵانە قوڕاویەکەی کانێسکانەو
ئەوەی کە دێتە ساڵمەوە
گوڵو سووتووی نیشتمانەو
ئەوەی کە دێتە چاومەوە
چاوی کچێکی کۆیی یەو
ئەو ڕووبارەی ئەڕژێتە ناو ڕۆحمەوە
هەر سیروانی لێڵو پێڵەو
تەنها بۆنیش کە بۆنی وشەم خۆش بکات
سەرو قژی ساواکانی شارەکەمە!
هەموو زەریاکانی ئێرە ئەیانەوێ زنەیەکی بچووکی شاخو داخ
لەناو رۆحما قوت بدەنو بۆیان ناکرێ. هەموو شارە
جوانەکانی ئێرە ئەیانەوێ کاولاشکەی قەڵادزێ لەناو
مندا بسڕنەوەو بۆیان ناکرێ. هەموو لەشو لارە رووتەکانی
ئێرە ئەیانەوێ تیلەی چاوی کچە هەولێرییەك لەیاد بکەم
بۆیان ناکرێ. هەموو دوکانو بازاڕە بە بریقو باقەکانی ئێرە
ئەیانەوێ بەردەمی حەوزە وشکەکەو ژێر پردەکە لەیاد بکەم
بۆیان ناکرێ.. هەموو شووشە عەترەکانی ناو ئەوروپایش
ئەیانەوێ بۆنی مێخەکبەندەکەی ملی تۆم بیر بەرنەوە
بۆیان ناکرێ.
من لەو زنە بچوکەوە فوارەی وشەم
هەڵئەدەمە ناو زەریاکانی دنیاوە .
من ئەو وێرانەو کاولاشە ئەبەمە ناو

هەناوو جەستەی دنیاوە .
ئەو تیلەی چاوە ئەبەمە ناو چاوەکانی دنیاوە
ئەو ملوانکەی مێخەکبەندەیش
ئەکەمە گەردنی جیهان!

من ئەو شیعرەم..
ئەگەر کەپووی بەردی هەلگورد
بۆنم نەکاو خۆشی نەوێم..
ئیتر دوای ئەو، بۆنم ناکاو خۆشی ناوێم
کەپووی بەفری.. لوتکەی ئەڤرست
من ئەو شیعرەم
شاری وشەی مل بەچرای ئەم دنیایەش
هەر ئەو وەختە باوەشیانکرد بە گەردنماو
خۆشیانویستم، بۆنیانکردم، کە لێرەوە..
لای ئێوەوە سەرو تۆزێ: لە مەراقو خۆڵو گەڵاو
کلۆ خەلۆوزو هەناسەو، بۆنی هەڵەبجەو هەڵاڵەو
بۆنی جەستەی ئەم زمانەی خۆم بۆ بردن!
من هەر لێرەم. لەناو بەفرێکی شینداموو
دوورە چرای نیگاتانمو کز ئەسووتێم
من هەر لێرەم. لەناو بەفرێکی شینداموو
ناو بەناوێ.. لەم قوتبەدا
پریشکێکی بەردە ئەستێم .

دیسانەوە ڕۆژێکی تر بەناو تەمێکدا دێتەوە
من هەر لێرەم:
ڕۆژێکی تازەیەو کۆنیش
دیسانەوە ڕیشێکی دیکەی تەنیایی ئەتاشمەوە.
بەڵام ئاوێنە هەر هەمان ئاوێنەیەو
تەمی شووشەی سەرچاوانیش هەر هەمان تەم.
- بۆنی ئەم قوتبەم گرتووە -
رۆژێکی تازەیەو کۆنیش
دیسانەوە بەروپشتی ئەم بەیانییەش بە پەلە
ئوتوو ئەکەم.
بەڵام بێزاریی ناو رۆحم
هەروەکو خۆی چرچو لۆچە.
ـ بۆنی پەڕۆی سووتاوی ژێر ئوتووم لێدێ -
ڕۆژێکی تازەیەو کۆنیش
دیسانەوە (مەسعەدەکە) ئەمکاتە کۆڵ
لە قاتی خوارێ دامئەگرێ
ئەچمە دەرێ..
دیسانەوە لە بەردەرگا پیرێژنەکەی دراوسێم
کە هەر لە تووتیی مۆن ئەچێ
تووشم ئەبێ.
ـ لەبەر قژم خۆشی ناوێم -
کلك هەڵئەکاو تێ ئەپەڕێ.

ـ بۆنی نەفرەتم لێوە دێ -

وەختێ چەترەکەم هەڵئەدەم:

ـ بەیانیت باش!

ـ بەیانیت باش!

دیالۆگی بەردەوامی بەیانیانی

نێوان خۆمو چەترەکەمە ..

دیسانەوە ڕۆژێکی تازەیەو کۆنیش

من ئەمڕۆیش هەر بۆنی دوێنێو بۆنی پێرێو

بۆنی ژەنگو بۆنی چەترێکی شکاوی ئێرەم لێدێ .

**﴿ئەزموونەکان پەڵو پۆی زۆریان لـێ بۆوە. بۆنـنـامەکەم لە شاخەوە بۆ زەریا بوو بەهاوڕێی چەندین دەنگو ڕەنگی لەیەك نەچووی ئەم دنیایە. لەبەر ئەوە ئەم بۆنـنـامەیە بۆنـنـامەی ئەزموونە. بەڵام هێشتا نەمتوانیوە خۆم لە بۆنی ترس قوتـار بکەم. من بە بۆن کەوتووی ترسم. ئەگەر ناوچەیەکی شاراوەی بۆن لەم بۆنـنـامەیەدا نەبێت، ئەوە هەر لەوێوە لەو ترسەوە سەرچاوەی گرتووە﴾**

(لەبەر ئەوەی من سەردەمێ

لەگەڵ شاخدا هاوڕێ بووم

بۆیە ئیستاکە ئەتوانم تۆوی روانین

بەدەم ڕێوە لەناو بەردیشدا بڕوێنم .

لەبەر ئەوەی من سەردەمێ
لەگەڵ زەریا هاوڕێ بووم
بۆیە ئێستاکە ئەتوانم
بە بنی قوڵی زماندا بچمە خوارێو
مەرجانی مانا دەربێنم.
لەبەر ئەوەی من سەردەمێ
کرێچیی ماڵی ئەستێرە دوورەکان بووم
بۆیە ئێستاکە ئەتوانم جریوە بکەم بە بۆنو
ئەودیو وەرزەکان ببینم
لەبەر ئەوەی من سەردەمێ
لەگەڵ زریاندا ژیاوم
بۆیە ئێستاکە ئەتوانم ببمە پرسیارو گومانو
هەڵبکەمو یەخەی یەقین ڕاوەشێنم

لەبەر ئەوەی سەردەمێکیش دوورو درێژ
لەگەڵ ترسو لەگەڵ تەمو مژدا ژیام
ببوورن لێم بۆیە ئێستاکە ناتوانم
من ڕاستەوخۆ هەرچیم هەیە..
وەکو هەتاوێکی گەمژە
لەلای ئێوە بیدرکێنم )

من هەر لێرەم..
لەم وڵاتە خوێن ساردەدا

تەنها لە ڕۆژی کتێبداو

لەبەردەمی کوورەی شیعرا گەرم دادێم

تەنها لە ڕۆژی کتێبدا..

پەپوولەی وێڵی پێکەنین پەیا ئەبن‌و تێم ئەئاڵێن.

تەنها لەرۆژی کتێبدا

من ژمارەی لاپەڕەی سەروو پەنجام‌و

لە گۆڤاری غەریبیدا زەردەخەنە ئەمگرێت‌و ئەکرێمەوە.

لە ڕۆژی وشەو کتێبدا.. ئەبم بە دەشتی پەخشان‌و

فوارەی شانۆو.. ئەبم بە چیرۆکی گەڕۆك.

ئەمڕۆ وەکو سەری زیوینی پاندانێ

لە دووررا ئەبریقێمەوە.

لە (سێنترومی تێنستا)[27]

(هێرِ ئەندرشۆن) [28]م پێ ئەگات.

هێرِ ئەندرشۆن درێژە وەك نەخشەی سوید.

دەم‌و چاویشی بەردەوام لە دوورگەی پێکەنین ئەچێ.

هێرِ ئەندرشۆن ئەندامێکی پەرلەمان‌و حزبی سەوزە

بەڵام خۆی واتەنی ئەگەر

بەلەمەکەی سڤاریا کونی تێ بێ

ئەم حزبەکەی تۆپەڵ ئەکاو کونی بەلەمی پێ ئەگرێ!.

هێرِ ئەندرشۆن.. سەری پڕە لە کتێب‌و

---

[27] سێنترومی تێنستا: سەنتەری گەڕەکی تێنستا – لە ستۆکهۆڵم.

[28] هێرِ ئەندرشۆن: مستەر ئەندرشۆن.

دڵی پڕە لە باڵندەو چاوی پڕە لە دارستان.
(با)ی زەریایەو بەدەم غەریبیی چیاوە پێ ئەکەنێ.
هێڕ ئەندرشۆن شیعرو مۆسیقاو بێگانەی بەیەکەوە
لەسەر ڕەفەی چاوو برۆی ڕیز کردووە.
قسەکانی بۆنی (تولّ پان)[29] یان لێوەدێ.
کە ئەیبینم واهەست ئەکەم من پەنجەرەی داخراوم‌و
هێڕ ئەندرشۆن.. ئەمکاتەوە
ئەمجارەیشیان هێڕ ئەندرشۆن
بە هەمان تۆڕی پرسیاری بەر لە چەند ساڵ
ئەمکاتەوە بە وێرگوڵێکی بەردەمی‌و
ئەمکاتەوە بە ڕۆژنامەی لوولکراوی نێوان دەستی
- هەی.. هەی.. شێرکۆ!
شاخ‌و شاخ هەر بەردەوامن
لە سەربڕینی یەکتردا؟!
ئەوە چییە؟! خۆ هەر خۆتان دیناصۆرتان
هێنایەوە بۆ ناو خۆتان!
هێڕ ئەندرشۆن.. لە ئیستەدا وەکو جاران
شاخەکانم ناباتە ناو ڕۆژنامەوە.
بە ژانەکانم نانووسێ‌و فرمێسکیشم لە پەرداخی
پەرلەماندا ناخواتەوە..
هێڕ ئەندرشۆن.. وەکو جاران

---

[29] تولّ پان: ناوی گوڵێکە بە سویدی.

پیاسە لەگەڵ خەمما ناکات..
بەشوێن برینما ناگەڕێو زوو زوویش دەرگا
لە سۆراخی گڕ تێبەربووم ناکاتەوە..
هێڕ ئەندرشۆنو ژنەکەی
بەر لە دە ساڵ هەر لێرەدا
لەسەردەمی مۆمەکانی هەڵەبجەداو
لەبەر تۆفانی کۆچ ڕەودا..
دڵی خۆیان دەرهێنابوو کردبوویان بە دەغیلەو
بە بازاڕدا ئەیانگێڕا بۆ کوردستان.
هێڕ ئەندرشۆن.. تۆزێك لەگەڵما ئەوەستێو بەجێمدێڵێو
سەر بەرەو خوار، لەگەڵ دار ئەبەنووسێکی،
(رواندی)دا بۆ خۆی ئەڕوا.
پرسیارەکەی هێڕ ئەندرشۆن
ئەمکا بە پەڕەی دڕاوی کتێبێكو
بە شیعرێ قاوەی بەسەردا ڕژابێتو
ئەمکا بە تاری ژێ پچڕاو.
من ئیستاکە بۆنی گورگو
بۆنی گەوجێتی و شێتێتیو
بۆنی ڕۆژنامەی شەڕخوازو..
بۆنی جامانەی خائینو
بۆنی کەڕووی مێژوویەکی کۆنم لێدێ.

❁ **شیعر نامەیەك كە لەشێوەی گێژەڵووكەی تەلگرافێكی درێژدا..**

**هەڵیکردو پرسیارەکەی ( هێرٍ ئەندرشۆن ) زەمینەی بوو.**
**شیعرنامەیەکی تووڕە، بۆ هەموو ئەو وشانەی ناوەوەو**
**دەرەوە، بۆ هەموو ئەوانەی کە لە هاوینە ڕۆژێکی شوومداو**
**لە گەڕانەوەی دیناصۆردا خۆیان لە ژووری بێ دەنگیی**
**خزانو بێ دەنگییان دا بەخۆیانداو..**
**لەدواییشدا شیعرو چیرۆکو شانۆو تارەکانیان بۆنی**
**دیناصۆرو دەبابەیان گرت: تێبینی: ئەم بروسکەیە،**
**دوێنێ نوسراوە، بەلاّم بۆ سبەینێو دوو سبەیو داهاتوویشەو**
**هەتا دیناصۆر بژی!.)**

شیعرەکانتان یەك بە یەك بەتاڵبوونەوە.. باگژەی ئاب
فووی لێکردن، پێچانیەوەو تێکەڵ بە پووشی هاوینەی
دەشتی پرسەی (قوشتەپە) بوون. لەژێر زیلدا لوولیان
خواردو.. کۆمەڵ کۆمەڵ، لەناو چاڵی دەبابەدا گیرسانەوە.
شیعرەکانتان یەك بە یەك بەتاڵبوونەوە: چون بەتاڵبوونەوەی
عاشق لەئەوینو چون بەتاڵبوونەوەی جەستە لە ئیرادەو
چون بەتاڵبوونەوەی پەیڤین لە دەربڕین .
کۆتەرەکان سەریان باداو شتێکیان وت. ڤیر ڤولێپی داو
بلّقی کردو شتێکی وت. بەلاّم ئێوە هیچتان نە ووت.
بەلاّم ئێوە هیچتان نەکرد. بێدەنگیتان: هەڵبڕینی داری بازگەو
سەیتەرە بوو، بۆ هاتنەوەی دیناصۆرو گەڕانەوەی کۆلێراکەی
دوایی هاوین . بێدەنگیتان کرد بە پەردەی دووکەڵێکو

بەدەوری خوێندا گێڕاتان، تاشمشێری دیناصۆرو چنگی
ئاسنی خوێناویو بەچکەکانی ئەو نەبینین.
بێدەنگیتان بوو
بەپاسەوانی ئەنفال. بێدەنگیتان بوو بە شووشەی مەرەکەبی
خاڵیو بەتاڵ. بێدەنگیتان بوو بە قەڵەمی کەڕولاڵ.
بێدەنگیتان
کرد بە تەپەدۆری سەری خیانەتو بێدەنگیتان کرد بە خم خۆرك
بۆ قوتدانەوەی کورژنی قوربانیی ساڵ. بێدەنگیی ئێوە
هەسان بوو خێڵ خۆی لەسەر تیژکردەوە، بێدەنگیی ئێوە
گومەزی تاریکیی بوو جەهل خۆی تیا کۆکردەوە.

کۆتەرەکان جولانەوەو شتێکیان وت. جۆگەلەکان
هەندێ ئاوڕیان دایەوەو شتێکیان وت. بەلام ئێوە
هیچتان نە ووت، بەلام ئێوە هیچتان نەکرد. چیرۆكو
شانۆو وتارتان، وشەی شووشەو فەخفوری بوون،
لەسەر ڕەفەی بێدەنگیتان ڕیز کرابوون، لەگەڵ لەرزەی
زرێپۆشدا لەرزینەوەو کەوتنە خوارێو هاڕەیان کرد.
دەستنوێژەکانی ئەدەبتان، دەستنوێژەکانی قەڵەمتان
یەك بەیەك بەتاڵبوونەوە. چون بەتاڵبوونەوەی ئەسپ
لە حیلاندن. چون بەتاڵبوونەوەی باهۆز لە گڤاندن.
چون بەتاڵبوونەوەی ئاگر لە بڵێسەو لە تاوسەندن.

چیرۆکەکانتان یەك بەیەك بوون بەکەروێشکی دارینەو..

وتارەكانتان يەك بەيەك بوون بە نێچيری راوكردن.
قسەكانتان: هێلمو قوڕی صناعیو مۆمی پیو بوون،
بە هاڵاوی دەمی هاوەن هەر هەموويان بەسەر يەكدا
توانەوەو .. هەيكەلێكيان لێ دروست بوو بۆ بەردەمی داينامسۆرو
هۆزی مردن. لەو دەشتەدا، پەڕەی گۆڤارێكی دڕاو
بای تۆپ بردیو شتێكی وت. لەو دەشتەدا ملی قرتاوی
باڵدارێ لە بەردەمی قەمەيەكدا هەڵبەزێوەو شتێكی وت.
بەڵام ئێوە هيچتان نەووت.. بەڵام ئێوە هيچتان نەكرد، بەڵام
ئێوە لەو بەيانييە خۆڵ پۆشەدا.. لەو بەيانييە خوێن پۆشەدا..
لەو ديرۆكە عار پۆشەدا، ئەوەی كردتان: سەری منو سەری
قەڵاو سەری حاجی قادری كۆييتان.. تێكەڵ بەسەری بەدليسیو
سەری فەيلەقی كيمياو سەری ئەسپی ديكتاتۆر كرد. لەو بەيانييە
زەردباوەدا ئەوەی كردتان هەر يەك شت بوو. بەيەكسانی
روانيتانە شيعری منو بێرێی سەری (عاشور حەمدان)
بە يەكسانی روانيتانە مێزەرەكەی مەلای خەتێو مێزەرەكەی
مەلای گەورەو بە يەكسانی دابەشتان كرد: پەنجەكانی
قەڵادزێو پەنجەكانی دەستی سوڵتان.

ئەوە من نيم.. بەرۆكی شيعرتان ئەگرێ
ئەوە من نيم .. يەخەی شانۆتان ئەگرێتو
ئەوە من نيم.. رێگە بەچيرۆكتان ئەگرێ.
ئەو دەستانە دەستی من نين.. پەنجەی من نين

ئەوانە دەستی هەڵەبجەن لەناو هەوای خنکاوەوە
لەناو گوڵی خنکاوەوە، درێژ ئەبن‌و قورتومی وشەتان ئەگرن.
ئەو دەستانە دەستی من نین.. پەنجەی من نین
ئەو دەستانەن لەژێر لمی عەرعەرەوە، لە گۆڕستانی
چراوە دێنە دەرێ‌و بەربینی قەڵەمتان ئەگرن.
شیعرەکانتان یەك بەیەك بەتاڵبوونەوە..
چیرۆکەکانتان کیسەڵ بوون.. سەریان بردەوە ناو قاوغ.
قسەکانتان.. هەندێ سێبەری ترساو بوون.. کشانەوە.
شانۆ پەردەی خۆی دڕان‌و ئەکتەرەکان رووت بوونەوە.

لوتاوێژ بوو.. لوتاوێژ بوو.. لوتاوێژ.
شاخ لووتی گرت..
ئەربائیلۆکان لووتیان گرت.. منارەی چۆلی لووتی گرت
دەرگاو پەنجەرە، لووتیان گرت.. گیوموکریانی لووتی گرت
( ئیبنولموستەوفی ) لووتی گرت..
(عبدالخالق)ی هاوڕێم.. (نوری نانەکەلی)ی.. هاوڕێم..
جادەی شێست مەتریی هاوڕێم..
چایخانەی مەچکۆی هاوڕێم.. لووتیان گرت‌و
لەو ڕۆژەدا ئێوەش بۆنی دیناصۆرو بۆگەمرخەی
مێژووییەکی تۆپیوتان گرت ! )

تۆ بۆنی شیعری گەڕۆکی

باخ لەگەڵ خۆتدا ئەگێڕیو
دڵۆپ دڵۆپ لەبەر هەتاوی جوانیدا ئەتوێیتەوە..
تۆ قاسپەی کەوی زمانیو
پەروانەی ڕیشی (نالی)یتو بە چواردەوری
ئەوروپادا ئەخولێیتەوە.
خەو ئەڕژێتە سەرتەوە..
حەزو خۆزگەتو تەماشات تەڕ تەڕ ئەبن
شیعرت لێ ئەچۆڕێتەوە.
ئیمستیردام.. بەلەمێکی شووشەبەندی دەم بە ورشەی
جادەی ئاوو.. کوچەی ئاوو.. چوخمی ئاوە
تۆیش گڵۆپێکی سەرخۆشیو بەشەودا ئەسوڕێیتەوە.
لە ئاودا.. ئەلەرێیتەوە
لە ئاودا.. ئەبریقێیتەوە..
بەنگ کێشەکان.. لەم شارەدا.. لە ئەستێرەی
نێرەو مێیەی جل دڕاوی پەرەوازەو
لە گوڵی چڵکنی باخچەو
لە شووشەی بادەی بێ سەرو بێ مل ئەچن.
نیشتمانی بەنگ کێشەکان.. خەیاڵێکی رووتو قووتە.
ئەوان بەتەنها هەر بۆنی ساتە وەختێکیان لێوەدێ.
ساتەوەختێ.. بێهودەیی ئەم تەمەنەی تیا بکێشن.
ساتەوەختێ.. کە رابوردووی سەرابێکەو
ئایندەیشی تیا ئەمەیێ

ئیمستیردام بەناو خۆیدا ئەمگەڕێنێ .
ئیمستیردام کتێبێکە.. ئاو جزوبەندی کردووە.
بەقەوارە کتێبێکی بچکۆلەیەو جیهانیش ئەیخوێنێتەوەو تەواو نابێ.
لەم لەشەدا.. سەری قەشەو لنگی بڤکێو[30]
دەستو پلی هونەرمەندو.. قاچەکانی بازرگانیی
پێکەوە کۆبوونەتەوە.
ئیمستیردام.. بەناو خۆیدا ئەمگەڕێنێ.
ئیمستیردام.. لەشی رووتی شۆخە ژنێکە هۆڵەندیو
لەناو گوڵدا راکشاوە.
ئەم کتێبە شەپۆلی ئاو پەڕەیەتیو تەواو نابێ.
ئەم کتێبە کەس تێی ناگا.. لەیەك ساتدا
سەد زمان ئەینووسێتەوەو
سەد زمان ئەیخوێنێتەوەو
وەك زنجیری پایسکیل سواری سەر تەختانییشدا
بەگوڕ ئەڕواو لەناو چاوما ئەخولێتەوە.
بەیەکەوە: ئێرە بۆنی خۆشترین گوڵی ناو دنیاو
بۆنی تلیاك، بۆنی سێکسو رووت بوونەوەو
بۆنی لەژم[31] و بۆنی دادگاکەی لاهاییو
بۆنی مۆسیقای لێوەدێ.
کەپووم تەنها لەم شارەدا

---

[30] بڤکێ: ژنی خراپ.
[31] لەژم: زەلکاو.

بەشەوارەی بۆن ئەکەوێ.

دوو ساڵە باوەشی پڕ ماچو پەپوولەی
(سەمیرە)ی یەمەنی، کوکوختیی ئاوارەی هۆڵەندا
بۆ خولیای بالگرتووم فەزایە.
دوو ساڵە، بارانی هاوینەی یەمەنیی، لێم ئەداو
پایتەختی ئەم لەشە بۆن خۆشەم (صەنعایە).
ئەم ماسیە باڵدارە.. ئەم پشکۆ ئەسمەرە..
ئەم گۆشتە گڕدارەی بەحری سوور، ئەم کانییە ڕەشتاڵەو
ئەم (واحە) رووناکە
هەر جارێ باوەشێ بەملی کوێستانما بکاتو راموسێ
ئەوساکە من قەترەی توانەوەم.. تنۆکی بەفراوم
لە بادیی[32] بەردەمو لە بنی فنجاندا.
غەریبیی لەم لەشە گەرمەدا برژاوە..
لەم خەتی ئیستیوای ناو قەدو گەرمێنی مەمکەدا
پەنجەی من سووتاوە.
سەمیرەی یەمەنی.. کتێبی شەپۆلی گەنم ڕەنگ
قەڵبەزەی شەهوەتو فەنەری ئارەزووی داگیرساو
لە ژووری بەلەمی دارینەی گوێ ئاودا..
ئەیبینم: لە پێشدا حەوزێکم بەتاڵو
لەناکاو پڕ ئەبم لەخەندە.

[32] بادیی: قاپ، دەفر.

له پێشدا سێبەری دارێکی تەریکم‌و
له پڕیش من ئەبم بە ئاسۆی هەزاران باڵندە.
ئەچینە سەر کورسیی مەڕمەڕی باخچەیەك
لای راستمان ئاهەنگی دوو بووکی بەرخۆری ژاڵەیەو
لای چەپمان.. دووچاوی زیتەڵەی مێبازی دار قۆخێ.
بەر لەوەی دانیشین
کورسیەکە بزەیەك ئەیگرێ بۆ کچە یەمەنی
بۆ خورمای خەستەویی.
لەسەرڕا (با)یەك دێ‌و ئەچێتە قژیەوەو
لەوێوە سەر ئەدا لەدەمی‌و ئیتر (با)
دوای تۆزێ تینوێتی.
هەڵئەسین.. لە گەڵای قسەمان هەندێکی وەریوەو
بۆ شەوی تەنیایی کورسیەکە جێی دێڵین.
درێژیی جادەکان، ملوانکەی زۆر کورتن
لە ملی پەیڤینی دڵداردا..
هەر تەنها سەعاتی دڵدارە
سەعاتی خەونێ بێ نەزانێ
دەقیقەو چرکەکان بژمێرێ.
ئەو تەنها تیشکێکە کات کونکاو
هەمان سات (عەتارد) بۆنبکاو
شەقامێ لە مانگدا ببڕێت‌و
(مەریخ)یش لە چاودا هەڵگرێ‌و

لێرەبێو لەوێش بێ

ئەچینە ناو ماڵی ئاوەوە
کەشتیشەو ماڵیشە
دوو هۆدەو ڕاڕەوێ لە ئاودا، کرێچی ماسییەو
خاوەن ماڵ زەریایە. حەوشەی ئاو، هاوسێی ئاو،
کۆڵان ئاو، بناغە شەپۆلەو.. ئەم ماڵە ژنێکە
کەسك پۆش تانیوەی لە ئاوداو هەمیشەیش دانس ئەکا.
کە ئەدوێم پەیڤینم گوڵۆنکەی رستەی خۆی
لە ڕووبار وەرئەدا. پرژە پرژ، وشەکان دڵۆپی
ساردنو ئەکەونە سەر پێستی لەشێکی نیوە ڕووت،
نیوەداخ، وشەکان چزەیان لێوەدێ. پێش خۆمان
دوو پەرداخ یەکتری ماچ ئەکەن
زرنگەی شەوێکی شووشەیی سوورباویان لێوەدێ.
ئەم ماڵە کەشتییە، ئەم ژووری ماسییە، ئیستاکە بۆگوێچکەی
بڕراوی (ڤان کوخی) لێوەدێ. چۆن شەپۆل هەڵئەسێ
بۆ ئەوەی گڵۆپی بەندەری دەریاکان ببینێ، هەڵئەسم.
لەبەردەم دوو سێ ڕیز کتێبدا ئەوەستم. دوو سێ ڕیز لە سەدە.
دوو سێ ڕیز لە ڕۆحی فریشتەو ئەستێرەی گەڕیدە.
دوو سێ ڕیز لە جۆگەی خەیاڵی شپرزە. دەست ئەبەم
هەورێکیان دائەگرم، (لۆرکایە)، چەخماخەی هەورەکە
ڕێك ئەیدا لە چاوم، وەك باڵای (غرناطة) سوور ئەبم.
هەمدیسان دەست ئەبەم بۆ ڕەفە. قەڵایەك دائەگرم

قەڵایەك دیواری لە خشتی بێزاریو شوورەیەك لە بەردی
تەمێکی ئەستورو قوڵلەیشی لە شەوی تەنیایی. (کافکایە)و
ون بوونەو پرسیارەو مەراقی ئەبەدیی.
ئەچمەوە سەر کورسیی هۆنراوەم
بەرامبەر مەوالی ڕەش ئەسمەر
بەرامبەر وەنەوشەی یەمەنی
ـ بێ دەنگی؟! وادیارە لای من نیت؟!
راست ئەکات لای ئەو نیم. لەنێوان ئەو لەشەو گردێکی
سوتاوی وڵاتدا من بۆسۆی دەواری کۆچەریم. ڕاست
ئەکات لای ئەو نیم. لەنێوان درەختی هەڵووژەی ئەو لەشەو
سەعاتی وەریوی وڵاتدا من پەنجەی دوودڵییم. ئەپرسم
لە کوێوە هەتا کوێ، من دەزووی کڵافەی ئەم خوێنەی
سەری خۆم هێناوە؟! لە کوێوە هەتا کوێ من ڕێچکەی شکستیو
من نمەی دەقیقەو سانییەی ڕژاوی قوربانییم. لە کوێوە
هەتا کوێ من بۆنی تاراوگەم لێوەدێو هەناسەی تاریکییم.
ئەو شەوە لە خانووی سەرخۆشداو
بەرامبەر قۆخێکی گەییوی یەمەنیی
مەراقی ئاڵ بوومو چەند قاپی سەرمۆری خەیاڵم هەڵپچڕی.
ئەو شەوە من بۆنی قەسیدەی ئەسمەرو
من بۆنی هاژە هاژ.. من بۆنی زەریام گرت
هەتاکو بەیانیی.
پەراگەندەیە سەری من

جارێك جانتای بەجێماوە لە فڕگەداو
جارێکی دی هەڵمی سەر شووشەی واگۆنە لە ترێنداو
جارێکی تر بە دوای کەشتیی ناو زەریاوە
بووە بە بڵقێکی کەفاو.
پەرەوازەیە بۆنی من
من بۆنجاڕی سەدان مەرگی ڕەنگاو ڕەنگم
هەتا لەلای نیشتمانم:
جامانەکانی نیشتمان.. پشتێنەکانی نیشتمان،
بۆنی سترانی کوژراوی منیان لێدێ. دیوارەکانی نیشتمان
بۆنی برسێتیو تاریکیی منیان لێدێ. کە ڕایشمکرد،
دەمێك خابوور بۆنی لاشەی من ئەگرێتو دەمێك
بەفر بۆنی ڕەق بوونەوەی منی لێدێو
دەمێك هەناسەی ژەندرمە بۆنی خوێنی من ئەگرێتو
دەمێك کەشتیی بۆنی مەرگی تەڕو بڕەو
دەمێك ڕێو بانی قاچاخچی بۆنی تەرمی دەست بڕراوەو
دەمێکی تر.. بەندەرەکان بۆنی خەونی سەر ئاو کەوتووی منیان لێدێ.
لەم وەرزەیشدا.. بۆنی سنووقە فیشەکی ئەملاو ئەولاو
بۆنی  کارگەی دۆشکام لێدێ.
من هەر بۆنی تۆڵەو بارووتو ئەشکەوتو
خێڵی چەقۆو تەورم لێدێ.
بۆنی جبەی عوسمان پاشاو
بۆنی کەوشی ئەحمەد پاشاو

بۆنی ئەمارەتمان لێدێ .

بۆنی درۆمان گرتووە. ئێمە بۆنی پیسی هەموو

ئەم چوار دەورەمان گرتووە

هەر تەنها بۆنی خۆشی خۆمانە لێمان نایە.

ئەوەی کە من بۆنی نەگرم.. ڕووناکییە.

ئەوەی کە من بۆنی نەگرم.. بەیانییە.

لەم قوتبەیشدا بۆ تەریکیی

بەراوردم مەکە لەگەڵ گەواڵە هەوری تەنیادا

زووبڕو درەنگ پەڵە هەور بە دەزۆکانی باراندا

لە ئاسۆوە دائەبەزێ بۆ سەر زەویی.

بەڵام من خۆم.. هەر خۆم بۆ خۆم.. ئاسمانێکم لە تەنیایی.

بۆ نامۆیی بەراوردم مەکە لەگەڵ

واکی[33] تەنیای سەر زەریادا

واک ئەفڕێتو زووبڕو درەنگ

یان واکی تری هاودەمی ئەگەنە لای بەمیوانی

یان ئەم ئەگاتە ئاوایی.

بەڵام من خۆم.. هەر خۆم بۆ خۆم.. لەنو[34] دوورگەم

زەریا دەستی چەند درێژکرد

تۆڕی شەپۆلی فڕێداو ئەوسایش نەگەیشتە نامۆییم.

بۆ مردنیش

---

[33] واک: ماسیگرە، نەورەس.

[34] لەن: دوورگەی زۆر بچووک لەناو ئاودا.

بەراوردم مەکە لەگەڵ شاخو داخی نیشتماندا
بەرد قەت نامرێ. خۆڵ قەت نامرێ. ئاو ناکوژرێو
ئەوەی کە ئەمرێ هەر منم..
ئەو شەقامانە ئەمێنن. بەیانی گەنجتر ئەبنەوەو
جوانترین قات لەبەر ئەکەن.
ئەو ڕووبارانە ئەمێنن.. سبەی کەڵەگەتتر ئەبن
خۆشترین بۆن ئەدەن لە قژ.
شاخو داخیش هەر ئەمێنن.. بەیانیی جوانتر ئەبنەوەو
شەدەی ڕەنگینتر ئەبەستن..
بەڵام ئەفسووس.. ئەم پەپوولەی چاوانەی من پیا ڕاناگەن:
بەو شەقامانەدا پیاسە لەگەڵ ئەستێرەدا بکەن.
لەو رووبارانەدا مەلە لەگەڵ چراو شیعرا بکەن.
بە نێو ئەو شاخو داخەیشدا، لەگەڵ هەتاو، بەیەکەوە
بەختیاریو گوڵە گەنم ببەخشنەوە..
بەداخەوە من ئەو کاتە لەوێ نابم بۆنیان بکەم!

مەنفا ئەڵێ
تاراوگە زوو زوو پێم ئەڵێ
لە شەوانی ئەم قوتبەدا
تۆ ئەوەندە ئەم دارسێوە بێ ئۆقرەیەی
جەستەی خۆتت ڕاژەنیوە..
کۆست ئەمەندەی تەکاندووە

لق‌و پەلت ڕووت بوونەوە
سێوێکت پێوە نەماوە گەر چوویتەوە
لەگەڵ خۆتدا بیبەیتەوە
بۆ منداڵێکی (حاجی حان)
لە وێستگەکانی.. وەزەندا.. لە شەختەدا
تۆ ئەوەندە.. گریانی خۆتت.. داگیرسان..
مورویەکی تروسکاییت پێ نەماوە
گەر چوویتەوە لەگەڵ خۆتدا
بیبەیتەوە بۆ چاوانی کارمامزێکی کانێسکان.
تۆ کە هاتی ئاوێنەبەندی وشە بووی
قەشقۆڵی وەختی نەورۆز بووی
لە ڕەنگدا ئەبریسکایتەوە
بەڵام لێرە هەموو ڕۆژێ پارچەیەکت
لە باڵای خۆت ئەکردەوەو
ئەتدایە دەست کۆچێکی نوێ‌و
تۆ ئێستاکە باڵایەکی لە بەفری ڕەش
لەتێ ئاوێنەت نەماوە
گەر چوویتەوە لەگەڵ خۆتدا
بیبەیتەوە بۆ کیژێکی لای گەرمییان.
تۆ کە هاتی کۆگایەکی گەڕیدە بووی
سەر ڕەفەی شان‌و سەرسنگت
پڕبوون لە شووشەی بۆنی خۆش

بەڵام لێرە هەموو ڕۆژێ

(با)یەك ئەهاتو ئەیبردو

دەنگێك ئەهاتو ئەیبردو

تۆ ئێستاكە كۆگایەكی چۆڵو هۆڵیو

تاقە یەك شووشەی بچكۆلەت پێ نەماوە

گەر چوویتەوە لەگەڵ خۆتدا بیبەیتەوەو

بیدەی لە قژی پەری خان!

ئەی لیمۆكەی ئاوارەیی!

ئەوەندە خۆت مەترنجێنە

نێوانی قوتبو خەمەوە

نەبادا هەر توێكڵەكەتو

هەندێ ناوكی گریاناویت

بۆ نیشتمان.. ببەنەوە!

ئەی باڵندەكەی ئاسمانی ئەم زمانە

ئەوەندە لە ناو كرێوەو باكوزیركدا[35] مەمێنەوە

نەبادا هەر دوو سێ پارچە

لە سەهۆڵی گۆرانیتو

یان هەر پڕ بە مشتێ تەرزە

لە وچوچ[36]و باڵەفڕێت

[35] باكوزیرك: باوبۆران.

[36] وچوچ: جریوەو جووكەی مەل.

بۆ نیشتمان ببەنەوە.
ئەی گڵی وشەو گڵمتکی شاخی شیعر
ئەوەندە خۆت مەدە بەدەم
بای غەوارەو نەناسراوی ناو مەنفاوە
نەبادا ژان
لەم دەسکەوانی قوتبەدا
ورد وردت کاو..
لە دواییدا بەتەنها هەر تووڕەکەیەك
وردە خۆڵت
بۆ نیشتمان ببەنەوە!

زەمانێکە.. من لاتان نیم
زەمانێکە.. چریکەی دەنگم سیس بووە.
ئاخر چیبکەم، زۆر دەمێکە تەماشاتان ئاوم نادات.
زەمانێکە گوڵی بیستنم بێ بۆنە
ئاخر چیبکەم.. پەنگ خواردنەوەی ڕەنگی ڕەشتان
هەموو ڕەنگێکی هەڵمژیم..
تەنانەت بۆنی ناسۆرتان
دەستاو دەستی هەزار بای لاوبالیو هەزار
هەوری بێ دەربەستی دنیا ئەکاو
ئینجا ئەگاتە ماڵەکەم.. ئیتر چیبکەم؟!
من زۆر دوورم.. کامەرانیی.. چەند دوورە دوور

**له ئێوەوە هێندە دوورم.**

**من زۆر دوورم.. ئاشتیی.. چەند دوورە دوور**

**له ئێوەوە.. هێندە دوورم.**

**بۆیە وەختێ من دائەکەم**

**ئێوە خۆشتان کردۆتەوە**

**کە منیش خۆش ئەکەمەوە**

**هەمووتان دائەکەنەوە..**

**زەمانێکە من ناو کوولەکەی ڕۆحی خۆم جێهێشتووە.**

**ئاخر بۆیە بۆنی خۆشی پەلکی قسەو**

**بلازیزی[37] ڕازەکانتان لەمن نایە.**

**زەمانێك بوو.. بەژنو باڵای دەنگەکانو ڕەنگەکانو**

**بۆنەکانم نەبینیبوو.. شێوەیانم بیرچووبۆوە.**

**زەمانێکە.. کە من ڕۆیشتم**

**گەڕەکەکەمان زامێکی زۆر بچووك بوو**

**کەچی دوێنێ کە دیمەوە گەورە بوو بوو گەورە بوو بوو**

**بوو بوو بە شار**

**من وەختابوو نەیناسمەوە.**

**ئۆه ! گوڵاوم !**

**من ڕۆیشتمو چاوانی خۆم بۆ جێهێشتی**

**من پێم وتی: ئەم شەوانە شەوی عەقڵی تارو مارن**

---

[37] بلازیز: ناوی گوڵێکی زۆر بۆنخۆشه.

با دوو چرای زیادت لابن.
من ڕۆیشتمو هەردوو گوێچکەی بیستنی خۆم لاجێهێشتی
ئەم شەوانە شەوی دزی مانگو خوێنن
با دوو گاردی زیادت لابن .
من ڕۆیشتمو زاری خۆمم لاجێهێشتی
ئەم شەوانە، وەك پێم وتی: شەوی زەهر دەرخوارد دانن
با زارێکی زیادت لابێ.
من ڕۆیشتمو لە دواییدا (بۆبێژان)[38] و رۆحی عەتری
هەرچی شیعری قوربانیمە بۆم جێهێشتی..
وەك پێم وتی: ئەم شەوانە شەوی گەڕانەوەی بۆنی
لاکەکانی خیانەتەو با لەخۆتم بپرژێنی !.
من بە بێ بۆی بەژنی ئێوە..
دار چامەیەکی ڕنراوم..
من بە بێ بۆی دەنگی ئێوە
باڵەبانێکی شکاوم!
یادی بۆنی شینم کردن
لەناو خەوما گوڵەمێلاقەیەك ڕووا.
یادی بۆنی  سوورم کردن.
ڕاپەڕینی زام بەرپا بوو لەناو خەوما
بیری بۆنی کەسکم کردن
دار سنەوبەر کەوتە فڕین لەناو سەرما

---

[38] بۆبێژان: ناوی گیایەکی بۆنخۆشە.

یادی بۆنی زەردم کردن
نیشتمانە ڕەنگ زەردەکەم هاتە ئێرە لەناو خەوما!

ئاخ نیشتمان! ئەی ئەو بەرانە کێوییەی هەزار ساڵە
لە دەراڵی مێژوویەکی عاسیدا تۆ ئەباڕێنیو جگە لە
ئابڵووقەی ڕمی دنیا بەردی خۆت تەقەت لێ ئەکاو
درەختی خۆت ڕاوت ئەنێو قۆچەکانی خۆت ڕاوچیتن.
ئاخ نیشتمان! ئەی بێوەژنە بەدبەختە چاو سەوزەکەی
ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. شووت بە هەموو وەرزەکان کرد.
شووت بە هەموو رەنگەکان کرد.
شووت بە هەموو دەنگەکان کرد.
شووت بە هەموو بۆنەکان کرد
بەڵام هەموو دەستیان بڕییت، بەڵام هەموو دەریانکردیت.
ئاخ نیشتمان ! ئەوەی ئیستە بۆی تۆی لێ بێو لە لای من بێ،
هەر خەونێکی کراس ڕەشەو هەر شیعرێکی هەنیە تەڕەو..
هەموو جارێ بە پایزێکی پۆستەچیی ڕەقەڵەدا بۆم ئەنێریت.
ئای نیشتمان! ئای نیشتمانی بەجێماو لەسەر خابوور..
ئای نیشتمانی قوڕاوییو سەر خوێناویی، ئێمەی سەرو مل
لێکەوتووی سەر جادەکانی ئەوروپا، ئێمەی لە پوولی بەرید
چووی بەکارهاتوو، ئیدی لە قوتوی قوپاو چووی کۆکا
کۆلای فڕێدراو لە هەندەران، هەر هەموومان ئەو ڕۆژەمان
باش لەبیرە، چۆن بە پەلە لە ماڵەوە، تۆی ئازیزمان

تۆی سوراحیی کریستاڵی ڕۆحو چاومان، لە پەڕۆی پێڵاو سڕینو
جلی ژێرەوەمان ئاڵان، هەتا نەشکێی، تا بەساغیی
لەسەر خابوور بتدەینە دەست قاچاخچییەکان. ئای نیشتمان !

ئای نیشتمانی خەڵەتاو بە فرمێسکی هەندێ شیعرو بە سوێندە
هەڵمی مانشێتی ڕۆژنامەکان. ئەی نیشتمانی سیسەڵە.
تۆیش لەبیرتە، وەختێ لەوێ، لەجانتادا دەرمانهێنایت،
لە دوای ئەوەی خۆتت تەکان، لەگەڵ هەورا باوەشت کرد،
بەملمانداو تۆزێ بەسەرماندا گریای ! بەڵام ئاخر ئەی نیشتمانی
خۆش باوەڕ! لەو ساتەداو لە گیرفانی بەرباخەڵدا ئێمە چەندین
وڵاتی خرپن خرپنو جوانکیلەمان هەڵگرتبوو، بۆیە سەیریشمان
نەکردیو دیسانەوە هەر بە پەلە لەگەڵ ڤیزە ئاڵوگۆڕێکمان
پێکردیو ئەوسا ئیتر ئەی نیشتمانی سیسەڵە وەك نوکتەیەکی
نەوتاویو چون مەیمونێکی قوڕاوی بۆ پێکەنینی ئەتاتورك لەسەر
خابوور جێمانهێشتی.

﴿ دوا گۆرانیو سروودی ناو ئەم بۆننامەیە، بریتییە
لە کورتە ژیننامەی وشەیەکی خەڵکی مەملەکەتەکەی مەمو زین.
لە پێشدا لەژێر سایەی بۆنکردنی ئەتاتورکداو لە دواییدا.. لەلوتکەوە
باڵگرتنو لەچریکەدانو هەڵفڕین ﴾

ئەتاتورك گوێی هەڵخستووە
گوێی ئەتاتورك سەدان سەدان کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.

ئەو بۆن ئەکات. بۆنی ماڵو بۆنی جلو بۆنی پەیڤو
بۆنی خەونو بۆنی هەوا. کەپووی هێندەی چیای تۆرۆس
زلو پانە. وشەی چیا هەرزەکارێکی بێکارە . هەموو
ڕۆژێ دەمامکێ هەڵئەبەستێو جلەکانی خۆی ئەگۆڕێو
لە ماڵەوە دێتە دەرێ. لەسەر کورسیی چایخانەیەك دائەنیشێ.
وشەی وەڕس، هیچ ناڵێتو بە تەنها ورد ئەبێتەوە.
لە قەفەز ورد ئەبێتەوە، لە ئاسمان ورد ئەبێتەوە. وشەی
دەس بەسەرو بێ دەنگ، هەر بە کرِیی چای بەردەمی تێك
ئەداتو ئەیخواتەوە. لە ڕۆژێکدا دوو پاکەت خەمی بێ فلتەر
ئەکێشێتو نادوێو هەر پەنگ ئەخواتەوە. ئەتاتورك گوێی
ڕاگرتووە، کەپووی ناوە بە دڵیەوە . هەموو ڕۆژێکیش
باوکی تورك، بەدەستی خۆی، حەرفێکی بزوێن ئەگرێتو داخی
ئەکاو هەموو ڕۆژێ لە پرچەوە گۆرانییەك هەڵئەواسێ. وشەی
چیا نادوێو هەر پەنگ ئەخواتەوە. ئێوارەیەك وشە ئەچێتەوە
ماڵێ. لەبەر ئاوێنەیەکدا ئەوەستێ: سەرنج ئەداو دائەچڵەکێ.
سەری بووە، بە قەفەزێ. لە دە پەنجە پێنجی ماوەو دائەچڵەکێ
چاوێکی بووە بە شووشە . یەك قاچیشی بە تەنەکە. ڕائەچڵەکێ..
دەمامك فڕێ ئەداتو جلی لاوکێك ئەپۆشێ. لە ئاگرەکەی
جەستەی (زەکیە) پشتێنێکی پان دائەدڕێو توند ئەیبەستێ. چەند
مشتێکیش لە گەنمو جۆی قسەکانی، (بەشکچی) ئەکا بە تێشوو
ئەچێتەوە بەر ئاوێنە. ئەمجارەیان خۆی ئەبینێ، ساغ بۆتەوە.
لە خۆشیاندا پێ ئەکەنێ. لە ماڵەوە دێتە دەرێ. ئەمجارەیان روو ناکاتە

چایخانەکەو ڕێ ئەگۆڕێ. دەشتی دووکەڵ.. گردی پەنگر..
کێوی مردن، هەمووی ئەبڕێو تا ئەگاتە کانیو ئاوێ. لەوێ
خەونی خۆی ئەبینێ بووە بە ئەسپێکی سوورو سواری ئەبێ، وشەی
باڵدار تەنها لەوێ بۆنی سبەینێ ئەکاتو گەر بشمرێ لەسەر
کورسیی ئەستێرەیەك گیان ئەداتو لە جۆلانەی ئاگرێکدا چاو لێك ئەنێ
ئای نیشتمان.. ئای نیشتمانی بەجێماو لەسەر خابوور.

ئێمە بۆی دەرچووین.. بۆی دەرچووین
ئێمە  هەڵاتین.. هەڵاتین..

نیشتمان ئەسپێ تێی دابوو.. نیشتمان توێکڵە مۆزێکی سلۆپی
بوو. بۆیە وەختێ کەوتینە ڕێ، هەر لەولای تەرمیناڵەوە
لە پەنجەرەی  پاسەکەوە فڕێمان دا. ئەو دایکێکی تەنەکە بوو،
دامانە بەر نووکە شەقو تا ئەنقەرە تێمان هەڵدا.
وەتەن ریخۆڵە کوێرە بوو لە ئەستەمبووڵ بڕیمانو
بۆ دڕە ماسیی ناو (ئیجە) تووڕمان هەڵدا. نیشتمان
میوەی گلار بوو. نیشتمان بۆنی کردبوو. نیشتمان چێشتی
ترشاو بوو لووتمان گرتو لە قەراغی کەشتییەوە
ڕشتمانە ناو بسفۆڕەوەو ئەویش ڕایدا.

ئێمە تیسکەی تەیارە بووین..
ئێمە بۆی دەرچووین.. بۆی دەرچووین !.
ئێمە تیسکەی.. ڤیزەو ترس بووین..

**ئێمە هەڵاتین.. هەڵاتین!**

**ئەی نیشتمانی سیسەڵە ! جێمان هێشتی !**

**- هەلاو.. هەلاو.. هەلاو..**

**- تۆ نیشتمانی سیسەڵەی؟! توخوا خۆتی؟!**

**ئەرێ ماوی؟!!**

**ئێمە بۆی دەرچووین.. بۆی دەرچووین**

**ئێمە هەڵاتین.. هەڵاتین..**

**هەڵاتین!**

ستۆکهۆڵم

تێنستا

1998/5/19 – 1997/10/17

# وتەیەك

لەسەرەتای دەستدانە قەڵەم و لەیەکەم چاوپشکوتنی بەهرەوە، لە شیعرەکانی "تریفەی هەڵبەست "ەوە تا ئەمڕۆ، ناوی "قوربانیەکانی" ئازادیی و خوێنی دەم بەهاواریان و ئینجا سیحری "شوێن" و جوانیی "سروشت "و چریکەی سروودە میللی و نەتەوەییەکانمان و سومبولەکانی خاك و مێژوو، داستانەکانی خۆبەخت کردن، مەرگی یاران و ئازیزان و زنجیرە دیرۆکی تراژیدیای خوێناویی گەلی کوردو هەروەها مرۆڤایەتیو دنیاش؛ لەشیعرو پەخشانی مندا لەنیشانە هەرە دیارەکانی ئەوین و پەیامی ئەدەبیی پەیوەندارییی نەپساوەی گیانی من بوون بەچارەنووسی ملیۆنان مرۆڤی ئەم ولاتەو بە هەموو بەها جوانەکانی جیهانیشەوە. هەر لە سەرەتای گیرۆدەبوونی عەشقی ئەم زمانەوە، تا هەنووکە، شیعر لای من شێوازو ئامانجیش بووە. ئەوەندەی من لەو خەمە گەورانەی دەرەوەی خۆم ئالاوم، قەت ئەوەندە، لە خەمە تایبەتەکانی خودی خۆم نەئالاوم. پێ ئەچێ خۆشەویستی خاك و مرۆڤایەتی منیان کردبێ بەشاعیر. چونکە بڕوام وایە، ئەدەب و هونەری بێ خەڵك و بێ خۆشەویستی خەڵك تەنانەت ئەگەر جوانیش بن، لەگوڵدانی خاڵیی و خانووی چۆڵ ئەچن!.خولیای هەمیشەی من ئەوە بوو ئەدەبێ بنووسم لە دڵەوە بۆ دڵ بێت و بتوانم گوزارشت لەو خولیاو مەراق و خەیالانە بکەم کە لەدڵی خەڵکیدان و ئەوان ناتوانن دەریببڕن و من لە خولقاندنەوەیەکی دیکەدا، بیانخەمە پێش چاو. نوێخوازیش بەلای منەوە نەزمان قفلکردنەو نەوالاکردنی تەواوی هەموو دەرگاکانیشە.ئەزموونی دوورودرێژی خۆم ئەوەی فێرکردووم، ئەگەر لە رۆحی زمانەکەی خۆمدا نەژیم هەرگیز لە رۆحی هیچ زمانێکی دیکەی دنیادا ناژیم. جیهانبینی لێرەوە دەست پێئەکات. نە فانتازیای رووت ئەدەبەو نە ناوەڕۆکی بێ فانتازییایش ئەفراندنە. ناوەندێك هەیە، کە بەردەوام ئەو

"نەهێنییە" خۆی تێدا حەشارداوەو "سادەییش" هەوێنێتی، دیارە ئەو سادەییەم مەبەستە کە لە خودی "حەقیقەت" خۆیو لە خودی جوانیی خۆیدا هەیە. ئەمە جگە لەوەی بەشێکی لەبەرچاوی ئەفراندنیش، بریتییە: لەچنینی سنعەتکارانە، هەر لەبەرئەوەیشە قەڵەمی زاڵ و بەهرەی توانادار ئەتوانێ بڕیار بداو بنووسێ و بخوڵقێنێ. بەتایبەتی ئەوکاتەی ئەدیب،چاوگی عەشقێك، هەر عەشقێك کوانووی گیان و هزرو هەست و نەستی بێ. رەنگە ئەدەبی "بۆنە" کانیش بچنە ئەم خانەیەوە. من بۆ خۆیشم پێم وانییە. وەك هەندێ رەخنەگر ئەڵێن هەر دەقێك "بۆنە" دروستی بکات،ئیتر ئەوە ئەبێ لە دەقە مردووەکان بێت. هەڵبەتە من مەبەستم بۆنەیەکە کەپاکی و بەهاداری و هەڵوێستی ئینسانیانە خاسیەتە جوانەکانیان بن. لە ئەدەبی ئێمەدا، بۆ نموونە، شیعرە هەرە جوانەکانی "مەولەوی" "بۆنە" تایبەتی و پیرۆزەکان دروستیان کردوون. ئەوەی بەلای منیشەوە لەپلەی یەکەمدا دێت، چۆنیەتی دەربڕین و مەزنیی ئەو زمانەیە کە ئەبێتە باڵا ئاوێنەی بابەتەکە. ئەدەب بەوردەکارییەوە ئەدەبە. وەك چۆن وشەی ناشیعری نییە، بابەتی ناشیعریش نییە. نووسین بەرپرسییەو گەمەی سەرە رۆیانە نییە، ئەفراندن ئاوێتە بوونێکە لەنێوان جوانیی و راستیی و هەڵوێستدا، فڕینی زمانە لە بەرزاییەکانی مانادا.ئەم کتێبەی لەبەر دەستاندایە، هەڵبژاردەیبەشێکە لە پەخشانەکانم بەتایبەتی لە دە ساڵی دواییدا، کە هەندێ جاریش، ناوی "وتەی ئەدەبیی " یان "پەیڤی شیعریش"م لێناون و لە سەردەمی جیاجیادا نوسیومن و بەشێکیان لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوبوونەتەوە و بەشێکی تریشیان بۆ یەکەم جارە ئەکەونە پێش چاو و دوای کۆکردنەوەیان چەند پارچەیەکیان نەبێت کە لەم لاو لەولا"کەمێ دەستکاریم کردونەتەوە "وەکی تر وەك خۆیان چۆن بوون هەر بەو شێوەیە ماونەتەوە. ئەوەی لە کۆتایی ئەم وتەیەشدا، شایەنی ئاماژە بۆکردن بێت، ئەوەیە: گەلێجار تخووبەکانی نێوان "شیعر" و "پەخشان"هەر تەواو کاڵ ئەبنەوە بەگران لە یەکتر جوێ ئەکرێنەوە. ڕەنگە "پەخشان" بەبەراورد لەگەڵ "شیعر" دا، بەدەنگێکی بەرزترو هەندێجاریش راستەوخۆتر بدوێ. زمانی"مەجاز"یشی تەنکترە و مەنتیقی عەقڵیی زاڵترە و دەرگاکانی خۆی زیاتر ئەکاتەوە. بیرمە جارێك لە دیدارێکدا وتم: شیعر شاخ و داخی زمانەو بەلأم پەخشان پێدەشتێتی!.

" چراکانی سەر هەڵەمووت "..کۆمەڵە ئەزموون و ئەوینێکی تری ژیانی ئەدەبیی منە. ئەو پەخشانانەن کە لە هەناسەکانی شیعر خۆی موتوربە کراون. هەڵوێستی بەرجەستەن و گوڵدانی وەفان بۆ ئەو هاورێو مامۆستاو پێشمەرگەو خۆشەویستانەی بەجێیانهێشتین و بەلاَم دوای خۆیان مانایەکیان دا بەژیان و خەبات و داهێنان و منیشیان لە ئەوینی خۆیاندا نوقمکرد.

"چراکانی سەر هەڵەمووت "، سومبولە داگیرساوەکانن.ئەشێ ئەم چرایانە هەموو چونیەك شەوقیان خۆش نەبێ. ئەشێ چونیەك لەیەك ئاستی رەوانبێژی زمان و ئاستی هونەریدا نەبن و بەلاَم هەر هەموویان هەڵقوڵیوی دەروون و بیری خۆمن، هەڵوێستن لە وشەداو بەسەرکردنەوەی بەها جوانەکانی ژیانن. زمانی ئەوینی ئەدەبیی منن لەو ساتەوەختانەدا کە "نیشتمان " داوای نوسینیانی لێکردووم!. من هاورێی رۆژگارەکانی ئەم خاکە بووم. هاورێی ئازارو ئاواتیان کە ئازارو ئاواتی خودی خۆیشم بوون. "چراکانی سەرهەڵەمووت "..بەردەوام بریسکەیان دێ و لە بیرەوەریمدا بەزیندوویی ئەمێننەوە.

ش.ب

سلێمانی:1999/5/11

# عەبدوڵڵا جەوهەر

# قەڵەمێکی ڕەنگین و گۆمێکی مەنگ

1982

کەهاتین بۆڵات دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ بوو، تۆش لەئێوارەی ژیانـدا بـووی. دوا زەردەپەڕی خۆرنشینێکی کاڵی خەماوی لەشووشەی پەنجەرەکەوە بـەکزی خـۆی ئـەکرد بەم دیـودا و بەهێواشـی ئەچـووە سـەرکلووی قـژە سـپیەکەت. بـەفری بەرمانگـە شـەوی هاوینـانی بـێ سـرپەو چـرپەی ملـە بـەرزەکانی ئـەم وڵاتـەیان هێنایـەوە پـێش چـاوی خەیاڵم. تەمی سەروخوار گرتووی ئاسۆی پـێش ئـەنگۆرە، پـێش ئـاوا بـوونی یـەکجاری، چۆن لە دامێنی تەڕی چەمەکانەوە دەواری خۆڵەمێشی خۆی هەڵئەداو بەرەو لاپاڵـەکان هەڵئەکـشێت، تــەمێکی ئــاوا، لەچــەناگە پــچووکەکەت و دەم و چــاوە ووردو ئێــسک سووکەکەت نیشتبوو.کەئێمەت دی زەردەخەنەیەکی هەڵوەریو.. وەك زەردەخەنـەی تـاڵ و بەناسـۆری درەختێکـی ڕووتـی پـایزەی نێـو خـەزان، وەك بـزەی گۆپکەیـەکی داڕنـراو، کەوتـە سـەر بـەیبوونی وشـکی لێوەکانـت. بۆسـاتەوەختێ هەرئەوەنـدەی چـاو تروکـانێ کەمتر لە وەختی بەیەکدا دانی باڵی نەرمی پەپوولەیەك، کەمتریش لە پلی لێدانی دڵـی چـۆلەکەیەك گەشـایتەوەو ئـیتر لـە پرێکـدا چـۆن فویـەك لـەگڕی کـز کـراوی چـرایە ئەکرێت، ئاوەهاش زەردەخەنەکەت کوژایەوە!.

لەسەر پشت ڕاکشابوویت ژوورەکەت بۆنی مردنی لێ ئەهات، ئەو چاوە پـچووکانەی کـە تـا دوێنـێ بـوو لـە ژێـر دوو بـرۆی تەنکـەوە وەك دوو ئـاگردان پریـشکی زرنگـی و هۆشیاریان لێ ئەبۆوە وا ئێستا پشکۆی گلێنەیان دامردۆتەوە. دوو ئاوێنەی تەم گرتـووی شەوق لێ بڕاون و دوو گوڵە حاجیلەی سیس.

لەسەر پشت راکشابوویت لەلقەدارێکی زامداری دوای بڕینەوە ئەچوویت. نیگای لێڵ و پێڵت لەشوێنێکی نادیارەو چەقیان لەوێدا بەستووە.لەمەرگ ورد ئەبوویتەوە. خۆت دابوو بەدەم دوا شەپۆلی سەرەو نگووم بونێکەوە کەدۆزینەوەی لەدوا نەبێ ئەتزانی لەئان و ساتدایە گێژەنی مەرگ بەرەو بن ڕاپێچت بکات. ئەتزانی وردە وردە لێت نزیك ئەبێتەوە و لەدوایشدا ئەتگرێتە باوەشی ئەبەدی خۆی!.

لەسەر پشت راکشابوویت، هاوارێکی بێ دەنگ بوویت، ئەوەتا دەمی گوێزانی ئازارێکی تیژ ناوسکت ئەنجن ئەنجن ئەکات. برینەکان شەقارن و وردە شووشە یان تێکراوە. بەلاَم بێدەنگ ئەمردی. لەمردن نەئەپاڕایتەوە، زۆرت لە زامەکانت ئەکرد و دەمیانت ئەبەست. بۆئەوەی نەزریکێنن و ورە بەرنەدەن. لەو سەرە مەرگەشدا هەر بێ دەنگی و هێمنی و ئارامیت خۆش ئەویست. ئازاری بە سوێی جەرگبڕت لە ژێر لێو کرۆشتنێکی قایمدا دابین ئەکرد، مردنی شێنەییت هەڵ ئەبژارد، تۆ بە درێژایی تەمەن هەر شەماڵێکی شێنەیی بوویت، هەر گۆمێکی قووڵ و مەنگ و ڕەگێکی جیڕ بوویت. تۆ گوڵە هێرۆیەکی سەرلق سپی بوویت و بەرز ئەتروانی، لە درەختێکی تەنیایی سەرپەڕگرتووی تەریك ئەچوویت، سێبەرێکی کڕت هەبوو، بەلاَم هەموو کەس نەئەگەیشتە لات. لە نەهێنی چرۆپڕت نەئەگەیشتن لە دەورو بەری پڕ لە ڕیاو ڕیاکاری مانێکی تایبەتیت گرتبوو.دڵت ئاسکێکی سرك بوو نەئەگیرا، سروشتی تایبەتیت ئەسپێکی کێوی بوو ڕاو نەئەکرا. تۆ نوێژێکی تایبەتیت بۆ خۆشەویستی کوردستان ئەکردو لە نوێژی جگەرسۆزانی تر نەئەچوو. ئاوێنەی خۆت هەبوو لەئاوێنەی هیچ کەسێکدا تەماشای خۆت نەئەکرد.گیانت پەپولەیەکی باڵ نەخشین بوو، هەموو ڕۆژێ بە سێبەرو هەتاوی ئەم شارەدا بە هێوری ئەفڕی و بە هێوریش ئەنیشتەوە. تەمەنی تۆ هەمووی " ئەسپایی" بوو وەك هەموو ئەسپاییە جوانەکانی ناو سروشت. دەم و دووت، هاتو چۆت، گوێگرتنت، خوێندنەوەت، نووسینت،تەنانەت هاواری بێزاریشت هەر ئەسپایی بوو. تۆ لەم سەردەمە ئاڵۆزەدا گیانی فریشتەییت لەئامێز گرتبوو.

لەسەر پشت ڕاکشابوویت نە هاوسەرێك هەبوو سەر بنێ بەبەفری قژتەوە نە جگەرگۆشەیەك سەری باوکێتی بنێ بە دڵیەوە. تۆو تەنیایی هاوڕێی گیانی بەگیانی

بوون، هەمیشە قۆڵتان لەقۆڵی یەکدا بوو، ئەوت بەهاوسەر هەڵبژاردبوو لەماڵێکی چۆڵ و کپو خامۆشدا کە لە جریوەو جووکەی چۆلەکەو وژەی لەرینەوەی لق و پۆپی درەختەکان بەولاوە دەنگێکی تری لێوە نەئەهات لەوێدا تۆ و تەنیایی، تۆو خەمی جگەرگۆشەکەت، پێکەوە ئەژیان تاكو تەرابوون، دەمت تێ ئەکردن.

لەسەرپشت ڕاکشابوویت بەدەم گێنگڵەوە ئەلبوومی یادگارت هەڵئەدایەوە. دەستی ڕاستت خستبوە سەر پۆپەشمینەکە، پەنجە باریك و لاوازەکانت لە پەلکەگیای وەرزی باران بڕان ئەچوون، ئەوەتا ئێستە زەردبوون و لە بریق و باق کەوتوون. پەنجەکانت ئەو پەنجانەی ڕۆژانێ بوو قەڵەمێکی ڕەنگینیان ئەگرت و ملوانکەی بەهرەیان ئەکردە مل. ڕۆژانێ بوو ئەو پەنجانە پەلکە ڕەنگینەی "پەخشان" یان لە پێشوازی "گەلاوێژ"دا ئەکرد بە تاقی سەلیقەو، بەچەل چرای بیر ئەیانڕازانەوە، لەئاسمانی ئەودا ئەدرەوشانەوە. جریوەیان ئەهات و خەوی ڕەنگاوڕەنگی خۆشیان ئەبینی و گولاَو پرژێنی پرچەکانی ئەویان ئەکرد، ڕۆژانێ بوو ئەو پەنجانە ئاوێزانی ئەم زمانە کوردییە شیرینە بوون. کانیاوی بەهرە ئەبوو بەجۆگەی ڕوون ورەوانی بەرهەتاوی زنوێران و ئەڕژایە روباری ئەدەبیاتی سەردەمی تازەمانەوە.

قەڵەمەکەت لە قەڵەمە پێشڕەوەکانە، ئەو قەڵەمانەی لە ڕۆژگارە تاریکەکاندا چراوگ بوون، دریان بە دیواری شەوی ئەمووستەچاو ئەدا. گوڵ بارانی ئەدەبی نوێ بوو، گوڵەکانی تۆش لە گوڵە دەگمەنەکان بوون. راکشاویت و نیگای خەیاڵ پێڵوی تەڕیان ئەکەن بەباڵ. لەسەردەمی لاوێتیشدا تۆ هەر کەنارت گرتبوو - کۆترە باریکەکەی دەنگ خۆشی تەریو بوویت -. لەجۆشی تەمەندا، لەهەرەتی قوڵپدانی خوێنی بەهرەو نووسیندا بەپێچەوانەی ئاوەڵەکانتەوە حەزت نەئەکرد بەهرەکەت بکەیتە ئالاَو لەبەرچاوان بشەکێتەوە، لەو قۆناغەشدا رقت لە لاپرەسەنگی و خۆدەرخستن ئەبۆوە.

نازناوی "ع. چالاك" ت بۆ خۆت کرد بەنیشانە، گەلاوێژت کرد بەجێ نزرگە. لەم ساڵانەی دوایشدا کە کوڕ و کاڵانی ئەدیب و ئەدەب دۆست ئەهاتنە لاتەوەو لەبەرهەمی ئەو سەردەمەت ئەدوان. تۆ خۆت نەئەکرد بە خاوەنیان، بەهێورییەکەی خۆت

دەسـتێکت رائەوەشـان و ئـەتوت " هـی مـن نـین، کـوا مـن ئـەدیبم؟".تۆزقـاڵێ گیـانی خۆویستی و چاوچنۆکی و خۆبەزل زانـین لـەتۆدا نـەبوو. لەکاتێکدا ئەگـەر بتویـستایە قەڵەمەکەت بەئاشکرا تاو بدەیت چەپکە گوڵەکانت بێنیتە ناو کۆڕەوەو ریزیان بکەیت. دڵنیام ئەوسا قەڵەمەکەت پێش زۆر قەڵەم ئەکەوت،گوڵەکانیش بازاڕی ڕەونەقی زۆریان ئەشکان چ گیـانێکی سـادەو بـەفرینی پاکت هـەبوو. زۆربـەی هاوڕێکـانی ئـەم سـاڵانەی دواییت رەش و رووت و بێکارو خەڵکە سادەو ساکارەکانی شارەکەم بوون. ئەوانت زۆرتر ئەدوان، ئەوانت لە خوێندەوارە درۆزنەکان خۆشتر ئەویست.

لەسەر پشت راکشابوویت، منـداڵیی خۆت ئەلاوانـدەوە: ئـەی دارسـتان و قۆپی و کـاوان و لێـرەوارو کانیاوەکـانی "قـەرەداغ" بـەهرەی چـاوی تۆیـان نەڕشـت؟ ئـەی ئـەو بـیرەوەری و سەرگورشتەو بەیت و گۆرانیە میللییانەی — قەرەداغ-ت نەکردووە بەکۆمـەڵێ تـابلۆی رەنگـین و هەڵت نەگرتوون؟ ئەی لاوانەوە بەسۆزەکەی ـ دایەگیان ـ هەر بۆن و بەرامەی " باخـان" ی قەرەداغ و سنگ و بەرۆکی دایکانی ئەوێی لێ نایەت؟!

هێـشتا قوتابیـەکی لـەڕو لاوازی مـل بـاریکی گۆشـەگیری مـەنگ بوویـت کـە بـەهرەی قەڵەمەکەت چاوی تیژی " پیرەمێرد " ی گـەورەی قۆسـتەوە، هـات بـە پیرتـەوە. بەهرەکـەتی گرتە باوەش، لێی وردبۆوە، گەش بووی. تۆ ئەوساش هەر شەرمنێکی سـەرکزو بـەلام دڵ وریـا بووی."پیرەمێرد"  ی باوك دەستی بەسەرە پچووکەکەتا هێنا، بەرهەمەکەتی خستە سەر دڵ، تۆ بڕوات نەئەکرد، نۆبەرەکەت ناونا بوو" ئاوات"، پیرەمێردی کەڵە شاعیر بەدەستی ڕەنگینی خۆی هەر لە چاپخانە دێرینەکەدا لەچاپیدا.

لەوەدابوو ـ ئاوات ـ ئاواتی نۆبەرە بەهەنگاوی گەورەوە بچێتە ناو کـۆڕو کۆمـەڵانی خوێندەواری ئەو سەردەمەوە.. بـەلام لـە پڕێکـدا ڕێگـەیان پـێ گـرت. ڕاپـۆرت نووسـانی دەسـەنەخۆری ئینگلیـز، مڵـەو دووپـشکەکانی نـاو بـاخی ئـەدەبیاتمان، جڕوجانـەوەرە رموزنـەکان، بەخەنجـەری رووتـەوە گەیـشتنە سـەر نۆبـەرەی ئـاواتی جەوهـەرو لـە بەردەمی پیرەمێرددا   سەریان بڕی.

لەسەر پـشت راکـشاویت، زەرد.. زەرد.. زەرد.. زەرد، هـەر ئـەڵێی مـانگی کوژراویـت، لەناوەوە ئازار ئەڕواو ئەتکێڵێ، تۆ کێڵگەی زات و ورەی لەناو چنگی ئەختەبووتی هەزار

پـەلی"سـەرەتان " دا لـوول ئـەخۆیت و هـاوار ناکـەی.. چ ورەیـەکی بەسـامی و چـەندە ئارامێکی گەورەی. لەسەر پشت راکشاویت، دەنگت لەناو هەناسەی سواردا خنکاوە.

ئەی "جەوهەر " ی رەوشت،ئەی گوڵە هێرۆی لاسك شـکاوەی مـل بـەلارەوە گرتـوو، بـۆ یەکـەمجار لـە چـایخانەیەکی پـەڕپووت و بـچووکی شـارەکەمدا یـەکترمان ناسـی، بـۆ دواجاریش، بەرلەوەی ئەم دەردە گرانە لە پەل و پۆت بخات هـەر لـە چـایخانەیەکی وادا لەیەکتر جیابووینەوە.

لەسەر پشت راکشاویت رووە ژاکاوەکەت لە منە، پار ئەم وەختـە بـوو، دیـسانەوە سـەرم کردەوە سەرت، مەنگیتم شڵەقاند، بەڵام لێڵم نـەکردی، ئـەمزانی تـۆ ماسـیەکی ئـەم گـۆمی شینی ئەدەبەیت و بێ ئەو ناژیت، ئەمزانی کەشەو دادێ و دنیا ئەنوێ، تـۆی شـەیدا لەگـەڵ وشەدا رۆژ ئەکەیتەوە و بێدەنگ ئەسـووتێیت، بێـدەنگ ئـەگریت و خـەڵوەت جـێ نـاهێڵی! بیست ساڵ بوو ئەمناسیت، بەدەم پێت نەوتووم بەڵام چاوت بەئاشکرا ئەیدرکان کەخۆشـت ئەوێم، چاوت ئاوێنەیەکی بێ گەردی راست گۆیی بوو. دەسـتت نـەنا بـە ڕووی داواکەمـەوە. چـەند بەرهـەمێکی لـە کـونی هەتیتـەدا هـەڵگیراوت بـۆ هێنـام، سـێ دەفتـەر چـەند رۆژێ لەگەڵیاندا ژیام، چەند رۆژێ بەبادەی زمانی شیرینی ئەوان مەسـت بـووم. نووسینەکانیـشت وەك خـۆت ناسـك بـوون، وەك خـۆت کـەم دووی پوخـت و پـاك بـوون. قەڵـەمی ناوبـەناوی رەخنەشت، وەك رەوشتی خۆت بەرزبوون، زمانی تەڕو پاراو و نەوازەی بێگەرێ و گۆڵ سفت و رەوان و درەوشاوە بەقسەی نەستەقی باوو باپیران خۆش کـراو.. رسـتەی کوردانـەی پتـەو دارێژراو، دڵی منیان لە زوەوە کەمەند بەند کردبوو. کوت و مت وەك خۆشەویستی داربەڕو و ئاوی ئەم کوردستانە.

لەسـەر پـشت راکـشاویت وا چـاوت لێـك نـاو ئـاوا بوویـت. دە ماڵئـاوا، ئـەی قەڵەمـە ڕەنگینەکە تۆ لە گوڵدانی دڵمای، ئەمجارە لەوێدا راکشێ!.

# ئەوزامەی بوو بە مانگ!

## 1992 ـ 1999

بەورێکی تری نێوداستانی گڕەو دارستانی پشکۆمان کۆچیکردوو
مێژوومان بۆ ساتەوەختێ پڕ بە گەرووی
دەربەندو ئەشکەوتو کەوێڵو
بەرگێلنەکانمان زریکاندی.. زریکەی مێژوو
سەرچاوە لە خوێنجمانی
ئازادییەوە ئەگرێ، ئەو دەمەی خاك ژانی بە بوومەلەرزەی
ڕاپەڕینو زاوزێی شەهیدو تەقینەوەی شیعرو لرفەکردنی بەلووزەوی
خەمی دایکانەوە ئەگرت!.
مانگێکی دیکەی گەرمەسێر کۆچی کردوو..ئەستێران داباریـن و
پێدەشتیان ئاڵو والآ کردو هەزاران پارچە ئاوێنەی شکاوی هەتاو
بە درێژایی کەنارەکانی سیروان خەونیان پڕاوگۆڕانییان ڕژاو کردیان
بە شایی خوێنو ژان.
منداڵانی پێپەتی و دەم و چاو خۆڵاویی ئێمەش بۆ یەکەم جار
لە بەردەم دەروازەی مزگێنیدا گوڵە زەردی
زەردەخەنەیان چنیەوەو باوەشیان

به لاملی بەهارێکی راپەڕیودا کرد. ئەو دەمە لە هەناوی قرچەقرچ
پێکەوتووی بەرکاوو گردۆڵکەکانەوە گوڵەگەنمی ریشاڵ ریشاڵی
سووری بەیانیەکی تازە، کازیوەیەکی دەمو
لێو زیوین، گەردن کافوریی،
بەژن زراڤی چاوپڕ لە تریفەی دەست و پل زێڕین لە دایك بوو.
لەو رۆژەدا. لەپەڵە خوێنێکی سەرسنگە هەڵقرچاوەکەی دوزەوە،
لەزاری لێو بەخەندەی برینێکی رەشتاڵەوە سەمەلی ئازادیمان سەری
دەرهێناو بوو بە شایی قوربانیەکانمان، بوو بە ڕەشبەڵەکی سێدارەو
سەرچۆپی هەرهەموو برینەکانمان.
دووز، دووز مەچەکی تووکنی حەمرین
بازووەبەندەکەی عاشقانی بەفروگڕە
ناو دەمی کوڕێکی دیکەی گەردەلوولی
خۆی ماچکردوو سەری خستە سەر رانی
سۆزو خۆشەویستیی گەرمێن و
دواتر پەنجەی نەرمی شەماڵێك لە دەربەند باسەڕەوە هات و
گەیشتە ناو دیدەمان و ئەوسا پێڵوی ماندوومان ئاڵ هەڵگەڕاو
بو بە گوڵجارو رووی ئەم زامەیشمان بوو بە
مانگ و گیانیشمان بەخەرمانەی
ئەو دەمە، دوور لەو مانگە، من لە ژووری تەنیایی و
نامۆییەکی شێداری دڵ گوشراودا خەریکی ئەوەبووم
لەو گوڵجاڕی گەرمێنە کراسێ بۆ شیعرێکی نوێم بدرووم.
لەپڕ بازێکی پەڕوباڵ سپیی هاتو لەسەر سەرم لەنگەری گرتو

به دەم چریکەی سۆزێکی مەولانە ئاساوە
شیعرەکەی پێ بڕیم وتی: لە نێوان پەڵە خوێنەکەی دووز و
سەرەتای هەڵکردنی ئەو زریانەدا
مێژوویەکی دووکەڵاویی..
ئازایەتیەکی چاوسەوز..
سەفەرێکی تەلیسماویی.
خەونێکی ئاگراوی.. لە هات و چۆدان!
بازەکە سورێکی بە چواردەوری تەنیاییمدا خواردو دیسانەوە وتی:
حەمە رەش.. واتە کێوێکی رەش..
ئەسپی شەوێکی قەترانیی..
زەویەکی بە خەڵووزکراو..
نانێکی رەش داگەڕاوی بن رەشماڵی سوتەمەڕۆی ئازار و
یان قەدی دارگوێزێکی رەشەبا بەزێن.
یان گەواڵە هەورێکی رەشی ئاوس بە کوڕو کچی باران.
یاخود لە شەوەزەنگدا بریسکە بریسکی
دوو چاوی بەورێکی بڕۆنزیی!.
سەرەتا هاتنە ناوئەم دۆزەخی داستانو ئەوینەی پێشمەرگایەتی
سەرەتا یەکەمین سەفەری ئەم برینە جێ بە خۆنەگرە.
بەرەو گەردوگوڵی بەیانی کوردایەتی و خۆبەخاچدا داکوتان
لە ساڵانی زووترەوە
بازرەقەی بەستبوو، ئەمەیش سەربوردو بەیتێکی برایمۆك ئاسای
عەشق و سووتانی خۆی هەیە:

ئەوەتا لاوێکی وەك تاژان باریکەلەو
وەك هەناری گوڵکردوو و خوێن گەرم و
وەك کەڵی سەر رەوەز، زیت و چاو بگێڕ،
وەك هاژە هاژی سیروان بێ ئارام،
عەشقی خاك، دار، بەرد، تفەنگو چارەنووسی خوێنی خۆی
داوەتە دەست کوردستان و بەستەیەك توێشووی نانی رەشی
بەستۆتە پشت و هەوراز و نشێو ئەکاو
دەروێش ئاسا دەرگای یەك بەیەکی
بارەگاو مەقەڕو مەڵبەندەکانی ئەقڵێشێنێتەوە و
داوا ئەکات و هاوار ئەکات و ئەیەوێ بێ بە "پ.م" و
ئەیەوێ شالاو بۆ مەرگ بەرێو چنگ بنێتە
چنگی دەڵە دێوی بەعسییانو
کلك و گوێی بڕڕاوی ئەوان بۆ کەلارو
باوەشاسوار و دووزو خانەقین بەرێتەوە،
بەلاَم هەموو جار،
دەستی نەء بە رووی ئەم سۆراخە شەیدایەیەوە ئەنراو
ئەگەڕایەوە دواوە:
سەرەتا بوو، ئەم فیشەکە بێ تفەنگ بوو
ئەم پشکۆیە بێ کوانوو بوو
ئەم پرسیارە بێ وەلاَم بوو
ئەم جوانووە بێ رەوگە بوو
بەلاَم ئاخر چۆن

سیامەند لە عەشقی خەج بێزار ئەبێ
قولنگ لە کونکردنی بێستون و
فەرخ لە بالای پەری خان و
یان گەرمییان لە سوورەهەتاو وەڕس ئەبێ؟
سۆراخی ئەم بەردەوام بوو هەروەکوو لاس سووڕی ئەخوارد
وەك چکە چکی دلۆپە ئاوی ئەشکەوت و دەراڵەکان
پرسی ئەم وشکی نەئەکرد،
بەرد کونکەربوو.
هەتاکوو سەنگەر وەریگرت
هەتاکوو چەك شانی ماچکردوو
تا رەوە ئەسپ تێکەڵ بە حیلەی خۆیان کرد.
وائێستە "حەمەڕەش" و رەوە ئەسپ بوو بە ڕیزە مەشخەلانێ‌و
ئەچنە چاوی دێوو درنجی بەعسییانەوە.
وائێستە حەمەرەش بووە
بە تەندوورەی گەردەلوولێکی گەرمییان
لەهەر کوێیەك سەربازی مردنی لێبێ
ئەم لەوێیە.
لەهەر کوێیەك گوڵ بکوژرێ ئاو بکوژرێ هەتاو شەماڵ سەرببڕێن
ئەم دەستی تۆڵەی لەوێیە.
کوێستان بەقەد کلووی بەفر ئەم حەمە رەشەی خۆش ئەوێ.
گەرمەسێریش بەقەد شنەی شەوانی هاوینان و
سۆزەکانی ئەڵلاوەیسی خۆشی ئەوێ.

**ئەزموونی تاڵ فێرگەی ئەون.**

**بست بە بستی ئازارەکان ئەناسێت و ئاشنایانە**

**وەکوو خوشك و براو ئامۆزاو بن ئامۆزای خۆی**

**هەر لە دوورڕا یەکە یەکەی درەختەکان**

**ناو نووس ئەکاو**

**دەرگای ماڵ و پەنجەرەی خولیای مەزراکان ئەناسێتەوە.**

**نەخشەی گەرمییان بەری دەستێتی.**

**وەك تاڵە مووەکانی ریشی قامیشەڵان**

**مێرگەکان و لاڕێو بن دەوەن و باخەکان ئەناسێت و**

**لەگەڵیاندا ئەدوێ و ئەبنە پەناگەی**

**شەوانی ئەشکەنجە قاڵی کردووە**

**ئەم دەرچووی قوتابخانەکانی ستەم دیدەیی خەڵکە**

**هەندێ جار ئەم سەر لەرێگە و مانگە شەو تێك ئەدات**

**هەندێ جار ئەم توونی بابا لە نێو هەناوی خۆیدا ون ئەکات.**

**بۆ یەکەمجار لە سەر دەستی ئەم بەورە ڕەشەماندا بوو**

**تەلیسم و ترسی رەبایەی بەعس شکاو**

**خۆیکرد بە ناو تەڵە بەندەکانی مەرگداو**

**گەیشتە سەر سەری نەهەنگ..**

**کارەسات گەورەو گەورەتر بوو هەڵەبجە بوو**

**بە هەموو کوردستان و**

**هەناسەیشی بە هەناسەی هەمووومان**

**ژیان تاریك و تاریکتر بوو**

دۆڵپای ئەنفال هات

ئاخ گەرمە سێرەکەم!

ئەی ئەو ئاسکەسوورەی لە هەموو جارێکی کۆست کەوتندا

بەر لە هەمووومان لەشت نێزەڕێژ ئەکرێ و

بەردەوام هەموو جارێکیش لە هەر پشوودانێکدا

دوای هەمووومان خوێنت ئەگیرسێتەوە.

ئاخ گەرمە سێرەکەم. ئاخ

تۆ یەکەمین چاوی بە فرمێسکمانی و

دوا زەردەخەنەی دەم ولێومان.

دۆڵپای ئەمەویەکان هات

دۆڵپای ئەنفال هات..

ئیتر لەگەڵایەکەوە بۆ ساوایەك

لە بنچکێکەوە بۆ چۆلەکەیەك

لە خەڕکە بەردێکەوە بۆ جۆگەلەیەك

لە کارژۆڵەیەکەوە بۆ کانییەك

کەوتنە بەر تاعوونی بەعسییان

دۆڵپای ئەنفال هات

بوو بە تارو مار

دژوار بوو دژوار بوو دژوار!

کینەی شمشێری تەتەرەکان،

خۆشەویستییان ئەنجن ئەنجن ئەکردو

وا هاتبوون نیشتمان لەبندا ببڕنەوە،

وا هاتبوون مێژوومان
ریشەکێش بکەن و
سیمامان بسڕنەوە.
وا هاتبوون دوا ئەستێرەمان کوێر بکەن و
دوا ئەسپیشمان بخەسێنن.
تارو مار بوو تارومار
دووکەڵ بوو دووکەڵ بوو دووکەڵ.
چاوی خواوەندیش پڕبوو لەئاو
ئاسن قریشکانی و نەرم بۆوە
ئازایەتیی چوڕچوڕەیەکی کەمی لێمایەوە.
وەك ڕێچکەکانی بەردەم شارە مێروولەیەك
وەك ئەو ڕێچکانە زیل زیل ریزبوون و بەرەو قاقڕی مردن
بەرەو گەردەلوولی مردن بردیانین..
چاڵ.. چاڵ.. چاڵ
لەیەك گۆڕداو هەزار دایك و باوکم، هەزار عەشقم
لەیەك گۆڕداو
هەزاران کوڕو کچم..
هەزاران چرام لەیەك گۆڕداو
گوندێکم بە ئاسانی جێگەیان ئەبۆوە
تارومار بوو. تارومار
لەو ساتەدا بۆ سەدو هەشتا هەزار ئاوات و
خەونی زەردو سووری زیندەبەچاڵ کراو،

بۆ سەدو هەشتا هەزار باڵای هەڵوەریو
بۆ سەدو هەشتا هەزار باخی خنكاو
یەهودا گریا
مەرگەوەڕ گریا
هیتلەریش گریاو
لەو ساتەدا هەر صدام بوو پێئەكەنی!
ئا لەو دەمە دۆزەخینەدا. حەمە ڕەش،
حەمەرەشی كوڕی زیزانەی كوڕی سەر قەڵای
كوڕی دووزی كوڕی حەمرین
لانەی ئازارەكانی چۆڵ نەكرد.
نەڕۆیشت و خەیاڵی گەرمییانی نەبردە ئێران و تووران.
دەستی لە كەمەری كفری بەرنەدا.
وەك سیروان مایەوە، وەك كەركوك ئەسووتا
وەك قەڵای شیروانە لەوێ بوو
لەو دەمەدا، ئەو بۆ شیعری دەست و پل گۆنەكردوی ئێمە
گڕەی نیوەڕوانی "هەكز" بوو
بۆ ورەیش
حەمە ڕەش
ئەم دەستی زمناكۆو
ئەو دەستی بەمۆ بوو
* * *
هەتا ئێستەیش لە دوو ئاوەندا كە دوو ماسی ڕەش

ئەگەنەیەك و رۆژگاری ئەنفال باس ئەكەن
دوو ئاخی پڕ بە سینەی شەپۆل
بۆ حەمە رەش هەڵئەكێشن.
دوو گردی دڵداریش كە سەر ئەنێن بە سەری یەكەوە
باسی هەنگاوەكانی حەمە رەش بۆیەك ئەكەن.
دوو درەختیش كە پێكەوە هەڵئەپەڕن
یادێكی دەستەكانی ئەو هەر ئەكەنەوە.
ئێوە گوێتان لێ نەبووە
من شیعرم گوێچكەی زۆر سووكە
هەموو جارێ كە زمناكۆ
سوێند بۆ گەرمەسێرم ئەخوا
ئەڵێ: بە سەری حەمە رەش!
٭ ٭ ٭
ئەی بەوری رەش! ئەی هەڵمەتی بەردەوامی گەرمییانم،
لە ترسناكترین ساتەوەختی وجودماندا
تۆ قاچت رەگی خاك و
سەرت پژوپۆی بێشەكانمان و
هەردوو چاویشت دوو گۆمەكەی
دەربەندی دوكانمانن.
٭ ٭ ٭
لێرە بەدواوە حەمە رەش وتی شیعرم ئەوێ:
من داوای دوو گوڵم

لە داری ژاڵە کرد
بۆ سنگی حەمە رەش
کەچی دار لە رەگ و ریشەوە
خۆی لە عەرد هەڵکێشاو
بە پێی خۆی لە گەڵما هات بۆ لای چاوانی حەمە رەش.
بە " با " م وت مەهێڵە
ئەو مانگە بچێتە هەورەوە
من ئەم شەو لە دووزدا
بۆ بالآی حەمە رەش
تریفەم لێت ئەوێو خەرمانە
بیکەمە بەرزامی حەمە رەش
"با " وتی:
تۆیش نەیلێی
مانگ خۆی دێ و
ئەو زامە رەشتاڵە ئەگرێتە باوەشی.
کۆترێکم نارده لای کوڵەجۆ
خوازبێنی وەنەوشەی کیژێکم بۆ بکاو
بیهێنین بۆ کوڕی زیزانەی..حەمە رەش
کە لەوسەر هاتەوە پێی وتم:
تەماشا تا چاوی بڕینی ئەو بەورە بڕ ئەکا
بە گوڵجاڕ وەنەوشەی هەر هەموو پێڵۆمان
بە گوڵجاڕ هەڵاڵە

به گوڵجاڕ نازەنین
بەڕێوەن بۆ ئەوەی ماچیکەن
بۆ ئەوەی بە ئەوین دایپۆشن
گەرمێنی ئەو لەشەی حەمە رەش.

* * *

هەر گابەردی نێو دەربەندێ
وتی: لێرەم
خۆ بەردە قارەمان نییە.
هەرچی گوڵێ کە سوور چۆوە
خۆ گوڵەکەی پەریخان و عوممان نییە.
هەر کەسێ قوڵنگ بەدەس بوو فەرهاد نییە.
خۆ هەرکەسێ باریکەلەو چەك لە شان و یان ریشدار بوو
مامە ریشەی داستان نییە.
هەر کەسێکیش ناوی حەمە و حەمە ڕەش و گەرمیانی بوو
حەمە رەشی پێش ئەنفال و ناو ئەنفال و دوای ئەنفال و
ئەسپەرەشی سەر حەمرین و
گێژەڵووکەی خوێن هەڵکردووی جەرگەی دووزو
حیکایەتی کێوی رەش و
باوبۆرانی زەمان نییە

* * *

ئەو چریکانە زۆر کەمن
دار بە داری دارستانێ داچڵەکێنن و

سەر سامیکەن.. وەك حەمە رەش.
ئەو عاشقانەی زۆر کەمن
چۆك بە بێستون دابدەن و
هەر بەئەوین دیواری مردن کون بکەن
وەك حەمە رەش.
گەرمەسێر.. گەرمەسێر
دەفتەری خۆڵینی شیعرمەو
ئەی باڵای زیوینی راپەڕین تۆیش قەڵەم.
دڵنیام ئەمجارە من شیعرێ ئەنووسم
بە قەدەر حەمە رەش ئازابێ و
بە قەدەر سیروانیش کەڵەگەت

★ ★ ★

هەموو ساڵێ
بۆ یانزەی سێ
یانزە کەڕەت هەناسەی خۆم
بە رێگەوبانی سکڵدا ئەخەمە رێ
ئەم هەناسەیە پڕێتی لە تنۆکە شیعری کەسك و
لێوان لێوە لە "با " ی مۆرو لە "با " ی شین و
لێوان لێوە لە عەشقی ئاڵ و
لە چاوی گەشی منداڵ..
ئەم هەناسەیە.. سترانە.. سترانی دەشت
سترانی شاخ.. ئەم هەناسەیە هەڵئەفڕێو

له هیچ شوێنێ لانادات و
تا لەسەر دووز رائەوەستێ و
یانزە جارێ ئەگرمێنێو، ، ئینجا ئیتر
بەسەر گوڵجاڕە رەشەکەی.. جەستەی ماندووی
حەمە رەشدا دائەڕژێ.

* * *

هەموو ساڵێ بۆ یانزەی سێ
گۆمی دەربەند یانزە کەڕەت خۆی هەڵئەبڕێ
بۆ لاشانێ ماچی بکات
چونکە بۆنی گوڵی پەنجەی
حەمەی لێدێ.
هەمو ساڵێ بۆ یانزەی سێ
شاخی بەمۆ یانزە کەڕەت دائەنەوێ
بۆ بنارێ..بۆ بەرکاوێ..ماچی بکات
چونکە بۆنی کاسکێتەکەی دوای ئەنفالی
حەمەی لێدێ.
هەموو ساڵێ بۆ یانزەی سێ
یانزە کەژمان..لەسەرەوە بۆ خوارەوە
سەفەر ئەکەن
یانزە باخمان..
لە هەڵگوردو سەفینەوە دێنە خوارێ
هەر بۆئەوەی سەرێك بدەن

لەدوا برینی حەمە رەش.
هەموو ساڵێ بۆ یانزەی سێ..دوای ئێوارە
یانزە منداڵ، لە شۆڕیجەو رەحیم ئاوای کەرکوکەوە
یانزە چرای بچکۆلانە ئەکەن بەملی خۆیاندا
رائەکەن و دائەگیرسێن...
ئەم پەپولەی چرایانە یانزە کەرەت
بە چوار دەوری سەری دووزدا سوورئەخۆن و
ئەوسا هەر یانزە چراکە
لە پەڵە خوێنێکی
هێشتا ورشەدارو هێشتا تەڕدا
دائەنێن و ئینجا ئەڕۆن.
هەموو ساڵێ بۆ یانزەی سێ یانزە کۆتری بێوەژن
یانزە چۆلەکەی بێ باوك.. یانزە هەنیسك.. یانزە فرمێسك
یانزە گوڵەجۆی مەندەلی، یانزە خاڵی کوتراوی سەر گۆنای گەرمێن.
هەر هەموویان ریز ئەبەستن بۆ زیارەت
زیارەتی قسنی بەژنی عاشقێکی
وەکوو زمناکۆ کەڵەگەت.
هەموو ساڵێ لە یانزەی سێدا من ئەبم
بەشمشاڵێ، جەبەل حەمرین ئەمنێ بەلێوی خۆیەوەو
لێم ئەدات و لە کونەبای جەستەمەوە
یانزە مەقام..یانزە بولبولی برین و
یانزە قاسپە دێنە دەرێ..

هەموو ساڵێ لە یانزەی سێدا من ئەبم
بە دەفتەری ڕەسمی کچە کەلارییەك
یانزە پەڕەم
کچەکە دێو بە خەڵووزی شەوی ئەنفال.
یانزە کەڕەت
وێنەی سەری یانزە پیاو و
وێنەی هەوری یانزە زامم تیا ئەکێشێ
هەورەکان هەموو یەك هەورن
پیاوەکان هەموو یەك پیاون و
هەر هەموویان حەمە ڕەشن!.
هەموو ساڵێ لەیانزەی سێدا شاعیر نیم بەڵکو شیعرم، شیعر خۆیم
گەرمییان دێو ئەو شاعیرەو
بەپەنجەی دووز
بە برووسکەی حەمە ڕەش و..
بەڕێژنەی یادەکانی
بە خۆشەویستیی حەمە ڕەش..
یانزە کەڕەت
لەگڕەدا.. من ئەنووسێ و
یانزە کەڕەت.. لەسەر بەفر.. تۆ ئەنووسێ و
یانزە کەڕەت.. لە رووباردا.. ئەو ئەنووسێ و
لەدواییدا.. منی شیعر.. ئاوی عەشقم
زیاد ئەکات و سەرئەکات و

ئەم وڵاتە بەهاژە هاژی نەمریی و

خۆشەویستی حەمە رەشم..دائەپۆشێ!.

# له ڤیەنناوە بۆ کوردستان و
# درەوشانەوەی ئەستێرەیەکی سوور!

1993

ئەودەمە، ئالوزو ژانی دوورە ولاّتیی و تاسانەی غەریبی خەوی
له چاوانی لەبوولێڵچووی من بڕیبوو!.. تەنها هاودەمو هاوڕازو
هاوگینگڵم، شیعربوو بۆ دڵ نەوایی و
هێورکردنەوەی شەپۆله بەپێلەکانی
ئەم زەریای خەمە، شیعر ئەبووە: هەتاوی ئارام و
هەتوانی زامی ئەستێرەی وشەم و لەگەڵ خۆمدا،
لەگەڵ هەردوو گلێنەمدا
شاربەشارو ولاّت بەولاّتی هەندەران ئەمگێڕا.. یان بۆ
نەڵێم: ئەو منی ئەگێڕاو،ئەو منی کردبووە خەرمانەی
دەوری خۆی..
دە سلاّو ئەی مانگی شیعرو..
ئەی خەرمانەی بە بەرەکەتی زمانی کوردیی!
ئێوەیش ڕۆژتان باش و شەوتان باش
ئەی کوردە ئاوارەکانی ئەم سەر زەمینە!.
لەپەنجەرەی وا گۆنی شەمەندەفەرەکەوە
نیگام تینووی ئاو له سەرنجی

ئەو کەژو دۆڵ و چیاو لێرەوارو ڕەوەزو هەڵەمووتانە بوو
کە بەسەوزیی خۆیان، بەسەوزیی‌ئاوی چاوبەری وڵاتی نەمسا،
وڵاتی گوڵ و هونەر، بارانە شیعریان بەسەردا ئەباراندم.
لەگۆمی زیوینی خەیاڵیان هەڵئەکێشامو هێدی هێدی ئەیانبردمەوە
بۆ نێو لانکەکەی کوردستان..لەپڕ"ڤیەننا "جریواندی،
شانو ملی مەڕمەڕینی ئەم پایتەختە ناسكو قشتیلانەیە دەرکەوت.
شەمەندەفەرەکەیش، هێواش هێواش دەمارە گرژەکانی پێشووی خاوبۆوەو
لە وێستگەی گەورەی ڤیەننادا لەچاو تروکانێکدا
وەك دای چەقێنن، ڕێك وەستا! وا منو شیعر پێکەوە دائەبەزین،
ئەوکاتەی سەرم هەڵبڕی. خۆم لەبەردەم
پوورە هەنگێکی خۆشەویستاندا،
لەبەردەم چەند چەپکێ لەیاران و هاوڕێیاندا بینیەوە!
یەکێك لەو گوڵە هێرۆیانەی هەر زوو بەرامبەرم پێکەنی و
باوەشی پڕ لە گوڵاوی خۆی پێدا کردم..
کاکە فازیلی مەلا مەحمود بوو
لەنێو هەموویشیاندا بە تەنها هەر ئەو بەرگی کوردیی پۆشیبوو،
بەرلەوەی بدوێین، بەچاو پێی وتم
"دوای ئەم دابڕانە نەفرەتیە دوورودرێژە، ئەم پێك گەیشتنەوەیە،
ئەم بەدیدارشادبوونەوەیە،گوڵ و زەماوەندو خۆگۆڕینی ئەوێ".
ئەوساتە قوڵە قوڵی پێکەنینی بوو.
کە لێی وردبوومەوە..هەستم کرد تەشوێی زەمان ئەوەندە کاری
لەم ڕەوەزە جوانە نەکردوە

قژ هەروەکو خۆی رەش رەش، پێستی بێ گرێو رێڕێ نەبوو،
هەمان گۆشە نیگاو سەرنجی بەر لە حەڤدە ساڵ
زیاتر،لەش مامزی، سووك و گورج و بێ فیزو
ساکاریش وەك گوڵەکێویی وتم: کاکە فازل! هەر وەکوو خۆتی
پێکەنیو لەگەڵ راوەشاندنی هەردوو دەستیا وتی.. زمانیشی تۆزێ گرتی..
ـ تۆیش هەروەها! هێشتا هەرشاعیری لاوی
بەدەم قاقاوە،،بەدەم هەڵقوڵینی خۆشیەکی رەوانەوە،
دەستمان کردە ملی یەك و وتیەوە!
ــ لەبیرت نەچێ من هەموو کات
عاشقی شیعرەکانتم!
با بەرەو دوا بگەڕێمەوە..سەر بە هەوارەکانی ئەوین و
ماڵی ئاشناو رۆشناو ئازیزاندا بکەمەوە..
لە رەگەوە بەرەو ژوور ببمەوە بۆ لای ئەم گوڵە هێرۆیە.
رەنگە هەر لە تووەکەی ئەلیاسە فۆچەوە
لەسێ دەرییەکەی ماڵی حاجی ئەمینی کاکە حەمەوە،
ئێمەو هەتاوو رەزوو کانیەکانی دێلێژە
وەك دوو باخی پەرژینی بەزیو لق و پۆپ و گەڵاو گوڵ و
هەرێزمان تێکەڵی یەك بووبێ. تا ئەو شوێنە پیرۆزەی
کە دایکم لەهەمان کاتی شیری دایکێکی بەهەشتیی ئەم
بنەماڵەیەی خواردەوەو
ئیتر سەرچاوەکان لەیەك رووباری خۆشەویستیدا یەکیانگرتەوە
لەوێوە ئەم تیرێژە کشاوە.

لەوێوە ئەم مێرگە
بە ئەوین تێرئاوە!
دوای فەراژوو بوون و چاوکردنەوەیش.
هەر لەیەك هێلكەی كۆلآنی گەڕەكێكی ئەم شارەیشدا بوو
لەگەڵ هاوتەمەنەكانی ئەم بنەماڵەیەدا
سەرمان بەیەكەوە جوقاو پێكیشەوە
پەڕووباڵمان دەركردوو
لەسەر درەختی قوتابخانەیەكیش پێكەوە نیشتینەوە!..
لەهەڕەتی جۆش و خرۆشی سیاسیدا..
لەزەمانی شەڕی ساردی ئەم نەوەیەی ئێمەدا..
من و كاك فازل هێلانەمان جیابوو
ئاسۆمان جیابوو
ئەو لەكەلی ئەنتەرناسیونالەوە ئەیخوێندو
منیش لە كەلی ناسیونالیستی بەرامبەرەوە
بۆم ئەسەندەوە.
دوو كەوی نەگونجاو بووین
بەلآم نەگونجاو بۆ ئەوەنا بەدەنووك یەكتر كوێر بكەین.
نەگونجان بۆ ئەوەنا لە خوێنی یەكتردا شەلآڵ بین.
نەء.. نەء..ئێمە گونجاوی نەگونجاو بووین
لەبەردەم نەهەنگەكەی دوژمنیشدا
نەهێنیمان یەك نەهێنی و
خۆشەویستیمان یەك خۆشەویستی و

ماڵیشمان یەك ماڵ بوو.

بیرمە هەر لە سەرەتای حەفتاکاندا بوو. لە سەرودەمێکدا کە شەهید

لە شانە ئاگرینەکانی " قیادەی مەرکەزیدا "

کاری ئەکردو بەشاراوەیی و نەهێنی لە هات و چۆدابوو،

ماڵی ئێمە، دەروازەی دڵنیاییو متمانەی لەسەر پشت بوو بۆئەو.

ئەهات و پێکەوە لە ژوورە بچکۆلەکەمدا بەجووتە دائەنیشتین.

وایش رێککەوتبووین بۆ ئەوەی نەبادا خوانەخواستە

ئاگری نەگونجانی بیروباوەڕی سیاسی هەردووکمان لەرێککەوتێکدا

لەخەرمانی هاوڕیەتیمان بەربێ، وارێك کەوتبووین، هەر بە کەناری

جوانی شیعروئەدەبدا بڕۆینو بەو زمانە خۆمان مەست بکەینو

کۆڕیشمان بەو چل چرایانە بڕازێنینەوە!

شەهید فازل ئاگردانێکی بەکڵپەبوو.

کانێکی زیرەکی و چاوگێکی بزۆزو

روناکبیرێکی سادەو

شیعر دۆستێکی وردبین بوو.

ناو بەناو لە هەندێ روانین و لاکردنەوەدا

چاوەکانی تیل ئەبوون و

لەئاخاوتنیشدا زمانی ئەیگرتو

بەمەیش رۆح شیرینترو

ئێسك سوکتر ئەینواند!

ئەو هەر لە سەردەمێکی زووترەوە چووبووە

ناو بزوتنەوەی قوتابیانو

یەکێك بوو لەقەڵەمە هۆشیاروو وشە راپەڕیوەکانی نێو مەیدانی
خەبات و تێکۆشان..
ئەو لەو تەمەنەدا هەڵکەوتوویەکی
ئەم شاری هەڵمەت و قوربانیە بوو.

٭ ٭ ٭

ساڵ هات و رۆیشت و کوردستان تا ئەهات تاریکتر و..
کارەسات لەدوای کارەسات و خوێن لە دوای خوێن و
سێدارە لە دوای سێدارەو زیندان لە دوای زیندان و
ونبوون لەدوای ونبوون و مەرگی ئازیز لە دوای مەرگی ئازیزو
سەنگەر لە دوای سەنگەر، یاران و عاشقانی ئازادیی
وەك تۆوی گوڵی دەم بایان لێهات و
گۆڕان و وەرچەرخانی فیکری سیاسی
لەم بەندەرەوە بۆ ئەو بەندەرو
شەهیدیش کەوتە ناو ئەم گەرداوانەوەو
تا لەرۆژگارێکی تردا لە دوورگەی
بزووتنەوەیەکی ئیسلامییەوە
چارۆگەو بایەوانەکەی بەدەرکەوتەوە
من بۆ خۆم ئەم وەرچەرخانەم
لەدڵا بوو بوو بە مەراقێکی گەورەی سیاسی و
کۆمەڵایەتی و بە ئاواتەوە بووم رۆژێ
لە رۆژان کاکە فازل ببینمەوەو پێکەوە وەك جاری جاران دابنیشینو
پرسیاری لێ بکەمو بەم سۆراخ کردنەیش

لەوەرچەرخانی تازەی بگەم..

ئێرە ڤیەننایە!

وا پێکەوە شان بەشانی یەك ئەڕۆین و

لەوێستگەی شەمەندەفەرەکە

چووینە دەرەوەو لەئوتومبیلی هاوڕێیەکدا

بەتەنیشت یەکەوە دانیشتین و بەشەقامە ڕەنگاڵەو

بێگەردو بەبریق و باقەکانی ئەم شارە جوانکیلەیەدا

یەك لە دوای یەك تێ ئەپەڕین و ئەوەتا ئێستەیش لە ماڵی

هاوڕێی خانەخوێ پێکەوە دابەزین و چووینە هۆڵە ڕەنگینەکەوە..

لەدەرفەتێکدا هەر دوو بەدوو ماینەوەو پرسیارەکەم لێکرد..

شەهید فازل لەسەرخۆ وتی:

با لە هەموو ڕواڵەتەکان گەڕێین.

گەلێ ڕێگامان تاقیکردەوە..ئەمەیش ڕێگایەکە.

بەلاّم من هەر ڕێگەیەك بگرم بۆ کورد ئەیگرم.

کوردایەتی ئامانجەو چارەنووسیش

هەر لە سەربەخۆیی کوردستاندا ئەبینم.

من ئامادەم لەپێناوی بەرژەوەندی کورددا،هەموو کارێك بکەم،

هەرچیەك بەمەرجێ تروسکایی هیوای بۆ ئەم گەلە هەژارە تێدابێ،

بیرمە هەر لە نێوان قسەکردندا وتی:

" ئەوروپا بێزاری کردووم. ئەمەوێ رزگارم بێ،

تینووم بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە کوردستان.

لەوێ لە گوندەکانی کوردستانداو لەناو ئەو خەڵکە هەژارەدا

بژیم و بمرم و ئەمە هیوامەو دوا خەوبینینمە "
ئێرە ڤیەننایەو
خەو نەهاتە دیو
سەعاتی خوێن چرکە بەچرکەی هەناسەی کورد ئەژمێریو
قاسملوو مانگی سورەو بەدەوریشیا
چەند ئەستێرەیەك خەرمانەی گولاڵەن و
ئەدرەوشێنەوە.
یەکێك لەو ئەستێرانەیش فازلەو
فازیلیش کوڕی شاری "مامە یارە"و
" بەردە قارەمان"ەو قوربانییەکی گەورەی
ئاشتی و ئازادیی و سومبولێکی دیکەی لەخۆبوردن و
شەهیدێکی تری رووناکییە!
دوژمنانی رووناکیی..
نەیارانی گوڵ و کانی و نانی هەژاران
چەقۆکانی تاریکیی و توندڕەوە تیرۆریستەکان
چەند دەمانچەیەکی مێژووی شەلاڵی خوێن و
مەرگی دەمامکدار
لەناو سینەی ڤیەننادا
دەستیان گەیشتە گەردنە بەرزەکانی
قاسملوو فازل و هاوڕێکانیان و
لەژوورێکدا ئەو چرایانەیان کوژاندەوە..
ئەو هەتاوانەیان هەڵوەران.

**بەلاّم ئەی چی لە چراخانی دیرۆکێك ئەکەن؟!**

**چی لەگەردنی شاهۆو پیرەمەگرون و ملیۆنان ئەکەن؟!**

**ئەم چارەنووسی ئازادی و راماڵینی ئەژدەهاکانە**

**لەتەوێڵی شاخ و باسکی کەژ و**

**سەرسنگی ئەم نەخشە گوڵ گوڵییە نووسراوەو**

**تێکەڵ بەزێی سروودو راپەڕینمان بووە..**

**تۆیش ئەی هاوڕێم!**

**ئەی هاوڕێی دوا وتەو دوا کۆڕو**

**دوا هەناسەی "مانگ" ێکی کوژراوی کوردان.**

**ئەی ئەستێرە سوورەکەو**

**ئەی داربەلاّلووکە ئاڵەکەی ناو دڵی "دێلێژە" و**

**ئەی گوڵە هێرۆکەی شیعرو یادگارم!..**

**چی لەوە گەورەترە ئاوێتەی خۆشەویستی**

**ئەم کوردستانە بی و**

**چی لەوەیش پیرۆزترە بە مردنێ بمریو**

**سەرت لە لووتکەیەکدا بپژێ**

**کە لوتکەی مەشخەلاّن و**

**لوتکەی باران و دوندی هەڵۆکان و**

**جیهانی نەمریی بێ**

**هاوڕێکەم!**

هەولێر
1993/ 7 / 11

# " سەردار"ی بەور

1993

بەژنی ئازادیی هەر لە ئاوێنەی خوێنی شەهیداندا
دەرئەکەوێ و شەوق ئەداتەوە..
مێژووی ئێمە بێ ئەو قوربانییانە
لە درەختێکی بێ گەڵاو لق و پۆپ ئەچێ!.
ئەگەر ئەو هەورانە نەبوونایە
بارانی مزگێنیمان نەئەبینی و
خۆشەویستی و سەربەستی
باوەشیان بە مل کێوەکانماندا نەئەکرد!..
شەهیدان:چارەنووسی خاك دیاریی ئەکەن و
زوڵاڵترین دەنگی حەقن و
لەگوێی رووباروو
لەگوێی دارو بەردوو
لەگوێی پاشەڕۆژیشدا ئەزرنگێنەوە.
هەر شەهید لە "قەڵا" گەورەتروو
لەمنارەی چۆلی بەرزتروو
لە سەفین خۆشەویسترە..

رۆژانێ بوو.. مەرگ شارو شار مەرگ بوو..
رۆژانێ بوو. ئەم هەوارە هەواری مارو مێروو بوو..
هەواری ترس و سێدارە
هەواری جانەوەران و
هەواری خۆڵەمێش و ولاّتی پەپوو بوو.
لەو رۆژانەدا لەنێو بەورە دەگمەنەکانیشدا
بەورێ هەبوو قژ رەش و چاو رەش
مل کەل و گیانی لە پشکۆ گەرمتر
ئەم بەورە ناوی "سەردار " بوو
لە ئاگردانی هەولێردا لەدایك بوو بوو.
لە تاریکستاندا چاوی پشکوتوو بوو.
لەناو زریاندا پێی گرتبوو
لە ئازاردا بالآی کردبوو.
ئەو دەمەی شاخ زەنگی مەترسیی لێدا..
ئەو وەرزەی دارستان ڤیژاندی و
ئەو وەختەی شەقام بوو بە تابووتی هەتاوو
ئەو رۆژەی گولاّڵە زەرد هەلگەڕاو
تاڤگە تینووی بوو..
"سەردار" ی بەور لەسەر هەڵەمووتێکی ئەم ولاّتە راوەستابوو
سەرنجی لە مەرگی خۆی و
سەرنجی لە ژیانی ساواکانمان ئەدا.
لەو خەمە بەرزەوە

ئەیرِوانییە پێدەشتەکانی هیوامان و
لە مێژووی بریندارمان وردئەبۆوە.
شۆڕشی نوێ
شۆڕشی قوربانیە نوێیەکان بوو
شۆڕشی دەغڵی سووتاوو دووکەڵی جەستەمان بوو
راچڵەکینی مێژوویەکی تر بوو
هۆرەی زام و
لاوك و حەیرانی قەنارەکانمان و شایی مەرگمان بوو.
سەرداری بەور هەر زوو
خۆی گەیاندە شای ورە و
بوو بە هاودەمی تفەنگ و
هاورێی فیشەك و
هاوڕازی تەلان و بەرد بە بەردی
کێوان و بەرایی پێدەشت و
بوو بە خۆشەویستی هەژاران و
دڵداری شەهیدان.
ئەوەی لە هەمووومان چاکتر ئەم بەورە ئەناسێ
سەفین و پیرمام و سەری رەش و
شەقام بە شەقام و
کۆڵان بە کۆڵانی گیانی هەولێرە..
ئەوانەی لە هەمووومان باشتر ئەم بەورەیان ئەناسی
ترس ولەرزی شەوانی دوژمنان و

چەکمە لەپێیەکانی بەعس و
گورگە کلاوڕەشەکانی ئەوان بوون.
"سەردار "بەفرێکی کڵپە کردوو بوو.
"سەردار " رووبارێکی ژیان و عاشقێکی
سەوداسەری ئازادیی بوو.
ئەو لە تاریکستانێکدا بوو بەبلێسە
کە تاریکی خۆی لە خۆی ئەسڵەمیەوە.
ئەو لە بێ هیواییەکدا بوو بە هیوا
کە نائومێدیش خۆی لە خۆی وەڕس بوو.
"سەردار "بەلێنی تیژڕەوی "با"و
سوێندی بۆ دواوە نەگەڕاوەی چەم و
هاواری گوڵ گرتووی منداڵانی شەهیدانمان بوو.
تیشك بوو خۆی ئەکرد بە شاردا
لە کاتێکدا شار چاو چاو تیا نەبین بوو.
لە کاتێکدا شار تۆڕێکی گەورەی مردن بوو.
زریان بوو خۆی ئەکرد بە شاردا
لە کاتێکدا "قەلاً " لە ناو چنگی نەهەنگەکاندا
وەك کەوێکی کەسیرە وابوو.
ئەو دڕی بەمردنداو
دڕی بە نائومێدیی داو
دڕی بە ژێردەستی داو
بوو بە مژدەی باران و

مژدەی هەتاوو
لە کازیوەی سنگیەوە
شەبەقی داو رووناکی کردینەوە
"سەردار " ی بەور
ئەیویست لە هەموو هەڵمەتێکدا
لە چنگ نانەچنگی یەکەمدا بێ..
هیچ بەورێکی تر پێش ئەو نەکەوێ و هیچ پڵنگێکی تر
بەر لەو ئامبازی بەعسییان نەبێ..
کام گەرداو تووش بوو ئەو خۆی لێئەدا.
کام رکە دژوار بوو ئەو پیا هەڵئەزنا
کام شەوگار تاریکتر بوو ئەو ئەیکرد بە قەلاَ
لە چەقی رێگەو
لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکانداو
لە سیلەی گەڕەکەکاندا
لە ناکاوێکدا وەك برووسکە دەرئەپەڕی و
جەستەی دوژمنانی ئەکرد بە زوخاڵ!.
هەر بۆیەش ئەمڕۆ
"سەردار " ی بەور..بۆتە نەخشی ناودڵ و
کزەی دەروونی هەموومان.
بۆتە وێنەی هەمیشە لە پێش چاوی
سەر دیواری ژوورەکانمان و
باڵندەیەکی سووری سەر لق و پۆپی

درەختی حەوشەی ماڵەکانمان و
ئەسپێکی ئەرخەوانی ناو خەونی منداڵەکانمان.
"سەرداری سەعید سۆفی "
قەڵایە و
"پیرمام "ەو
سەفینەو
لەپێش چاو ون نابێ!

# لانەکان یەك ئەگرنەوە

1993

یەك سەرچاوەو رووبارێك و چەندین جۆگە.
کێوێك و دەربەندێك و چەندین رەوەز.
ئاسمانێك و ئاسۆیەك و چەندین باڵندەی ڕەنگاوڕەنگ.
زەمینێك و باخچەیەك و چەندین پەرژین..
جۆگەکان ئەڕژێنەوە رووبارەکە
رەوەزەکان دەست ئەدەنەوە دەست دەربەندو
مەلەکان هەریەك ئاسۆ ئەکەنەوە بەهێلانەو
پەرژینەکان خۆیان لائەدەن و ئەچنە ناو باخچەکە..
هەموو گوڵەکان خۆیان
ئەکەنەوە بەیەك چەپك و
ئەچنەوە ناو گوڵدانە گەورەکە..
هەموو زەنگەکان ئەبنەوە بە یەك زەنگ
بۆ یەك سروودی خۆشەویستی
بۆ یەك کاروانی ئازادیی..
هەموو تاوڵە دابڕاوەکان

ئەچنەوە ناو یەك هۆبەی دیموكراتیی
گەروەكانمان ئەبنەوە بە یەك گەروو
بەشمشاڵێك و بەباڵەبانێك و
بۆ ئازادیمان ئەخوێنن..
ئەمە جەژنی.. زامە هەرە قوڵ و هەرە ماندوو
و هەرە سوورەكانی كوردستانە..
ئەمە جەژنی. یەكبوونی ئەو داربەڕوانەیە كە
رەگەكانیان بە پشتی مێژوویەكی بەردەڵاندا چۆتەخوارەوەو..
لەدۆزەخدا سەریان هەڵدا..
ئیمرۆ جەژنی ئەو ماڵە سەوزەیە؟
ـ كە بەر لە حەڤدە ساڵ و لەتاریكستانی دوای نوشوستی دا
ئەو وەختەی مۆمێك نەبوو
ئەمان ملی خۆیان كرد، بەیەكەم مۆم
ئەو وەختەی تاقە ئەسپێك نەبوو
تاقە سوارێك نەبوو
تاقە دەنگێك نەبوو..
ئەمان ورەیان كرد بە یەكەم ئەسپ و
باوەڕیان كرد بەیەكەم سواری ئاوزەنگی ئەڤین و
دەنگیشیان كرد بەیەكەم زریان.
ئەمە ئاهەنگی ئەو ماڵە خوێناوییەیە.
كە دوابەدوای ئاوی رەشی نوشوستی و
هەڵدێرانی مێژوویەك

یەکەمین چرای خوێنیان هەڵکرد..
یەکەمین سێدارەیان خستە گریان و
لە "قەندیل"ی بەستەڵەك و دیرۆکی سەهۆڵبەندانداا
رسکان و بوون بەیەکەم
ئەستێرەی ناو بەفرو
یەکەم تروسکەی شۆڕشی نوێ.
بوون بەیەکەم چەخماخەی دەستڕێژی
ئەو هەڵۆ سورانەی لە پایتەختی ئەژدیهادا
بۆ یەکەم جار مێردەزمەی ترسی بەعسیانیان
کوشت و بۆ یەکەم جار
گوڵی خوێنی خۆیان دا لە بەرۆکی شارەکانی
سلێمانی و کەرکوك و هەولێرو
زنەی هیوایان لە گیانی وشك بووی
ئەم خەڵکەدا هەڵقولاَنەوەو
بوون بە قیبلەنما.
لە بیرتان بێ، بالاَی بەرزی ئیمڕۆ
بەبالاَی بەرزی دوێنێوە بالاَیەو
ئالاَیەو پاشەڕۆژ.
لە بیرتان بێ زەماوەندی ئەمڕۆ
لەکام دۆزەخی ئازاری دوێنێمانەوە تاوی سەندووە
ئەمە ئاهەنگی ئەو ماڵە سەوزەیە
کە نیوەی کوڕەکانیان ئێستاکە لە گردی شەهیدان و

له سەیوانەکانی سەر تاسەری ئەم خاکەوە..
وەك گوڵەبەڕۆژە روواون، لێرەن و
تەماشامان ئەکەن!
ئەمە ئاهەنگی شەهاب و مامەڕیشەیە
ئاهەنگی علی هەژارو کاردۆ گەلاڵێیە
ئەمە جەژنی یەکگرتنەوەی قەنارەکانمان و
مەتەرێزەکانمان و قەڵەمەکانمان و
یەکگرتنەوەی عارەقی رەنجی بەزەنگوڵ زەنگۆڵی
سالآنی دووکەڵ و سالآنی ئەنفال و
سالآنی گوڵ و خۆڵەمێشمانە
ئەمە زەماوەندی ئەو پێشمەرگانەیە..
کە بۆ یەکەم جار سەردەق شکێن و مەرگ بەزێنی ناو
مەملەکەتی رەشی بەعس بوون.
بۆ یەکەم جار بەدرێژایی چەندین سەدە..
خۆیان کرد بەدڵی کەرکوکداو
بەر لە هەمووان تەوێڵی خانەقین و دووز و
باوەشاسواریان ماچ کردووە، بۆیە ئەمجاریش
شاخی "حەمرین " یان.
بەخوێنی چەندین هەڵۆی وەك حەمە رەش
لە ئازادیی مارەکرد
لەدوای هەموانیشەوە باسی خۆیانکرد!
ئەمە ئاهەنگی ئازاد هەورامی و ئارامە

ئەمە جەژنی ئیبراهیم عەزۆیە..
ئەمە کەرنەڤاڵی هەموو دووا ئاواتەکانی خوێنی شارو
خوێنی شاخیانە..
لەو خوێنەی لە پێشبڕکێی ئازادیدا
لە پێشبڕکێی بەزاندنی سێدارەدا
لە پێشبڕکێی بەزاندنی زیندانەکاندا
لە پێشبڕکێی قەڵەمی نەترس و وشەی راپەڕیودا
سەردەستەی خوێنەکانی تر بوون و
لە ریزی یەکەمی هەڵوەریندا بوون بۆ گەشانەوەی
ئەم رۆژە..
ئەمە ئەو شاییە رەنگینەیە
ئەو مزگێنییە سپییەیە.
ئەو زەماوەندە گەورەیەیە
کە زۆرترین ژمارەی شەهیدانمان دەستیان تیا گرتوەو
لەگەڵماندا هەڵ ئەپەڕن و
لەگەڵماندا گۆرانیی بۆ ئازادی و
دیموکراتی و یەکێتی و تەباییمان ئەڵێن
ئەگەر ئەو زامانە گەشاوەترین زام نەبوون بۆنیان مەکەن!
ئەگەر ئاوێنەکانی دوێنێی قەندیل و دوێنێی کەرکوك و
دوێنێی دابانودوێنێی کەتوو،سەفین و شەقڵاوەو سەری رەش
بێگەردترین ئاوێنە نەبوون بیانشکێنن..
لەسەر ئەم شانۆی دیموکراتی یە.

بالأمان بالأی پیرەمەگرونە.
ئێمە پڕ بە دەنگی حەقیقەتی خوێن و حەقیقەتی فیکر و
حەقیقەتی مێژوومان قسە ئەکەین..
ئازادیی مەزنە.
بەلأم بە یەکبوونەوە مەزنترە
کوردستان خۆشەویستە
بەلأم بە یەکێتییەوە خۆشەویسترە..
ئەم رووبارە بە خوڕەو بە هاژەو بە بڕشتەیش
بە تێکەلأوبوونی ئەو جۆگە روون و پاکانەوە
بە خوڕترو بە هاژە ترو بەبڕشت ترە.
لانەکان یەك ئەگرنەوە..
دیوارەکانی لێك دابڕان هەرەس دێنن.
تفەنگەکان ئەچنەوە یەك مەشجەب و
قەلەمەکان ئەچنەوە یەك چاپخانە و
چراکان لە یەك رێگەدا کۆئەبنەوەو
پەلە هەورەکان.. هەورە سپیەکان..
ئەچنەوە ناو یەك ئاسمان و
ئیتر ئەبینە بارانێك.. کە سەرتاپای ئەم ولأتە
ئەکەین بە گوڵجاڕی خۆشەویستی و تەبایی و
بە نیشتمانی ئاشتی و دیموکراتیی.

★ ★ ★

# حەسەن کوێستانی:

# داربەڕووە سوورەکەی باڵەك

1994

ئەمە کۆچی سووری دار بەڕوویەکی بەرکاوی "هەڵگورد"بوو؟ یان
دوا سەفەری بروسکەیەکی بە ژەنگو ژاری
دەم بە زەردەخەنەی برینەکانمان؟!
ئەمە ئاوابوونی "مانگ"ێکی ئەرخەوانی،
خەرمانە سەوزی، ئاسمانی خۆڵەمێشیی " باڵەك " بوو؟
یان ئاوابوونی سروودێکی رەنگ زیوینی دەم بە جریوە؟
ئەمە گەردەلوولی کۆستێکی ناوەختی
دەشت و دەری تلە تلێ سووتاوی خوێنی گەرمیان بوو؟
یان زایەڵەی کلووی بەفرو کڕووزەی پەلکە گیاو
یان سۆزی شینێکی گەرمی لە کۆتەڵدا شکۆفە کردووی
گوڵە کوێستان؟!
ئەوە ئەستێرە بوو کوژرا؟!
یان باهۆزی ئەسپێکی یاڵ نارنجیی شۆڕشی نوێمان؟!

ئەوە " مەم "بوو لە پشتەوە پێکرا؟
یان فەرهادو یان سیامەندی عاشقی بەندەن و
دارو دەوەن و ماهی کێوان؟!
ئەوە خوێنی دار ژاڵەبوو ڕژا؟!
یان خوێنی کەڵێکی سیس و کەوەی شاخان؟!
یاخود دڵداری هەژاران؟!
ئەوە دوا هەناسەی کانییەکی کوێستان بوو؟
دوا هەناسەی دار هەنارێکی " گەلاڵە "؟!
یان ئاویلکەی گوڵە شەست پەڕێکی حاجی هۆمەران؟!
شاخێك شەهید کرا؟!
یان ئالآیەك؟!
چ کسپەیەك لە هەناوی بەردەوە هەستا!
چ چرە دووکەڵێ لە دەروونی زۆزانو پژوپۆی باخانەوە بەرزبۆوەو
چ تەمتومانێ مەملەکەتی خەمی،بەفر بە سەری،ئێمەی داگرت؟!
لە نێوان مەرگی مێژوویەكو لەدایکبوونەوەی مێژوویەکی تردا
" حەسەن کوێستانی " باران بوو
لە نێوان شەوێکی ئەموستەچاوو کازیوەی بەربەیانێکی نوێدا
" حەسەن کوێستانی " هەتاو بوو
بەدرێژایی ئازاری رەوەندی نۆزدە ساڵەی دوای تاریکستانی هەرەس،
حەسەن کوێستانی، چرای تاوڵ و گوڵ خەندەرانی
شۆڕش و چریکەی هۆبەهۆی راپەڕین و
مەشخەڵێکی لرفە کردووی ناو لێرەواری تێکۆشان بوو

به قولایی نائومێدیی سەردەمێکی ئەژنۆ شکاویش،
حەسەن کوێستانی:
ستوونی پرشنگ و رەوەزی ورەو حیلەی هەستانەوەو
بانگی سەر هەڵەمووتی خۆرستان بوو
بە درێژایی نۆزدە ساڵی سەنگەرو نۆزدە ساڵی قەڵەم و
نۆزدە ساڵی رێ پێوانی ناو وڵاتی کوردایەتی،
ناو وڵاتی هەق پەرستی و ناونیشتمانی ئازادیی،
حەسەن کوێستانی لە کوێ نەبوو؟!
لە کزەبای کوێستاندا ـ بۆن و بەرامەی گوڵجاڕی هەڵاڵەو
لە گۆڕەی گەرمییانو بەرایی پێدەشت دا ـ چاوی تیژی هەڵۆو
مامزی سووری داستان بوو!
"حەسەن کوێستانی "مزگێنی هەموو شوێنێ بوو
لە بنەبانی کوردستاندا.
لە کوێرە دێیەکی تەریك و لە کوختێکی پەنا زاخۆدا ـ ئەو:
کەڵە پشکۆی ئاگردان و "لاس "ی دڵداری
ناو مەلحەمەی شۆڕش و لاوکی دەمادەمی بەربەیان بوو،
لە پێدەشتەکانی گەرمەسێریشداو
تا لای "حەمرین" ئەو شەقژنی بازی ئاواتو سەمەلی گوڵە گەنمو
لە بیابانو قاقڕیشدا ئەو مێرگی بە بریقو باقی هیوامان بوو!
حەسەن کوێستانی وەك خۆرەتاو لەکوێ نەبوو؟!
حەسەن کوێستانی وەك هەوا لە کوێ نەبوو؟!
لە کام وڵاتی پەنگرو خۆڵەمێشدا لە کام چیای هەڵمەت و

لەکام نێرینەی ترس‌و بیمداو لەکام هەزار بەهەزاری مەترسیدا،
ئەو، لەوێ نەبوو؟!
حەسەن کوێستانی لە کام نیگای گزنگ و
چاوی پاشەڕۆژدا نەبوو؟!
لە کام هاژەو لە کام وژەو
لە کام سروودی ژیاندا نەبوو؟!
لە بیلبیلەی هەژاراندا تروسکەبوو
لە ماڵیاندا گوڵی ناوتاق و
لە کێڵگەیاندا زەردەخەنەی دەغڵ و
لە مەزرایاندا و شۆراب و دارچنار و
لە دەفتەری منداڵاندا گوڵەبەڕۆژەی حەرف و
لە دەستی زبری رەنجدەران و جوتیاراندا داسی دروێنەو
بە قژی ژنانیشەوە گوڵە بەیبوون بوو
لەهەر شوێنێ، لەهەر مەڵبەندێ، لەهەر دۆزەخێکدا،
کوردستانی دایك مووی تەنگانەی بۆ هەڵکڕوزاندبێ،
حەسەن کوێستانی:
کوڕی ئاگری کوڕی شاخی کوڕی ئازادییش لەوێ بووە!
لە مارتی شوومی 1975 دا
ئەو دەمەی بەهار گریاو گوڵیان کوێر کرد
ئەو دەمەی چەکیان سەربەرەو خوار هەڵواسی و
مەچەکیان لە سێدارەی بەغدا دا
ئەو دەمەی فوویان لە هەموو مۆمەکان کردوو

لەگۆڕستانی شەوەزەنگدا ناشتیانن!
ئەو دەمەی دارستان دەستگیرکراو دەوروتەسلیمی
شاخ بە شاخ کرا!
ئالەو مەرگەساتانەدا،
لەو مێژووە چاو چاو تیانەبینەدا،
حەسەن کوێستانی: وەك زریانێ سواری تاشەبەردی
کێوان بووەوەو ئازاری زین کردەوەو ئاوزەنگی تەقین
بە ملەو هەڵەت و چەقەنە بەردی ئەم وڵاتەدا کەوتەوە
غارو پەنجەکانی خۆی لەناو تاریکستاندا هەڵکردەوەو
شوێن ئازادیی کەوتەوە،بوو بە مانگ و
دڕی بە ڕەشترین گەواڵە هەوری نوشوستی داو
لەو بەرزەوە بۆ کورد درەوشایەوە،
لەو ئاستەیشدا،کە بەر لە چل ڕۆژ پیاوکوژانی مانگی
سەوز، پیاوکوژانی حەسەن کوێستانی،دڕکە زیەکانی بێگانە،
تەوری تاوانکاران و بای زەردی وەیشوومەی لەودیو حاجی
هۆمەرانەوە هەڵیکردو وـ هاتن و چاوی ئەم
گزنگەیان هەڵکۆڵی و بەژنی ئەم دارسێوەیان بڕیەوەو
گوڵەباخی ئەم ئەستێرە سوورەیان هەڵوەران!
هەر لەو ئاستەداو لەو ملەیەداو لەو پێچەدا بەر لەنۆزدە ساڵ،
حەسەن کوێستانی،بەوری دوای هەرەس،
تۆوی شۆڕشی نوێی وەشاندەوەو
چرای راپەڕینی داگیرساندەوەو

مزگێنی: دیسانەوە بەرەنگار بوونەوەو دیسانەوە هەستانەوەو
دیسانەوە تا مردن بە پێوە وەستانی دایەوە بە هەلگوردو
لەسەر سەکری سەکران و مامەڕووتەوە بانگی هەق و
خۆشەویستی خاك و ئەم گەلە خوێن لەبەر چۆڕاوەی بەگوێی
دیرۆکی شەهیداندا دایەوە
خوێن هات و خوێن رۆیشت و
مەتەرێز لە دوای مەتەرێز
باهۆز لە دوای باهۆز هەڵیانکردوو
دووکەڵ بەدوای دووکەڵدا
سوار گلاو سوار هەستایەوەو
سوار رایکردوو. ورە تۆقی و
گەورە شاخ کەوتە سەر چۆك و
گەورە تفەنگ خانەکانی خۆی بەتاڵ کردەوەو
شەهیدانیان پەلکێشی هەندەران کردوو
ئازایەتیی ناونیشانی خۆی سڕیەوە و
چووە کونجی ترسەوە و بەدەم هەناسەی ساردەوە
خەرمانی یادگاری بە با ئەکرد؟!
ئا لەو قات و قڕیی ژیانەدا بوو
لەو وەرزە زڕەدا بوو
کە لەش و گیانی حەسەن کوێستانی بووبوون بە بژوێنی
بە گیاو گۆڵی سەوز و سووری بیری لە شەونم پاراوتری
عەشقی پیرۆزی، کوردستانیی

بووبوون بە گوڵاوی مژدە
بووبوون بە گۆرانیی و بە کانیی
هەر لەو وڵاتی مردن و مەرگەدا بوو، کە باسکی حەسەن
کوێستانی بووبوو بە مەشخەڵ و سەری بە تانجیکە گوڵ و
قاچەکانی بە دوو جۆگەو چاوانی بە قیبلەنماو
قەڵەمیشی بە گوڵەگەنمی گەرمییانی،
ئیتر بەژنی ئەو و بەژنی داربەڕوو بەژنێ بوون
ئیتر رەنگی ئەو و رەنگی دارگێلاس رەنگێ بوون
ئیتر دەنگی ئەو و دەنگی راستیی دەنگێ بوون
ئیتر حەسەن کوێستانی و کوردستانیش
وەك بای وەشت و خاکی تینوو تێکەڵ بوون
ژیانی ئەم دار بەڕووە سوورە
ژیانی ئەم مانگە سەوزە
ژیانی ئەم عاشقی ئاو و گڵە
ژیانی پوورە هەنگ بوو
ژیانی درەختی تینوو
ژیانی هەتاوی زامدار.
تەمەنی خاچ و عومری باڕێزەی هەبوو.
سەربووردەی لەرزەی بوومەلەرزە بوو.
حیکایەتی ئەو حیکایەتی کوڕی بەفرو کوڕی رەشەبا و
رێی نەهات بوو
حەسەن کوێستانی ـ خۆی بۆ خۆی داستان بوو

به هەق: خۆشەویستی سەرتاسەری ئەم نەخشەیە و
خۆشەویستی هەژاران و هیوای گەشی ناو دڵان بوو
سەرەتا: منداڵێکی رەنگ پەڕیوی بنسان و باریکەلە
وەك کۆترە شینکەی کێوان
لە جۆلانەی نائارامیدا هەژاری رای ژەنی
بەسەر سەریەوە هەلگورد و بەچوار دەوریشدا پەلکەڕەنگینەو
شیعری رەنگاو رەنگ جریوەیان بوو
لە کەروێشك بزێو تر
لانەی ئەو وشەبوو.
هەر زۆر زوو ئەوینی دارو ئەوینی بەردو ئەوینی هەژاران
گیانیان کرد بە نواڵەی خۆشەویستیی
بۆ شۆڕش سەریشیان کرد بە ئاسمان.
سەرەتا:ئەستێرکێکی مەکس بوو لە خەمی کوردا و
لە ژووری خوێندن و پۆلی دەرسەوە عاشقی ئازادی بوو
ئینجا بوو بە کەو و بەرامبەر گوڵی خوێن خوێندی
بوو بە سمۆرەو بەداری ئازادی خۆیدا هەڵزنا
بوو بە هەنگ و چووە ناو شانەی کارەوە
وردەوردە خەم باڵای کرد.
وردە وردە ناسۆر گەشایەوەو
هەتاکو بوو بە سروودی دەم کوێستان
یەکەمین ماڵی سپی ئەو ماڵەکەی کۆمەڵەبوو.
یەکەمین جێژوان و قۆزاخەی ئاوریشمی باوەڕی

ناو پەل وپۆی درەختەکەی کۆمەڵە بوو.
لەدواییداـ هەڵۆی سوور پەڕوباڵی دەرکردوو جێ نزرگە شەقژنی ئەو
ئەمجارەیان ئاسمانەکەی " ی.ن.ك"بوو
حەسەن کوێستانی لەیەك کاتدا
دڵی کۆترو چاوی هەڵۆو شنەباو زریانی
تێدا کۆبووبووەوە، لەیەك کاتدا
بەفرو ئاگرو
گوڵ و گوللە بوو.
تیشکی قەڵەم و دەشتی گوڵاڵە و
ـ زەردەی لوتکەبوو.
ئەم دڵدارە فڕ رەشەمان
" پ.م" ێکی سەرکردەبوو.
ساکار ساکار وەکوو بەفراوی کوێستان و
سادە سادە وەکوو خۆڵی سەر گۆڕستانی شەهیدان!
وەکو ئاوی بەر هەتاویش دەم بە خەندە
ئەی هاوڕێ! ئەی کوێستانی!
تۆ وەك سروودی مەشخەڵان
وەگو کەرکووك
وەك سێبەری باڵای بەرزی شەهیدان و
شاخی گۆیژەی سلێمانی ـ لە گەڵمانی ـ
لە کۆڕماندا چراو تابلۆی
لە ڕێبازی "ی.ن.ك" داو لە چاوماندا

گوڵ و ئاسۆی
ئەی هاوڕێ!
لە پەڵە خوێنی ڕژاوتا ئەستێرەی سوور
سەر دەردێنێ
مێژوو هەڵدێو
پرشنگ ئەڕوێ!
ئەی هاوڕێ!

# قوڕە سووری زمان و گۆزەی شیعر!

1998

بەهەنگاوی چۆلەکەیەك، لەسەر بەفری نواباریوی 1997/1/9،
چەند دێڕێ جریوەو جووکەی شین باوو
چەند بەیتێ فرمێسکی قافیەدارو، چەند نۆتەیەکی پرووشەو،
چەند هەناسە
پەخشانێکی "سەرچنار "م نووسیی!
بە قەڵەمبازی مامزێ
پێدەشتی شیعرم تەیکردوو
لەسەر کانی و ئاوی زمانێکی لەچاوی قرژانگ رونتر،
دەمم نا بە پلووسکی رەوانبێژییەوەو
سینەم بوو بەمێرگی ئۆخژن.
لە پەڕەپەڕەی چاوی گوڵە بەرۆژەیەکی "قەرەداخ"
هەزار وردە ئاوێنەی بەردەمی بەردو، هەزار بالیفە گەڵای،
ژێر سەری شەونمم دروستکرد!

لەتاڵەڤژی پەریەکانی"فەرهەنگی خەم"یش جۆلانەم بۆ دیلانێی
پەپولە هەڵخست و
رەشماڵێك بۆ كزەباو
پۆپەشمینێ بۆ ئاوی راكشاو
چەپكە تەمێكیشم دایە دەست درەختی چاوەڕوان!
ئەو شەوە، من لێرە خەونی چیایەكی وێڵ بووم
چرنووكی كۆچ ئەیرنیمەوەو
بارێزەیەكی سەرگەردانیش ئەیدام بەدەم
كەفەژیلكەی بەندەرە نادیارەكانەوە.
ئەو شەوە، من دەستی، لەرزۆكی نامۆیی بووم
پەرداخێكی وردوخاشی "سەعات"و
قاپی شەرابی كوژراو و
كورسیەكی شەل و
كەمانچەیەكی لاڵ بووم.
من ئەو شەوە،هەنگە زەردەیەكی، پوورەی خاپوور بووم
لە شیلەی زمانەكەی خۆمدا ئەخنكام!

٭ ٭ ٭

بە شەقاوی مانگەشەوێك
لەسەر بەفری نواباریوی 1997/1/9
خەرمانەیەك زایەڵەم نووسی و
بەرلەوەی كازیوە چاوی بگڵۆفێ
خەرمانەكەم هەڵگرتو كردمە ملی "فەرهەنگی خەم "

به هەڵبەزەو دابەزەی دەنکە تەرزە
شیعرێکی ناتەواوی ئەو فەرهەنگەم تەواو کرد
بەهەڵچوون و داچوونی شەپۆلێکی ئەو دیوانە
گەمیەی عەشقم خستە سەما
من سەمای "وەجد" و
من سەمای دووکەڵ و
من سەمای گریان و
من سەمای "حەلاج"ەکەی "شێخ" بووم
لەو شەوەدا

* * *

هەواری خۆڵەمێش و سوتماك لە مەملەکەتی شیعردا
مەستە بەبۆنی بادەی "فەرهەنگی خەمی" تۆ،
ئەی پیری ئەویندارانو
چراوگی دەس سەرخۆشانی کۆڕی سەمەندەرو قەقنەسی یاران!
بەلای ئێمەدا بادەوە، خاڵییە
گۆشەی پڕ لە نووری خەڵوەتگەی مەولانەو، خاڵییە
ژووری قوڵ قوڵەی پێکەنینەکەت..
چما لەو سەفەرە ئەفسوناوییە نەگەڕایتەوە؟!
ئەی بارانی رەوەندو ئەی دار هەرمێ گوڵ سپیەکەی قەرەداخ؟!
چما لەو تەمەنەدا
وەك پرشنگێکی گیر خواردوو مایتەوە؟!نەگەڕایتەوە؟!چما؟!
ئەوە تۆ نەبووی ئاگرمان سارد بکەیتەوە ئەوە تۆ نەبووی

چاوەڕوانیمان بکەی بە پووش و پەلاَشی وێرانەیەك و بە
چاوەڕوانی مەلێکی جووت کوژراو!.. چ زوو..؟ لە کوێوە بووی
بەهۆن هۆنی ئەسرینەکانی چەمی دێوانەو؟ یان بە پەنجەرەیەکی
"خۆرنشینی"قۆپی و چ زوو!مەیلی گڵۆ مەیلی تراویلکەو مەیلی
"کەژاڵ" هەڵێگرتی بۆ سارای ئەبەدیو لەکوێوە
چوویتەوە ناو دڵۆپە باران؟!
بە یاڵی کەم "بادی خۆش مروور "خۆت هەڵواسی و
گەیشتیە تاراوگەکەی "ناڵی"؟!کام "شەمعی شەوی " مەحوی
لەبەردەمتەوە ئەڕۆیشت و تۆیش پەروانەکەی جاویدان؟!

★ ★ ★

زمانی کوردی: لە گەرووتا،شمشاڵەکەی "وەلی"بوو
زمانی کوردی:لەبەردەستتا، ئەو قوڕە سوورە موبارەکە بوو،
کە گۆزەی بە لەنجەو لاری شیعرت لێ دروست ئەکرد
زمانی کوردی "دەربەند باسەرە"و تۆیش باڵی بەرینی
قەڵەمێکی لە شینەشاهۆ چووی دەڤەری خەوبینین بووی.
تۆ!بە تاقە گیاکەڵەیەکی ناو مێرگی شیعر ئارامت
لەبەرئەبڕاو هەزار جار ئەم دیوو ئەو دیوو بە مەلۆتکەیەکی
تازە زاوی ناو باوەشی خەیاڵت ئەکرد
ئەوەندەت بەسە
گوڵدانێکی شیعرت لەسەر بانیژەی هەتاو دانابێ
ئەوەندەت بەسە
دڵی زمانی کوردییت خۆش کردبێ

ئەوەندەت بەسە
"نالی"یەك ماچی نێوچەوانی کردبی
ئەوەندەت بەسە
شاخی زەردیش لەم کۆچەدا
یەك دڵۆپ فرمێسکی بۆ رشتبی!

★ ★ ★

لە خانەخانەی یادگار لێنیشتووی ساڵاندا، ،
هەموجارێ ئەو ئەلبوومی هەور رێژانە دەرئەهێنم
کە دڵۆپ دڵۆپ شیعریان لێ ئەتکێ و
کە خەیاڵیان تیا ئەپشکوێ و
کە رەنگیان تیا ئەڕوێ و
کە پەپوولەیان تیا ئەنوێ
بەشیعر چاوی خەیاڵ ئەڕێژم و
لە رەنگەکانی بیرەوەریشدا
پەپوولە بە "با"ئەدەم و
بیرت ئەکەم!
براکەم!لای هەندێ کەونەبێ، ،
کە ئەزانن..چۆن بۆچیای عەشق ئەخوێنن؟
کە ئەزانن..بە قاسپە بەفر بنووسنەوە
لای هەندێ کرمی ئاوریشم نەبێ
کە ئەزانن..چۆن قۆزاخە بچنن و
کە ئەزانن.. چۆن درەخت بلاوێننەوە

لای هەندێ ماسی نەبێ
کە ئەزانن گەرا لە کام قوڵاییدا ئەخەن و
ئاوزەنگی ئاو چۆن دروست ئەکەن و
چۆن لە گێژەن ئەپەڕنەوە..
وەڵێ ئیتر..لە پاشاگەردانی وڵاتی شیعردا
ئێستە "زمانی کوردی "لە بەڕووی بێ کڵاوو
لە گوندی ڕاگوێزراوو
لە هەتیووی کزی بەر بەرۆچکە و
لە چۆلەکەی کەسیرەو
لەو نیشانە بەسەزمانە ئەچێ
ڕۆژی هەزار تیری نەزانی تێ ئەگیرێ!
★ ★ ★
سلێمانی لەبیرێتی:
لەسەردەمێکدا وشەمان ئەکرد بە مۆم و
شەوانە لە دەفری کریستاڵی بەفردا دامان ئەگیرسان!
لەو دەمەدا: هەموو کورسیەکانی عاشقانی شیعر
لەم شارەدا، چل کورسی بوون و لەباخچە لاکێشەکەی
" یەکێتی نووسەران "دا ریزمان ئەکردن و هەندێ جار
نیوەیان لە ددانی کەڵ ئەچوون چۆڵ و بە میوانی
نوکتەکانی خۆمان پڕمان ئەکردنەوە!
تۆ لەو دەمەدا لە خوڕەی ئاوێکی تیژ ئەچووی
قاقاکانت ئەوەندە گەرم و لەرزێنەر بوون

**له بنجەوە چیرۆکە باریکەکانی**

**"شاکر فەتاح "ت دائەچڵەکان!**

**کالانەی فرمێسك تێزاویشت له قوولَی مشتتا بوو**

**چاوت له پەلکە گیای ئاونگاویی ئەچوو**

**دیمەنی کڕوزانەوەی گوڵە گەنمی، گریانی بەردێ**

**روخساری پەڕیوی دەروەزەکەرێ، چۆلەکەیەکی عاسی و**

**باڵەفڕێی سکالآیەك بەس بوون بۆئەوەی**

**کسپە له جەرگی شیعرت هەستێنن.**

**ئۆباڵ به گەردنی شیعرم**

**"رق" نه باریکی و نه ئەستووری**

**لەناو دارەڕاکانی بنمیچی ژوورەکەی دلَی تۆدا نەبوو.**

**ئۆباڵ به گەردنی شیعرم**

**له سەرینی ژێر سەری شەوانەتا**

**نه" تۆڵە" ی له بندا بوو نه "ئێرەیی "و نه پەڕی"بوغز "**

**ئەوەی لێت نەئەزانی دوو شت بوون**

**بازرگانی و سیاسەت**

**ئەوەی که لێشت ئەزانی هەردوو شت بوون!**

**شیعر و ئەوین!**

**تۆ له شەستەکانی تەمەندا بوویت و**

**بەلآم دلَی منداڵێکی دوانزە سالآنە له سنگتا بوو**

**وەك ئەوەی دارتوویەکی شەست دەست و پەل**

**گوڵە مێخەکێك دلَی بێت!**

وەك ئەوەی "بەرانێك "کۆترێك دڵی بێت و
وەك ئەوەی "مامەیارە "بچوکترین قوربانی
ئەم ولاٌتە..دڵی بێت!
لەبیرمە!
یەکەمین هەرەسی شاخە بەفری لەشی تۆ
لە گرمەو ناڵەی کۆچەکەی "کەژاڵ" و لە برووسکەی
ئەرخەوانی خوێنی ئەوەوە...دەستی کرد بە دارِمان!
بەرلەوەی ئەو "مانگ"ە ئاوابێ!
بەرلەوەی ئەو گۆرانییە خڵتانی بێدەنگی بێت
بەرلەوەی ئەو ملوانکەی تریفەیە پچڕێتەوە
بەرلەوەی ئەو شووشەی خۆرەتاوە وردو خاش بێ
تۆ هاژەی نێو گەلیی جەستەیەك بوویت
گاڵتەت بە تۆڕی مەرگ و وشك بوون ئەکرد.
گاڵتەت بەقلێپبوونەوەی کەشتی عومرو
گاڵتەت بەکوژانەوەی چراوگی بەر رەشەبا ئەکرد
تۆ ئەو دەمە حیلەی تاشەبەرد بووی
پێکەنینت بەخلۆر بوونەوەی ساڵ ئەهات
پێکەنینت بەو دزەی مردنە ئەهات
کە بەچوار مشقی یان بە راکشانەوە
زەفەرت پێ بەرێ!

★★★

حەزت بەسەرو فەساڵی چەقۆکەش "رەخنەی کوردی "نەئەکرد

ئەتوت: ئەوانە قاچاخچی وشەن!
دارچنارێك بوویت و کەچی لە ژماردندا ئەیانپەڕاندی
کلاو رۆژنەی شیعرە جوانەکانتیان
بە پارچە مقەبا دائەپۆشی.
پێم ئەوتی هێشتا ئەو رەخنەیە
لە دیرۆکی تۆڵەی دووروودرێژی "قامیشی و دڕەیی"ئەچێ
ئەم رەخنەیە پیاوێکی کەتەیەو
جامانەکەی هی خۆمانەو
چاویلکەکەی هی خۆمانەو
زوبانەکەشی هەر هی خۆمانە
بەڵام ئەم پیاوە ئەوەی هی خۆی نییە
سەرێتی و
چاوێتی و
گەرووپەتی!
تۆ بەچکە کەروێشکی ناو لانەی سینەت
هەندێ جار بە قونەقون پێشت ئەکەون و
ئەیبردی و ئەیکردی بەداوەوە!!
ئەوەی راستی بێ تۆ هەرگوڵە کێویلەکەی "سێوسینان "بووی
بۆیە لە باخچەی ریای شاردا
گوڵە دەمامك و
گوڵە ژەهراویەکانت
بە وردی لە یەکتر جوێ نەئەکردەوە

تۆ خۆت نێچیری

پاکێتی خۆت بویت!

* * *

پرسیبووت: چۆنم؟!

من کفنی جەستەی شەوی خۆمم

دوو ئاوانەکەی "نالّی و حاجی"یش رژاوەتە ناو منەوە

لەتاو داهۆلّە پیاو

هالأو..لە غەریبیشم هەلّئەستیّ..هالأو

داهۆلّە پیاو

نیشتمانیان کرد بە کاغەزی قومار

نیشتمانیان کرد بە پەشتەمالّ

نیشتمانیان کرد بە ئەسپی رایز

نیشتمانیان بە خۆڕایی و بە جلی خۆیەوە

جارێك پێشکەشی "حەجاج"کردو

بە بێوەژنیش جارێکی دی دایانەوە

مستەفا کەمال!

نیشتمانیان فۆتۆکۆپی کردۆتەوە

بۆ ئەوەی لە بازگەکانی گومرگدا

لە باتی جارێك چەند جارێك پارەیان بۆ بکات

هالأو..لەغەریبیم هەلّئەستیّ..هالأو!

* * *

قەرەداخ ژوانی لەگەلّ هەزاران گولّ ئەستێرەدابووە.

بەلاّم هەر چەند. گولّ ئەستێرەیەکی لەیاد ماوە

سەرچنار ماچی نێو هەزاران چناری کردووە

بەلاّم چەند ماچێکی لەیاد ماوە

کوانوەکان هەزاران هەزار حیکایەتیان گوێ لیّ بووە

بەلاّم هەر چەند حیکایەتێکیان لەیاد ماوە

رێزە بە رێزە شەستە بارانەکەی کۆچ و کۆچ رەوی

بەهاری 1991 یش

گوێی لە چەندین هۆ بەهۆ

زایەڵەی شیعر بوو

بەلاّم هەرچەند شیعرێکی لەیاد ماوەو

یەکێکیان هەناسە سوتاوەکەی تۆ بوو!

* * *

من ئەمشەو زەنگێکی پلپلەداری شین

ئەکەمە ملی ئاسکە بەفرینەکەی شیعرو

بە شەقامەکانی تەنیاییدا..ئەیگێڕم

من ئەمشەو بەهەنگاوی مۆمێکی کەڵەگەت

لەسەر بەژنی زرافی زەریا چامەیەکی سەرخۆش ئەنووسم

بە هەناوی فرمێسك لەسەر هەنیەی گەلاّ

تروووسکەیەك ئەنووسم

من ئەمشەو بە هەناوی جوانویەك. مێرگێك ئەنووسم

بە هەناوی برینێك..قیژەی یاقووتێك و

بە قامکی شەمالّ..فەرهەنگی خەم ئەنووسم

لێم گەڕێن!ئێوە ناچن..من خۆم ئەچم
لە سەرەڕێی هاوارو زایەڵەکاندا ئەوەستم
بۆئەوەی بزانم چما ئەو لاوکەی ئێمە نەهاتەوە؟!
لێم گەڕێن!ئێوە ناچن من خۆم ئەچم
یەخەی گەواڵە هەورەکان ئەگرم
لە ئەستێرە کاروانچیەکان..سۆراخ ئەکەم
ئاخۆ لەبەرچی ئەو چرا بەفرەی ئێمە نەهاتەوە؟!
ئەو سترانە بۆ کەوتە درەنگان؟!
لێیان ئەپرسم: ئەم خەمە پەرەوازەیە
لە "کەلیخان"گیری خواردووەو بەفر رێی نادا بێتەوە؟!
یان هەر خۆی خەمێکی خوێن ساردەو
ئەیەوێ بە کاووخۆ بەپێی پەپولان بێتەوە؟!
لێیان ئەپرسم: ئەو سۆزەی "مەحوی "
لە رەوەزەکانی "بەمۆدا"عاسیی بووە؟!
بروسکەی "حەلاج"فڕاندوێتی؟!
پەریی ئاو..بردوێتی
لە "ئیشراقدا "تواوەتەوە؟!
یان لەوبەر سیروانەوە بۆشەوێك
لایحەزرەتی "مەولەوی " ماوەتەوە؟!
ئێوە ناچن من خۆم ئەچم و
لە "زەڵم" ئەپرسم: لەوانەیە لە خوڕەی لووزەو دابێ
لە "شەم" ئەپرسم: لەوانەیە لە خۆرنشینی قژیا بێ

له "وەلی" ئەپرسم: لەوانەیە چوبێتە ناو شمشاڵەکەیەوە.

له "کوڕە کاژاو" ئەپرسم:کێ ناڵێ نەبووە بە کلاّوکوڕەیەکی ئەو؟!

من ئەمشەو بە هەنگاوی چۆلەکەیەك

لەسەر بەفری نوابارێوی 1988

بە هەنگاوی نەورەسێك لەسەر دەفتەری سەهۆڵ و

بەهەنگاوی قەڵەمێکی سەرگەردان.

لەسەر جەستەی ترافیەو تاراوگە ئەنووسم:

ماڵئاوا.. حەسیب قەرەداخی!

# "مارف ئاغایی"

## شیعری کشاو و بارانێکی جوانەمەرگ!

1998

ئەو ناسین و بەیەك گەیشتنە..تراویلکەی خەونێ بوو
لە هاوینێکی شوومدا؟!یان چارەنووسێکی تاروماری
لە تەوێڵ نوسراوی شیعری پەڕاگەندەم؟!
کامیان بوو..کۆستی بارانێکی جوانەمەرگ؟!
یان کۆچی بێ وادەی گۆرانییەکی گوڵ بەدەم؟!
یەکەم بینین و دوا بینین و ئیتر سارای سەر بە تەمتوومانی
مەرگ و..بێدەنگییەکی ئەبەدیی!
ئەو رێکەوتە چەمووشانە چین بە پڕتاو دێن و
هیواکانی نێو باوەشمان ئەفڕێنن و لە ناکاوێکدا
لەهەزار بە هەزارێکی تاریکییەوە تلۆریان ئەکەنەوە؟!
ئەی چ کسپەیەك لەو کسپانە ئاگراویی ترە
کەلە ساتەوەختێکی هەرگیز چاوەڕوان نەکراودا
چزەی تا سەر ئێسقان سووتێنەر لە ژیانت هەڵئەسێنن؟!
من مەبەستم لە چزەیەکە بیر نەچێتەوە.

مەبەستم لە زامێکە سارێژ نەبێتەوە.
مەبەستم لە گڵێکە مەیل بڕ نەبێت.
مەبەستم لە گینگڵی رۆحە و لە چوڕچوڕەی
خوێنی چاوەکانی خۆشەویستی!
خۆزیا ئەو پەڵە هەورەم هەر نەبینایە.
تەوقەم لەگەڵ ئەو هەتاوەدا نەکردایەو
خۆزیا لە نزیکەوە ئەو شەماڵە دەم بە زەردەخەنەیەم
نەناسیایەو..پیاسەم لەگەڵ ئەو ئەستێرەیەدا نەکردایەو
ئەو قەسیدەیەم ماچ نەکردایە!
پێشتر دووراودوور جریوەی وشەیم ئەبینی.
پێشتر دووراودوورگوێم لە هەناسەکانی ئەبوو.
پێشتر دووراودوور بۆنی رەنگەکانیم ئەکرد.
بەڵام ئاخر ئەوە لەکوێ وئەوەی لە کوێ ئەستێرە خۆی
دەست بخاتەسەر شانتو ئاواز خۆی شیعرت بۆ بخوێنێتەوەو
گوڵیش خۆی گاڵتەو گەپت لەگەڵدا بکات و هەتاو خۆی
بتدوێنێ و لەیەك ژووریشدا لەگەڵ تریفە خۆیدا دابنیشی و
لەسەر یەك مێزیش رووبەڕوو لەگەڵ گوڵە بەڕۆژەیەکدا
گفتوگۆ بکەیت!
ئەوە لە کوێ..درەختێ نامەت بۆ بنووسێ و
ئەوەی لە کوێ..درەختەکە خۆی بێت بەپیرتەوەو
باوەش بە ملتا بکات و ماچت بکات و
لە بۆن و بەرامەی ئەوینی خۆیت پێ ببەخشێ؟!

ئەوە لەکوێ باسی تیتروواسکی عاشقی گوێ زرێبارت بۆ بکەن‌و
ئەوە لە کوێ تیتروواسکەکە خۆی ببینی و
سەرت بخەیتە نێو پەڕو باڵیەوە و لە باڵەفڕێدا
بە پرژەی تنۆکە زیوینەکانی ئەو تەڕببی.
ئەوە لە کوێ "سروە " لە ورمێ بێ و
ئەوەیش لە کوێ سروەت بۆ بێننە "تاران " و
لە قرچەی پایتەختا پەپوولەبارانت بکاو
وشەی فێنکت بەسەردا ببارێنێ!
چەند رۆژێ بوو کەچی ئەتوت:
چەند ساڵێکە چاومان یەکتری ئەناسێ و کەچی ئەتوت
زۆر دەمێکە لق و چڵمان ئاوێزانی یەکتری بوون و
چەند رۆژێ بوو کەچی وامان ئەزانی لەدەڤەری خۆشەویستیدا
لە ئاوێتەبوونی ئاوی گیاندا بووین بە دوو ئاوانێ!
تۆ لە "ورمێ" وە هاتبووی
لە دەریاچەوە بۆنی گوڵ ئەستێرەی ئاوی و
لە باکوورەوە بۆنی رێحانە ڕەشەی کاکۆڵی ژنە شوکاکی و
بۆنی بەستێنی سۆزێکی تەڕوبڕت
لەگەڵ خۆتدا هێنابوو.
منیش لە "پیرەمەگرون" ەوە لەگەڵ خۆمدا
مانگەشەوی شیعری "گۆران "و
کوڕژنی سروودەکانی "بێکەس" و
لە خۆرئاواوە رەنگی گریان و زایەڵەی

ژنانی گەرمیانم بۆ هێنابووی.
من تاڵە قژێکی ریشی " نالی" م دایە دەستت و
تۆیش ئاخێکی هەڵقرچاوی سینەی "وەفایی" بۆ شیرین.
تۆ چریکەی "سەید علی ئەسغەر"ت
کردبوو بە شەدەی سەرت و
منیش ئەڵڵاوەیسیەکەی "عەلی مەردان "م
کردبوو بە چاوگی گڕەو لە دەنگما بۆم هێنابووی!
خۆزیا لە نزیکەوە ئەو کۆترەم نەناسیایە.
خۆزیا لە نزیکەوە ئەودارچوالەیەم نەبینیایە.
لەبەفر ئەچوو..لەوەختی پێکەنیندا.
لە پەپوولە ئەچوو..لەوەختی پەیڤیندا.
لە سروە ئەچوو..لەوەختی رێکردندا.
لە "کانی عاشقان " ئەچوو لەوەختی دڵتەنگیدا.
لە کڵپەیەکی نارنجیش ئەچوو لەوەختی سووتاندا.
خۆزیا لە نزیکەوەئەو وشە ئێسك سووکەم نەئەبینی.
خۆزیا لە نزیکەوە ئەوخەونە سپیەم نەئەناسی.
لەو چەند رۆژە کەسکەدا
بیابان و قاقڕی دابڕانی سەدان ساڵمان
کرد بە بژوێن و لێرەوار و خۆمان لە گۆمەکانیان هەڵکێشا
لەو چەند رۆژە شینەدا
هەموو وشە دەربەدەرەکانمان یەکە یەکە بەسەرکردەوە.
لەبنی قوڵی یادگارەوە مرواری خەونمان دەرهێناو

کردمان بە رشتەی گەردنی هۆنراوە.
بڕیار بوو..لە کەناری وەرزێکی تردا بەیەکتر بگەینەوە.
بڕیار بوو..لەهەمان ئاوێنەی خۆشەویستیدا یەکتر ببینینەوە.
بڕیار بوو..ئەمجارە دوورتر بفڕین.
بەڵام مەرگ ئەو وەرزەی داڕنی
ئاوێنەکەی کرد بە دوو کەرتەوە لەتێکیانی دا بە گڵ و
ئەویتری بە ژووری نامۆیی مندا هەڵواسی!
بەڵام مەرگ..ئاسمانی کرد بە گۆڕستان و
مانگەشەویش هەڵوەری!
خۆزیا ئەو دەریاچە مەنگەم هەر نەبینیایە.
خۆزیا ئەو پەڕە سێلکەی موکریانەم هەر نەناسیایە.
بەڵام خۆزیای ئێمە هەمووجار لە بەرەبەیاندا ئەمرێت!
بەڵام خەونی ئێمە هەموو جار لە گەشانەوەدا ئەسووتێت!
ئەی ئەستێرە کشاوەکە!
تۆ کەوتیتە دڵمەوە. ئێستە دڵم چراخانی گریانە.
ئەی بارانە جوانەمەرگەکە!
تۆ بارانی پەڵەی ژانێکی نوێم بوویت و
ئێستە وەرزم وەرزی کسپە و دابڕانە.
خۆزیا..خۆزیا..خۆزیا..
ئەو شەپۆلە چاو ڕەشەم هەر نەبینیایەو
ئەو گوڵی دار هەرمێیەم هەر نەناسیایەو
ئەو سەفەرە شوومەم هەر نەکردایە!

# حەفتاو دوو
# قەڵبەزەی کوژراو!
1998

ئەمشەو دوای نوستنی ئێوارە لە دەراڵی تاریکیدا.
دوای نوستنی پێدەشت لەپێخەفی پووشوی پایزێکی ماندوودا.
دوای نوستنی "ئاسۆس"و کێوە رەش لە قووڵایی
دیرۆکێکی سەر بەتارای لە گوڵی هەنار چووی،ئەم دەڤەرەدا.
بەتەنیا ئەچمە دەرێ بۆ ئەوەی حەفتاودوو،
چرای شیعر داگیرسێنم و هەر چرایەك ئەکەم
بە لقی برینێکەوەو لەژێر هەر لقێکیشدا
سوورەتێك لە ئەوینی خاك و
سروودێك لە باران و پشکۆی تێکەڵ و
پەخشانێك لە جریوەو دووکەڵی تێکەڵ و
عەشق و قوربانی بۆ داروبەرد ئەخوێنمەوە!.
ئەمشەو دوای نوستنی هەمووتان
بەتەنیا ئەچمە دەرێ و حەفتاو دوو کۆتری سەربالْ سووری،
چاو لە کووژەکە چووی، لەناو رۆحما هەڵ کورماو

بەرەڵڵا ئەکەم، دوای ئەوەی چەند تووڵێ
لە قەفەزەی ئەم سنگەیان بۆ ئەترازێنم
تا بەرز بەرز بسووتێن و بەدەم گمەگمی
زایەڵەیەکی شەقژن گڕتێبەربووی یارانەوە.
خۆیان بکەن، بە حەفتاو دوو کونەخەونی ئەو کێوانەدا
خۆیان بکەن، بە حەفتاو دوو ماڵی ئازادیدا.
خۆیان بکەن، بە هێلانەی لانکەی حەفتاو دوو
زاڕۆڵەی تازە زاوی ئەم مەڵبەندەداو بۆئەوەی
لەسەر شانی حەفتاو دوو گۆرانیمان بنیشنەوە.
حەفتاو دووجاریش بە دەوری مەشخەڵانەکەی جەستەی
ئەم وڵاتە ڕاپەڕیوەدا..بسووڕێنەوە.
بەدەوری شیعرا خول بخۆن.
بەدەوری خەما خول بخۆن.
بیکەن بە زەماوەندی هەڵاڵە..
با سنگ بدەن لە زیوی رژاوی مانگە شەوی رانییە
دەنووك بدەن لە شووشەی رەشی دڵی بێوەژنان و
لاملیش هەڵسوون لە چڵی وەریوی لاملی دایکان و
لەو سەریش کە هاتنەوە لەگەڵ خۆیاندا
حەفتاو دوو قەسیدەی زەیتوونیم بۆ بهێننەوە!.
ئەمشەو بە تەنیا چون کەوێکی سەرهەڵگرتوو
ئەچمە دەرێ بۆ ئەوەی لەبەرایی رۆناکیەکی
حەفتاو دوو چوکڵەییدا

**لەسەر شانۆی هەورێکی نزمی ئەرخەوانیی**

**لەبەردەم گوڵە باخی مایکرۆفۆنێکی سوور سووردا**

**کە حەفتاو دوو پەپوولەی قرمزیی تێی ئاڵاُبن**

**لەبەرچاوی حەفتاو دوو قوربانیی خۆرنشین**

**لەبەردەم حەفتاو دوو کەڵەکێویی بڵێسە پۆشدا**

**حەفتاو دوو شیعری گڕگرتوو ئەخوێنمەوە**

**حەفتاو دوو گوڵدانی پڕ لە پڕشنگیان لەسەردا قڵپ ئەکەمەوە**

**حەفتاو دوو جاریش لەگەڵ حەفتاو دوو سنەوبەردا**

**بۆیان ئەنووشتێینەوە**

**بە حەفتاو دوو زاری ئەم لوتکانەیش**

**ماچیان ئەکەین!.**

★ ★ ★

**ریزیان بەستووە..چراوگەکان رێ ئەکەن و ریزیان بەستووە**

**جۆگەلە نارنجیەکان، ئەستێرە کەسکەکان ریزیان بەستوەو**

**وا هەموویان بەناو گیانی ئێمەدا رەت ئەبن.**

**ئەم قافڵەی عەشقە،ئەم رێچکەی کازیوانەو**

**ئەم کاروانی برووسکانە**

**هەریەکەو گوڵە هەتاوێکیان داوە لە بەرۆکی خۆیان**

**هەریەکەو وێنەی ماڵێکی رانییەو کۆڵانێکی قەلاُدزێ و**

**مێرگێکی بێتواتەیان کردۆتە ملیان.**

**وا هەموویان بەناو رۆحی ئێمەدا رەت ئەبن.**

**زریان ناوەکانیان لەسەر تاشەبەرد هەڵئەکەنێ و**

باران باوەشیان پیا ئەکاو
کەژەکان بۆیان ئەبن بە کەژاوەو
دەریاچەکان ئاویان بە پیرەوە ئەبەن و
منداڵانیش بەسەروملی ئەم حەفتاو دوو تیشکەدا
هەڵئەزنێن و یاری لەگەڵ دەست و پەنجەی ئەفسووناویی
ئەواندا ئەکەن و هەموویشیان بەناو رۆحی ئێمەدا رەت ئەبن!

★ ★ ★

خۆ هەر ئێمە یادی ئەم شەپۆلە کوژراوانە ناکەینەوە.
لەگەڵ ئێمەدا کەنارەکانی زێ و تاڤگەکانیش یادیان ئەکەنەوە.
خۆ هەر ئێمە یادی ئەم حیلەو کوڕژنە جوانەمەرگانە ناکەینەوە
لەگەڵ ئێمەدا ئەسپی بەردو جوانووی
کزەباکانیش یادیان ئەکەنەوە.
خۆ هەر ئێمە یادگاریان ناگرینە چوارچێوەی رۆژەکانمان
لەگەڵ ئێمەدا تیشکیش ئەیانگرێتە دواڕۆژو
لەگەڵ ئێمەدا عاشقانیش ئەیانکەن بە جریوەی خەونەکانیان
ژنان ئەیانکەن بە رستەبازنی دەست و
منداڵان ئەیانکەن بەتۆوی هەورو
جوتیاران ئەیانکەن بە تۆوی گەنم و
خوێندکاران ئەیانکەن بە قەڵەمی رەنگاورەنگ و
هونەرمەندان ئەیانکەن بە قەڵبەزەی رەنگ و
شاعیرانیش بە رێژنەی وشە!

★ ★ ★

ئەمشەو بەتەنیا ئەچمە دەرێ و وەختێ هەموو شتێ بنوێ
هەر خۆم و حەفتاو دوو هەناسەی کوێستانی هەڵقرچاوم.
هەر خۆم و حەفتاو دوو گڕەی گەرمیانی ئۆقرە لێبڕاوم.
من هەر ئەمشەو لە ئاسۆی ئەم زامانەدا
بەگڕە رستەم ئەکەم بە هەڵم و ئەبمە هالاو
بەهەناسە ساردەکانیش ئەبمە کلووی بەفرێکی کڕو مات و
ئەوسا بەسەر حەفتاودوو کڵپەی گوڵەبەڕۆژەی چیرۆکێکداو
بەسەر حەفتاو دوو شانۆی گوڵە جۆداو
بەسەر حەفتاو دوو تابلۆی پێشانگایەکی کۆچەردا
ئەبارێم و لەناو مێژوویەکی سپیدا
منی شاعیر
وەك پەپوولەو وەك نێرگز و گوڵە پەموو
وەکوو چاوی ساواکانی ئەم دەڤەرە
بۆ خۆم ئەنووم!.

* * *

ئێوە بڕۆنەوە بۆ نێو ژوورەکانی خۆتان!
چاو ببڕنەوە یادگارو ئێوارە تەماویەکان
حەفتاو دوو گەواڵە هەوریش بکەن بە سەرین تا ئەنوون.
من ئەمشەو بەتەنیا لەم ناوچە سیحراویەدا
ئەبمە باڕێزەو تەلان تەلان ئەسووڕێمەوە.
ئەبمە پەپوولە پایزەو فرمێسك فرمێسك ئەسووڕێمەوە.
ئەبمە چریکەو گەروو گەروو ئەسووڕێمەوە

من ئەمەوێ ئەمشەو بەتەنیا
سەر لە لانەی حەفتاودوو مامزی بەفرینی ئەم پێدەشتە بدەم.
سەر لە هەواری حەفتاو دوو بازی یاقوتینی ئەم چیایانە
بدەم و ئێوە بڕۆنەوە بۆ نێو ژوورەکانی خۆتان!.
من ئەمەوێ ئەمشەو لەبەر چراکانی خوێنی
ئەم حەفتاو دوو هەڵۆیەدا، شیعرێك بنووسم
لە حەفتاو دوو لاوە شەوقبداتەوە
حەفتاو دوو دێڕبێ‌و حەفتاو دوو لق‌و پۆپی سترانی لێ بووبێتەوە.
حەفتاو دوو جووتە چاوی کەسکی پێوەبێ
شیعرێك چون بەژنی ئەوان و حەیرانی ئەوان بیرنەچێتەوە
لە ئاسۆسدا ببێ بە تاوێرە بەردوو
لە کێوەڕەشدا ببێ بە بەرگێلەو
لە دەربەندا ببێ بە نەخشی سوورو
لەناو خەڵکا ببێ بە نان و، بە ئاوێنەی ئەوین و
دوور نزیك ببریسکێتەوە.
من ئەمشەو لەم گۆڕستانە روناکەدا
گوێ لە حەفتاو دوو شمشاڵی شەهید ئەگرم.
لە دواییشدا بۆ سبەی شەو
ئەگەڕێمەوە ناوتان و بەدرێژیی وەکو سیروان
بەدرێژیی وەکو ئەنفال
هاژە بە هاژەی زامیان و
تنۆك تنۆکی چاویان و

لەرە لەرەی هەناسەیان..ئەگێڕمەوە.
ئێوە بڕۆنەوەماڵێ و لەگەڵ پاییز
سەرکەن بەدڵی یەکتردا
منیش ئەچم بۆلای یارانی راپەڕین و
بۆلای عاشقانی بەردو
نیشتمانی شیعرەکانم!.

# ئەو پیاوەی بووبە تاڤگەیەکی
# تری "زەڵم"!

1998

لە وەیشوومە چەمووش و چڕو پڕەکانی ساڵانی بێ و ڵەت و
ئافاتی بە ژاروژەنگ و تارووماری سەر دیجلەو فوراتدا،
لە مێژووی بە چەپۆکانی خوێندا،
لەژێر ئاسمانێکی بە تەڵزمی ئاسنیندا،
وەختێ "با" ئەبوو بە چەقۆ
بە دەمە تەورو، گەواڵە هەور، بە دڕندەو تەم و مژ
بە تابووت و دڵۆپە باران بە کەڵەپشکۆ،
بە درێژایی لاواندنەوەی سەر بەرەو خواری ئاوو
سنگ کوتانی کەنارە قوڕاوییەکانی کۆست
هەر لە مانگی کوژراوی بەدەمدا کەوتووی ناو بەفری کێوانەوە
تا ریزە گۆڕیچەی مەشحوفەکانی ناو ئەهواری خڵتانی ترس‌وبیم..
تا شەپۆلە قژ ڕنراوەکانی دوو ئاوانی حەپەساوی قوڕنە...
بە درێژایی هەنیسکی چەقەنەبردوو..

پڕمە پڕمی گابەردی سەر هەورازو،

زریکە درەخت و

پێدەشتی زراوچووی هەڵتۆقیو بە هەوری گردۆڵکە...

بە درێژایی کڕووزانەوەی نان

بە درێژایی هەناسە بڕکێی کلۆڵی و

بە درێژایی تاوان

لە گرمۆڵەبوونی شەوی کەسیرەی ئێرەوە

تا ئازارە گرنج گرنجەکانی دارخورمای بەسرە

تا ئەو کەنداوی غوربەتەی کە شیعری "سەیاب"

تیا ئەبوو بە بەلەمی چارۆکەداری حەسرەتێکی سپیی و

تیا ئەبوو بە ئاوازی رۆحی رەوان...

لە تووناو توونی ئەو سامی دۆزەخ و

لە نێرینەی ئەو گەرداوە نەفرەتیانەدا

دەگمەن بوون ئەو گەردنانەی لە بێشەی قەمەداو

دەگمەن بوون ئەو دەست و پەنجانەی لەشارە نێزەی بەعسداو

لەبەر دەم دۆڵپای پایتەختدا..

نەبنە خاکەسەرێکی پەشموردەو وەکو لقی شکاو کەچ نەبن و

نەچنە سەر خوانی سوڵتان...

دەگمەن بوو قەڵەمی دەم بە هەورە تریشقەو

دەگمەن کتێبی کەڵ مل و شەوی رەفزو

کەم بوون و نەوازەبوون:خەمی گڕدار!

لەنێو ئەو هۆبەهۆی حیلانەدا، لە چنگاونی

كینەو ئەویندا، حیلەیەك هەبوو،
گڤەو وژەی وەك نەیزەكێكی سوور
پاردەكانی بێدەنگیی ئەسمی و ترسی كوناودەر ئەكردو
ئەبوو بە ئەسپێكی باڵدار.
لە نێو ئەو شەوە یاخیانەدا
شەوێك هەبوو، شەوی ماناو، شەوی قەلاْو
شەوی زاوزێی شاخ و رووبار
"هادی العلوی"هاژەی دەنگی لە دیجلەوە هێناو
سووربوونی باوەڕی لە كەللەو سنگی تاشە بەردەكانەوەو
خۆشەویستی وشەیشی لە نانی چاو بە فرمێسكی هەژارانەوە
خواست و ئازایەتیشی لە پێكەنینی سێدارەكانەوە،
پاكێتی لە دڵی نەورەسەوەو
بەژنی ورەیشی لە دارخورما چاو قایمەكانەوە هێنا...
كە ئەینووسیی دەفتەرەكانی فوراتی لەبەردەمدا ئەكرایەوە
دڵی منداڵی بۆ ئەبوو بە قەڵەمدان و ئازادیش ئەبوو
بە گوڵدانی سەر مێزی:
ئەو بە نووكی حەقیقەت و
بە تیرێژی روناكیە خوێناویەكان ئەینووسی.
قوڵە قوڵ ئەوینی بەغدای تیا هەڵئەقوڵیو...
تڵە تڵ لە ئاگرە هەرە دوورەكانی كولتووری دنیادا
پژوپۆی ئەهاویشت هەتا بن شوورەكانی چین توێژ بە توێژی
زمان و دیرۆك و پەندی هەڵئەكۆڵی.

ئەی ناسۆر لەوەختی فڕینداو!
ئەی ئاوارەیی لە وەرزی بەخشیندا
تۆ بەرهەیوانی عەقڵێکی پڕ لە هەتاو بوویت، پۆل پۆل
هەمووباڵندەکانی کەلەپوور لەدوور دوورەوە
لە زەمانی پێغەمبەرانەوە ئەهاتن و روویان تێ ئەکردیت و..
تۆ ئەستێرەیەکی گەڕیدەی مرۆڤایەتی بوویت و
کۆڵە پشتت پڕی بوو لە ئاوێنەکانی ئازاری ئێمەو
پڕی بوو لە مرواریەکانی ئەسرینی ئێمەو
پڕی بوو لە هەناسەی رەنگاڵەمان.
تۆ بەردەوام گردی نەهێنی نەخشەیەکی بەرینت هەڵئەکەندو
هەموو جارێ گەوهەرێکی شەو چراغت ئەدۆزیەوە،
هەموو جارێ لەتونێلی ژێر چیای بیرێکەوە سەرت دەرئەهێناو
چراوگێکی تازەت ئەگرت بەدەستەوە.
تۆ قامکی ئەو هەقە بوویت ئەچوویت بەچاوی بکوژانی روناکیدا.
زوڵم لەهەر مەملەکەتێکدا بوایە تۆ لەوێ ئەبوویت
تا بچیتەوە بە گژیاو یەخەی تیژی شمشێرەکان بگریت،
برسێتی لەکوێ بووایە
لەهەر هەرێمێکی سیس بوون و هەڵوەریندا بوایە
تۆ لەوێ ئەبوویت
تا چەوسانەوە ڤاو بدەیت و گوڵە گەنم ماچ بکەیت و
بە بەژنی سبەینێدا هەڵژنی
لەیەك وەختا تۆ لە ژانەکانی کوردستاندا

تۆوی کازیوە بووی ئەرِسکایت و
هەر هەمان کاتیش لە دەمە برینێکی خواروی ئەفریقادا
چرۆت ئەکردو گوڵت ئەگرت و باڵات ئەکرد.
تۆ لەسەری قولەرِەشێکدا ئەبووی بە برووسکەو
هەمان کاتیش لەبیابانی پێست زەردەکاندا لێزمە بوویتو داتئەکرد!
تۆ بەشەو پەنجەکانت هەڵئەفرِین
بۆ ئەوەی لەدەوری سەری گیڤارایەك
زەماوەند بکەن و ببن بە ریزە مۆمی داگیرساو و
بە رۆژیش بەدوای توحفەیەکی زماندا
گمەیان ئەهات و تا هیندستان باڵیان ئەگرت!
بۆ یەکەم جارو دواجاریش
لە بینینی بەورشەو پرشەی بەیەك گەیشتنێکی
پرِ لە سەوسەن و وەنەوشەی قسەتا...
پرِ لە چەخماخەی سووورباوی قسەتا...
لە سەرەتای سووتانی غوربەتی منداو بەر لە 11ساڵ
لە گۆشەیەکی تەریکدا و لەسەر مێزێکی دووکەسی،
تایبەت بەدوو مەراقی هاورِێو دوو هەڵقرچانی هاودەم،
لە گازینۆی هاڤانای شامدا،ئاوێنەبەند بە شیعرو
بە باڵای شپرزەی شاعیران:یەکمان ناسیی
کە دانیشتین ئەودیومان باران و ئەمدیومان ساماڵی تابلۆ بوو
من هێشتا سەرو قژم بۆنی پوونگەی گوێ
جۆگەلەکانی بەرگەڵوی لێ ئەهاتو

هێشتا لە چاوم دا دوورە ئاگری سەر
لوتکەی پێشمەرگەی تیا ئەبریسکایەوەو
هێشتا گوێم زرنگەی پاوانەکانی پێی ژنە رەوەندو
زرنگەی زەنگی ملی بەرخۆلە سپیو سۆڵە عەجولەکانی ناوبژوێنی
بەگیاو گوڵی تیا ئەزرنگایەوەو
هێشتا شیعرم هەر دوکەلاّویی بوو،
هێشتا قسەم هەر خوێنی مندالاّنی
دۆڵی جافایەتی گرتبووی کە یەکمان ناسیی!
تۆ لەو وەرزەدا
لە تۆمارێکی ئەسمەری باریکەلەی سەر تاقی ئارشیف و
بەچاکەتە خەت خەتیەکەی بەرتەوە،
لە پڵنگێکی لاوازی بزۆز ئەچوویت.
لە کونە بچووکەکانی هەردوو چاوتەوە.
بە دەیان باڵە تیشکی تیژ ئەهاتنە دەرێ و
لەبەردەمما یادگارو خەونیان ئەچنی.
لە دەمتەوە،هەوری مانا دائەباری و
لە جولاّنەوەی هەردوو دەستتا،نائومێدیی گەلاّکان ئەوەریی.
منیش لەو وەرزی دابڕانەداو
لەو دەمەدا،لە تازە نەونەمامێکی هەڵکەنراو ئەچووم،
لەشیعرێکی هێلانە لێ شێواو و لەماسی نێو تۆڕێك و
لەخەندەیەکی تەپ و تۆزاوی و لە دڵۆپە فرمێسکێکی وێڵ و
لە پەڕی گوڵەبەڕۆژەیەکی بابردوو ئەچووم،

بەلاّم تۆ دەمێك بوو لە گەڵ گێژەنەكانی ئاوارەییدا ئەخولایتەوە،

دەمێك بوو بوو بووی بە قاوەی كوتراوی بنی تەنیایی و

دەمێك بوو گژەبای مەنفا پەڕەپەڕە هەڵیئەدایتەوەو

زەمانێ بوو دیجلە خەوی پێوە ئەبینیت و

زەمانێ بوو كۆترەكانی فایەق حەسەن و

نەصبی ئازادیی جەواد سەلیم بیریان ئەكردی!

وتت:ئەم ئێوارەیە بە دوو قۆڵیی

ئەچینە لای ئەو پیاوەی مامی شیعرتە

ئەچینە لای جەواهیری.

دەمەو عەسرێكی بڕۆنزیی

لەلێواری شەقامێكی بۆنخۆشدا یەكمان گرتەوەو بووین بەسیان

تۆو باران و من...

ئیتر هەرسێكمان ورد ورد ڕێمان ئەكردو

بەدەم ڕێوە شام بریسك و هوڕی ئاوێنە

ڕەنگینەكانی لەشی خۆی ئەدا لە چاومان،

ژنی جوانی شام، فریشتە سپیەكانیش،

بۆ منی هێشتا لە جوانووی كێوی چوو،

لە سیحرە تازەكانی خەون بوون و لە زنەی شیعروژیان.

بەدەم ڕێوە تۆ پەرۆشی دوا هەواڵی بازەكانی ناو بەفرو

پەرۆشی دەنگو باسی دوا دڵۆپە خوێنی سەر گەڵا وەریوەكانو

پەرۆشی دەنگ و باسیی ڕووبارە كوژراوەكانی ناو دەربەندو

پەرۆشی هەواڵی ئاوێنە شكاوەكانی هەتاو بووی.

منیش لە یەك كاتدا گوێم لە هەردووكتان ئەگرت
لە شیعرە هێواشەكانی باران و لە لرفەو كلێپەكلێپی
ئاگری جەستەی تۆ...
لە دەرگای پیرە شینە شاهۆی شاعیرمان داو
چووینە ماڵی دوا كوڕی موتەنەبی و
چووینە ناو دوا ئیقاعی دەنگی موتەنەبییەوەو
دوا رستەی ستوونیی ئەومان كرد
بەقووللەی خۆمان.
ئیتر لەگەڵ سەرێكدا كە كوردستانی لەسەر نوسرابوو.
تا ئێوارێ بووین بە گوڵ و بە رێحانەی دەوری
ئەو و حیكایەتی ئاگردانی تاقە ژوورێ.
ئێمە تەنیا بووین،
هەر خۆمان و كۆستەكانمان و خوایەكی بێ باك.
ئێمە بێكەس بووین
هەرخۆمان و قوربانیەكانمان و رۆژهەلأتێكی بێباك
ئێمە دەشتێكی شین هەڵگەڕاوی پرسەداری چۆڵو هۆڵ بووین
هەر خۆمان و هەڵەبجەیەكی خنكاو و جیهانێكی بێباك.
كاتێ تۆ لە دووررا چون گەرداوێكی زەریای سپی ناوەڕاست
هەستایتە سەرپێیان و هەردوو دەستی زمانی عەرەبی خۆت
پڕكرد لە هەورە تریشقەی بەرائەتێكی دۆزەخین و
گرتتە دەموچاوی نەفرەتینی مێژووی خۆت،
گرتتە تاوانی ڕەگەزەكەت و

گرتتە تەخت و بەختی دەسەڵاتی ژەهراوی و
گرتتە جەنگەڵی تاوان!
هەڵەبجەو هادی
هەڵەبجەو بەرائەتێکی بوومەلەرزە ئاسا
ئەو دوو ناوەن بە جووت...
وەك جووتە سروودێ
جووتە پلوسکێ
جووتە کارێزێ
ئەڕژێنە ئەستێرکە بچوکەکانی
گیانی منداڵانی ئێمەوە.
ئەی "بەرائەتەکەی "
پڕ لە رەهێڵەی پاکژی و
پڕ لە بەرقی بوێری و
سەررێژ لە نوری ئازادی و
لێوان لێو لە حاشاکردنی حەقیقەت لە دەمامك و
یاخی بوو لە شوورەی باوك سالاریی
یاخی بوو لەزمانی لمینی پادشاهانەی نیمچە دوورگەی عەرەبو
یاخیی بوو لە هەموو شمشێرو رم بەدەستانێ
ئەی ئەو پیاوەی گەردەلوولێکت لە چەند دێڕێکدا هەڵکردوو
باهۆزێکت لە چەند وشەیەکدا بەرپا کردوو
تۆفانێکت لەپەڕە کاغەزێکدا هەستان و
لەسەر منداڵەکانی من،

لەسەر پەپوولەکانی من،
بەر لەعنەتی دنیای نەوت و هەمووی کەوتی!
هەڵەبجە تۆی خۆش ئەوێ
چونکە لە ئاویلکەی دار هەنارەکانیا بەر لە دنیا
تۆ چوویتە ژوورسەری و
سوورەتی بەرائەتەکەت کردە گەردنی گوڵەکانی و
هێشوویەك پەیڤی دڵدانەوەی عاشقانەت
بۆ کرد بە چل چرای کۆتەڵی کۆستەکانی
وا ئێمەیش من لێرەوە، لە تەنیشت باخە خۆڵەمێشییەکانی
هەڵەبجەوە،لە تەنیشت گۆڕستانی ئەو ستران و ئەستێرانەوە
کە بەجلی خۆیانەوە، بەجلی ئاوازەوە، بە جلی جریوەوە نێژران،
لە سێبەری نسرمی چلەیەکدا کە چل رۆژە هەتاوی لێ نادات و
چل رۆژە وەك کتێبێکی نەکراوەو چون پەپوولەی
وشکەوەبووی ئەلبومی یادگاری تێم ئەڕوانن.
من ئەمڕۆ لەم
چلەیەدا ئەتکەم بە حەرفێکی بزوێنی تازەی زمانەکەم و
ئەتخەمە گیانی ئەو وشانەوە کەماناو فۆرمی نوێ بتەقێننەوە.
ئەتخەمە ناو ئەو شیعرانەوە کە رووبەڕووبوونەوەیان
لەگەڵ جەلادەکانی جوانیو راستیدا وەك رووبەڕووبوونەوەی
چراوگ و تاریکی و چریکەو بێ دەنگیی وەهان.
من ئەمڕۆ لەم پەخشانە شیعرەدا تۆ ئەکەم بە مێرگی هەتاو و
خۆشەویستی زارۆڵەکانی ولآتەکەشم بە کانیاو

لەم زەمینانەدا تۆ ئەکەم بە گڵۆپ و دەنگم بە نامە
لەم شەقامی وێرانەدا تۆ ئەکەم بە سوورە چنارو
خەم بە شمشاڵ و عەتف بە ئاگرو سووتانم بە سەما
ئەی ئەو پیاوەی بووی بە تاڤگەیەکی تری سەرچاوەی زەڵمم!
تۆ لەو تاقانە دارخورمایانەیت
کە ئەتوانێ بەبێ پرس بێیتە ماڵەوەو لەدەرگای
ژوورم نەدەیتو گیانم بپشکنیو
جلی شیعرەکانیشم لەبەربکەیتو
دەم بنێی بە ئاوی رۆحیشمەوە!
لە دەرەوەی ماڵەکەیمنیش!
وا هەنووکە داربەڕوەکان لەسەر کلاوەکانی خۆیان
ناوی "هادیالعلوی" ئەنەخشێنن و
لە قرچە قرچی غوربەتیشدا لوتکە دەست ئەباو
پڕ بەهەردوو مشتی بەردینی وردە بەفری رنوکانت تێ ئەگرێو
شاعیران بە ئاوی تریفە شیعرت بۆ ئەنووسن و
کەوەکانمان قاسپەقاسپی بەهاری خۆیانت پێشکەش ئەکەن و
مەولەوی لە پەپوولەکانی ناو ریشی خۆیت بۆ ئەکا بە دیاریی و
گۆرانیش بە خۆی و پەلکە رەنگینەیەکی گردی گولانەوە
دێت بەپیرتەوە.
بڕوانە ئەم وەفا کەسکەی ولاتی عاشقان
بڕوانە! لەسەر یاڵە پشت کووڕەکانەوە
وا سنەوبەرەکان بانگت ئەکەن!

منداڵەکانمان لەپۆلی خوێندندا هەڵۆێستەکانت رەسم ئەکەن..
غەریبیت رەنگ ئەکەن! ژنەکانمان
شامورۆی ملوانکەکانیان ناو ئەنێن
"هادی العلوی"
هەژارانی کوردستان بە رەنگی زەردیان
لەسەر رەنی گوێ رووبارەکان ئەنووسن
"هادی العلوی"
کانی عاشقان بە ئاوەڕۆی حەسرەتی خۆی ئەنووسێ
هادی العلوی... هەر کاتێکیش باڵندەکانمان بگەنە شام
دوای خول خواردنیان بەدەوری گومەزەکەی رۆحی مەولانەدا
چینەی ئەوینیان ئەبەنە سەر خۆڵی مەزارەکەت و
جریوەو جووکەیان بە کێلەکانتا هەڵئەواسن..هادی العلوی
منیش بۆ خۆم کە ئێستە رۆیشتمەوە
هێدی هێدی بە گڕی شیعرێ روناکبیری و ئازایەتیت
بەسەر یەکدا ئەتوێنمەوە و پەیکەری پچکۆلانەی
لێ دروست ئەکەم...بچکۆلانە هەر ئەوەندەی
لە گوێچکەلەیەکی دڵما جێی بێتەوە
لەوێدا دای ئەنێم، مامۆستام هادی العلوی!

# ئەستێرەیەکی هەشت نهۆم!

1999

من وشەی لە پەروانە چووی بەردەوام خول خواردووی
بەدەوری تاڵە تیشکی ڕسکاو لە مێرگی لاپەڕەدا،
منی پەلکە گیای دەم بە شنەی
خوێندنەوەی تەڕو پاراو لە دەشتی لاپەڕەدا،
ئەمە یەکەم جارم نییە گوڵەبەڕۆژەی سەرم
لە کێڵگە زیوینەکانی پڕ لە بریق و باقی دەنگ و ڕەنگ و
پڕ لە گۆمی مانای "کوردستانی نوێ "هەڵبکێشم و
لە دوایشدا دڵۆپ دڵۆپ خۆشەویستی و
تکە تکە بیرەوەریم لێ بچۆڕێتەوە،
ئەمە یەکەم جارم نییە، ماچم بکەم بەپەپوولەی باخی لاپەڕەکانی و
چاوانم بکەم بە دوو چراوگی دیاریی دەست و
یەکێکیان لەسەر ڕەفەی هەواڵەکانی لاپەڕەی یەك دابنێم و
ئەوی تریشیان بە باڵای زراف و قژی ڕەشی
دوالاپەڕەدا هەڵواسم.
ئەم جۆگە کەسکە هێشتا لە سکی شاخدا بوو

من گوێم لە پووکە پووکی ژانی بوو.
ئەم جوانووی خۆزگەیە هێشتا نەزابوو
کە "ڕێبازی نوێ" لە دۆڵی جافەتیداو
لە گەرووی بەرگەڵوودا ئەیحیلاند و
ئێمەیش لەسەر ڕەوەزەکانەوە
گوڵی ژاڵەی نووسەری کوردستان مان تێ ئەگرت و
لە قەرە چوغەوە بۆ بەرایی دەشتی شارەزوور
زنجیرەچرای کتێب و ئاونگاوی شیعرو
چریکەی چیرۆکمان بە ئاسۆدا هەڵئەواسی.
ئەم هەورە هێشتا ئەیگرمان
کە ئێمە لە ئاوەژێو سیروانەوە
گۆپاڵە باران و لێزمەمان ئەبینی و
ئەچووینە بەر تاڤگەی خەونەکانی.
لەو دەمەدا...ئێمە لە نێوانی هەموو دوو تاشەبەردێکدا
وشەیەکمان ئەڕواند.
ئێمە لە سەهۆڵبەندانی دەربەندەکەی بەرگەڵوودا
بەگەرمایی خوێنی چاپخانە، زمانی کوردیمان گەرم ئەکردەوە.
ئێمە لە سیاساڵی نەهاتیی و هەژارییەکی وەك داسك و دەرزیدا
کە پارووی ناو دەممان ئەکرۆزایەوەو
چون سەرو ملی کەوێکی برسیی بەحاڵ نووزەی لێوە ئەهات..
لەو دەمەیشدا..دەستی ڕاستمان تفەنگێك و
دەستی چەپیشمان ڕۆژنامەی گرتبوو.

ئێمە بەگەورەیی فێری خوێندنەوەی رۆژنامەکانی ژیان نەبووین.
ئێمە بەگەورەیی و هەر لە وەرزی تێرو تەسەلیداو
لەسەر قەنەفەوە فێری دڵداری کردن نەبووین
لەگەڵ مەرەکەب و چاپخانەو گۆڤارو
لەگەڵ قەڵەم و کاغەزو وشەدا..لەبن دەوارەکانی نەبوونیدا..
ئێمە نانێکمان لەگەڵ وشەدا ئەکرد بە دوو کەرتەوە
خوێنەری ئێمە لە پێشدا هەر بەفری قەندیل بوو
خوێنەری ئێمە لە پێشدا هەر خوێنی شەهیدو
خوێنەری ئێمە لە پێشدا هەر چاوی دووکەلاوی
گوڵەکانی بەر قوتیلکە بوو.
ئێمە لە ئەنفالدا جارێك پیرەمەگروون و جارێ سەفین
ئەبوون بە رۆژنامەمان و
جارێکی تر دەشتی گەرمیان گۆڤارمان بوو.
دەراڵی شاخ منداڵدانی رۆژنامەی ئێمەو
برسێتی لانکەی حەرفی ئێمەو
کۆڵە پشتی رەزاڵ رەزاڵی ئەوسای "پ.م"ەکانیش
جۆلانەی شیعری ئێمە بوون.
ئێمە لەو شەوانەوە هاتووین و
گەیشتووینەتە چل چراکەی کوردستانی نوێ.
من یەکەم جارم نییە لەم گوڵجاڕی یادەدا
بۆن و بەرامەی ئەوین بێ بەسەرماو
ئاوێزانی ئەم ئەستێرە هەشت نهۆمە ببم.

له یەکەم لقی ئەم دارهەنارەوە

من قۆزاخەکەی کرمی ئاوریشمی پەلکی ئەو بووم.

له یەکەم باڵە فڕێتەوە. ئەی باڵندەکەی له شاردا سەرجووقاو

شیعری من هێلانەو له یەکەم پەنجەرەتەوە تۆ قوببەو

من هیلاله نەحیفەکەی نالی بووم.

له یەکەم تەوقەوە پەنجەکانم فڕین و

لەسەر پەرچەمت نیشتنەوە.

هێشتا یەك ساڵان بووی، تازه پێ ڕەوکه بووبووی

کەچی هۆنراوەیەکی تەمەنی سیو پێنج ساڵەم هات بەپیرتەوە.

تۆ بۆیه خۆشەویستی

چونکه یەك رۆژ له ژیانتا نەبووی بەئاوێنەی

بەردەمی دیکتاتۆرو دوژمنان!

بەلاّم ئەی رۆژنامەی له ئازار زاوی حەوت ساڵەمان!

ئەی ئەو پۆستی نیگایانەی هەموو رۆژێ لەگەڵ نانی بەیانیاندا

ئەگەیتە لامان و لەگەڵ هەتاوو لەگەڵ باران و لەگەڵ بەفرو

لەگەڵ "با" دا رۆژباشمان لێ ئەکەی.

ڕووی کلێپەکانی شیعرم له تۆیه!

تا گەورەبی لێپرسینەوەی من زۆرتر و رەخنەم توندترە.

ئەو نازەی له منداڵیتا ئەمکێشا و به هەموو خەوشێکتەوە

له باوەشم ئەگرت..له گەورەبوونتا نایگرم!.

له ئێستەدا..چاو له بچووکترین دێڕی دوکەلاّویی و

چاو له بچوکترین هەڵەتی رێگات و

چاو لە هیچ پەنجەرەیەکی تاریکت و
چاو لە هیچ ریایی و مەراییەکی وشەت ناپۆشم.
گەورە توویت و رووبەروبوونەوەیش لەگەڵتا گەورە بوو.
لە هیچ رستەیەکی لووت بەرزی دوور لەم خەڵکەت..نابورم
هەر گوێی خۆکەڕکردنێکت لە هاواری برینەکانم..
شەقاوێك لێم دوور ئەکەویتەوە.
تۆ بە ئازایی حەرفەکانتەوە خۆشەویستی.
تۆ بە جودایی سەکۆی بیروباوەڕی ئازادەوە..
بە لەیەك نەچوونی سروودەکانەوە..
بە جیاوازی رەنگەکانەوە..گەورەو رووناکی و
تا ژمارەی بەندەری دەریاچەکانت هەمەرەنگ تربێ
لای ئێمەیش ئەوینت بەرفراوان و
جوامێریت بەرینتر ئەبێ.
تۆ بە شەپۆلە رەنگینەکانی دیالۆگ و
پارکەکانی دیموکراتییەوە جوانی.
تا دەرزی ئاژنی خەونەکانی خۆت بکەیت و
تا تۆڕی رەخنەی خۆت لە خۆت قایمتر لە جەستەتەوە بئاڵێت
ئاسۆگەی ئازادیت رونتر و لاپەڕەت ئەبێتە بەهاری ناو بڕواو
بژوێنی ملیۆنان گوڵ ئەبێت.
نزیك بەرەوە نزیکتر لە دووکەڵی کاروانسەرای ئەو هەژارانەی
کە لە زامەکانی ئەنفال و کۆچ و شەڕی ناوخۆوە
پڕزە لێ بڕاو..گەڕانەوە ناومان و جێیان نەهێشتین

نزيك بەرەوەو نزيكتر لەرەشە خەڵكو رەشە خەمو
بەرگی رەشی برینەکان.
من خۆشەویستیت تێکەڵ بە تاڵترین دەرمانی رەخنە ئەکەم.
رەخنەو رەخنەو رەخنە
با بیکەین بە باران و با بیکەین بە مۆم و
با بیکەین بە پشکۆ!
ڕەخنەو ڕەخنەو ڕەخنە
با بیکەین بە پەیژەو با بیکەین بە شاڕێو
با بیکەین بە پرسیاری نوێی هەموو رۆژێکمان و
با بیکەین بە ئاسۆ!
نزیکتر بەرەوە..نزیکتر و نزیکتر..
لە تەمی خەمی سەر ماڵانی هەژاران و
لە نووزەی گوڵە گەنمی نەخۆش و لە سترانی بێوەژن و
لە خانووە قووڕەکان و
لە دەفتەری وێنەکێشانی منداڵان و
لە ژووری نیوە رووناك و
لە سکی نیوە تێرو نیوەبرسی هونەرمەندە نەدارەکان.
نزیکتر بەرەوە
نزیکتر و نزیکتر لە زریکەی خوێنی مافی ژنانی سەر بڕدراوی
چەند جار لە خاچ دراوی چەند جار خاکەسار کراوی وڵاتەکەم..
نزیك بەرەوە بچۆرە ناو ڤیژەیانەوە.
چەقۆکانی سەرگەردنیان بخەرە قەفەزی تاوانی نێو لاپەڕەکانتەوە..

شیعری من بخەرە پەراوێزەوەو
ئەو زریکانەی ئەوان بکە بەمانشێت.
وێنەی من بخەرە دامێنەوەو
وێنەی هەڵقرچاوی ئەو دایکانە لەسەر سەرت راگرەو
بیانکە بە سەردێڕی گەورەو درشت
کە هەڵۆ خوێناویەکانیان لە داوێن کەوتە خوارەوە.
نزیکتر بەرەوە..نزیکتر و نزیکتر لە گۆرانییە قوربانیەکان..
لە کاولاشی گوندەکان.
من خۆشەویستیت تێکەڵ بە تاڵترین دەرمانی رەخنە ئەکەم
ڕەخنەی نوێ بەو رەخنەی نوێیەو
ڕەخنەی نوێ ئەی رۆژنامەی سەردەمی نوێ..
ئەی وشەی شارستانیی.
ئەی درێژترین هێڵی شەمەندەفەری زمانی کوردیی.
ئەی هەشت ساڵ پڕ لە دارستانی شەهیدو
پڕ لە جریوەی لە دایك بوونی نوێو
ئەی هەشت ساڵ پڕ لەگمەی ئاشتی و
ئەی هەشت ساڵ پڕ لەشەونخونی و
پڕ لە هەورازی دێڕو
پڕ لە نشێوی کارەسات و
پڕ لە سروودەکانی راپەڕین.
ئەمە یەکەم جارم نییە، پەڵەت تیا بدەم و، تیاتا بڕوێم و
ناوچەوانت بکەم بە ئاوێنەی بەیانیانیی ژوورەکەم و

گۆشەکانت بە سەرین.
ئەمە یەکەم جارم نییە و لە گڕوگاڵی یەکەم رۆژتەوە
لەگەڵتام و ئەمە هەشت جارە من دێم و
هەموو جارێ لەشیعرێکی شووشەبەندا مانگەشەوت بۆ ئەهێنم و
لەسایەقەی خەوی شیندا سەمای بەفرین.
ئەمە هەشت جارە من دێم و هەموو جارێ
نیوەم ئەبێ بە کاکۆڵی کاکە مەم و
نیوەی ترم بە پرچی زین!

# ژن
1999

هەشتی مارت...خوشکی یەکەم کوڕە قوربانیی ڕاپەڕینە

هەشتیمارت...یەکەم دایکە هەموو ساڵێ یەکەم گوڵ ئەدا لەقژی.

هەشتیمارت...یەکەم خوێندکاری کچە بەهەزاران زمان ئەدوێ.

هەشتی مارت...ژنە هاوسەری حوزەیرانەکەی ئێمەیە.

هەشتی مارت...دەزگیرانی تازەترین شیعری منە!

ئەمڕۆ..چرکەو دەقیقەو سەعات مێیینەن

ئەمڕۆ وڵاتەکەم مێیینەیە، جیهان هەمووی مێیینەیە.

ئەمڕۆ ژیان مێیینەیە.

ئەمڕۆ ڕۆژی زیوییینی...سەروقژ بە پرشنگ و

شانو مل بە پەڕەی هەڵاڵەی تۆیە، ئەی چاوگی بوونمان. ژن!

ئەمڕۆ ڕۆژی تەوێڵ بە بژوێنی

بەیانیانی خۆشەویستی تۆیە. ئەی باڵای ژیان..ژن!

هەنووکە وەختی گۆرانیتە..

ئەو دەمەی چریکەت ئەفڕێ و

ئەوکاتەی خەمی وەنەوشەییت لە کەنار ئەمڕۆی سپیدا

بەهێشوو ئەستێرە ئەگرێ و
ئەو دەمەی باسکەکانت ئەبن بە تاژانی تیشك و
پەنجەکانت بە گوڵە پەمووی بەر زەردەی ئێواران و
سنگت بە گوڵجاڕی مژدە
ئەی کێڵگەی زاوزێی ژیان..ژن!
ئەمێستا رۆژی تافە تافی ئەوینتە
ئەوکاتەی زنەی هەتاوت تیا هەڵئەقوڵی و
ئەبیتە رووباری دایك و شەپۆل ئەداتەوە
دەریاچەکەی مێژووی تۆ!
ئەبێتە تاڤگەی خوشك و هەڵئەپرژێتەوە
بەسەرماندا پرژە پرژی دەنگی تۆ..
ئەبیتە دارسێوی یارو هەڵئەپشکوێ
لە رۆحماندا باخچەی تۆ!
ئەمرۆ کۆ ئەبینەوەچون کۆبوونەوەی هەور بۆ دارژان و
چون کۆبوونەوەی باڵندەکان بۆ خوێندنی نوێ.
ئەمرۆ کوردستان ئەکەین بە تۆ!.. ژن!
ئەمێستا ئەڵقە ئەبەستین و دائەگیرسێین و
بە چواردەوری هەوارەکەی سەری تۆدا:
ئەیکەین بە زەماوەندی ئاگرو
ئەیکەین بە شایی شیعرو
ئەیکەین بە هەڵپەرکێی دارستان و
سنەوبەریش لەم رۆژەدا سەرچۆپیت بۆ ئەگرێ.. ژن!

ئەمڕۆ خۆر مێیینەیەو
بەرد مێیینەیەو قەڵەمم مێیینەو
شیعرم مێ.
هەنووکە بە بارێزەی هەناسەکانی تۆدا
بە گڕەی پێدەشتی هەناسەکانی تۆدا.
کە هەناسەی خاکەو، هەناسەی درەختەو، هەناسەی ئاوەو
هەناسەی شەوو،هەناسەی ڕێ
بەو هەناسانەدا تەلان بەتەلان و بنچك بە بنچك و دێ بەدێ
سڵاو ئەنێرین بۆ کچە قوربانیەکانت
گوڵە هێرۆ کوژراوەکان
ئاوێنە کوژراوەکان
پەنجەرە کوژراوەکان ـــ کچە قوربانیەکانت
ئەو کچانەی بوون بەپەپوولەی کەوێڵو کاوانەکانو. نەهاتنەوە.
ئەو کچانەی بوون بە گوڵە کێویلەو هەنگە زەردەی
ئەو کەژانەو..نەهاتنەوە.
کچە قوربانیەکانت،ئەو مەلانەی، ئەو قومریانەی
بەتەنها لەسەر خوێندنی عاشقانە سەریانبڕین.
ئەو مامزانەی بەتەنها لەبەر بارژنی دڵخوازانە..سەریانبڕین.
ئەو دەم و لێوانەی تەنها لەسەر
شەماڵێکی زەردەخەنەو
ئەو پرچانەی تەنها لە سەر
سەماکردن لەگەڵ "با"ی ئازاردا

بڕییانن و خستیاننە ناو دۆزەخەوە..
سەری بڕڕاوی ژنانی وڵاتەکەم..تەنها هەر گڵۆپی کەفن
لەیەك ساتدا ئەتوێنەوەو بیرئەچنەوەو بزر ئەبن
سەری بڕراوی ژنانی وڵاتەکەم..فایلەکانی تەندەرن
بەسەر خێڵ و بەسەر هۆز و بەسەر خزما دابەش ئەکرێن.
سەری بڕڕاوی ژنەکانی وڵاتەکەم..دەغیلەن و
لە سووچی دیوەخانانەدا دائەنرێن و
تاریکی و تۆڵەو کینەیان تێ ئەکرێت و
لەگەڵ سندووقە فیشەك و
لەگەڵ مەرگا هەڵئەگیرێن..
بەربەریەکان، هەموویان ئەتریقێنەوەو
لەولایشەوە..داد ئەوەرێ!
خودا..ئازادییەو
خودا..ئەوینەو
خودا..جوانیییەو
خودا..هەق!
کەچی لەماڵی خوداوە،لە پشت مایکرۆفۆنی خانەی خوداوە
کۆلکە عەقڵ و کۆلکە مەلاو کۆلکە قسە:
قژی ئازادی ژنەکەم، بەمقەستەکانی رەجم ئەکەن!
خوێنی ئەوینی خوشکەکەم، بۆ خواردنەوەی
تفەنگەکان حەڵاڵ ئەکەن!
جوانیی ژن، سەمای هونەر،پەنجەی پیانۆ،

پێکەنینی پەپوولەکانی دڵدارێتی
نامەی عەشق و گۆرانیەکان، وەکوو تلیاك حەرام ئەکەن
جەهەننەمیان بۆ دائەخەن!
ژن..ژن..ژن
بۆ شووشەی بەندی عەشقیت و باڵەخانەی کریستاڵ و
شمشێرەکانی خەلیفە فەتوای خێڵ و فەتوای والیی
هەموو جارێ دێنە سەرت و وردو خاشت ئەکەن...ژن
تۆ بەژنی رووناکیت و بازرگانەکانی ئاین
هەموو رۆژێ خلّتانی تاریکیت ئەکەن..ژن
ژن ژن ژن
لە بەرزاییەکانی عەقڵەوە
زریانی زانستیان بکەن بە گژدا..ژن.
لە شەقامەکانی شاری عەقڵەوە..
ئاپوورەی قەڵەم و چراوگی رووناکبیرییان بکەن بە گژدا. ژن!
تۆ کچە قژ سوورەکەی شیعری بێکەسی
شەوت پڕە لە برووسکەو لە ڕاپەڕین..ژن
تۆ باڵێکی سروودەکەی "ئەی رەقیب"ی دڵداریت و
پڕیت لە یاقوتی درەوشاوەی ماناو روانین..ژن
تۆ هاوارەکەی "شێخ نوری شێخ ساڵح"یت
پڕیت لە سامالّ و لە کارێزی تەقینەوەو
پڕیت لە گوڵجاڕی ئەوین.
تۆ جیهانیت،لەبەردەمی:دەروازەکەی سەدەی بیست و یەکدا

فڕینی مانگی دەستکردی و تۆقوولبوونەوەی چاوەکانی ئەنتەرنێتی
بۆ ئایندەی ئەم پەیامە..ژن!
لێرەیش
لە سەرانسەری وڵاتی سێدارەو خۆڵەمێش و ئەنفالیشدا
تۆ خوشکەکەی "سنەوبەر "ی قەلاَدزێیت
کاتێ کە تۆ ئەچوویتە ناو گەرووی نەهەنگ و دۆڵپاوە
لەودەمەدا،یەکێك نەبوو لە ژن خۆرەکانی ئەمڕۆ
یەکێك نەبوو لە خەتیبە جەهەننەمیەکانی ئەمڕۆ
ترس زمانی پێ قوت نەدابێت و
دەنگی لەژێر سەرینەکەیدا نەشاردبێتەوەو
ئازایەتیی لە پەنایەکدا گرمۆڵەی نەکردبێ..
ئەمڕۆ ڕۆژی زیوینی سەروقژ بە پرشنگی تۆیە..ژن!
مەکە!سەروقژت کفن مەکە..ژن!
گوڵزار چۆن کفن ئەکرێ
گوڵەگەنم چۆن کوێر ئەکرێ
گژوگیا چۆن بەند ئەکرێ
ئازادیی چۆن زیندەبەچاڵ ئەکرێ..ژن!
سەروقژت.. مەدەرە دەست پارچە پەڕۆیەك..ژن
سەروقژت.. مەسپێرە بە شوی لەچك و
سەروقژت.. مەخەرە تابووتی چارشێوێکەوەو
سەروقژت.. لە تاریکی هەڵمەکێشە..ژن!
سەرت.. مەشخەڵەو

قژت..لاسکی گوڵە جۆ
سەرت..هەوری سکپڕی عەقڵەو
ڕێژنەی پرشنگ مەکوژە..ژن!
سەرت مەخەرە گۆڕی قوماشەوە ئاسمان گرێ نادرێ.
سامالْ زیندانی ناکرێ.
هەر تاڵێ لە قژت شیعرێکەو
هەر تاڵێ لە قژت تەیرێکەو
لە جووڵەو خوێندنیان مەخە..ژن!
سەروقژت بدەرە دەست گوڵی هەتاوو
سەروقژت بسپێرە بە ئەنگوتی باران و
سەرو قژت بدەرە دەست ئەو باهۆزەی
لەدیرۆکی دەربەندەکەی کوردایەتی مامە ریشەو "حەمك" ەوە
هەڵیانکردو بە گەرمیاندا سووڕانەوە
تێکەڵ بە بۆی سملّی ژنە گەرمییانی و
سۆزی دایکی "حەمە رەش " بوون..ژن!
تێکەڵ بە هۆرەی دۆڵی جافەتی و
مانگەشەوی "وەسانان"بوون..ژن
سەرت بدەرە دەست گزنك
با پرچەکانت لەگەڵ هەوای ژیاندا دەست بگرن و
با پرچەکانت وەك باڵی باڵندەکان بکرێنەوەو
شەپۆل بن و هاژەیان بێ.. ژن!
هەشتی مارت.. ژنە ئاوێنە فرۆشێکی دڵدارەو

رووناکی بەسەر وڵاتدا ئەبەخشێتەوە.
هەشتی مارت..کچێکی شەنگەو
بەتریفە لەسەر رووی ئاو شیعر ئەنووسێتەوە.
هەشتی مارت.. کیژێکی جوانی کەرکوکەو
هەموو ساڵێ لەم رۆژەدا
ئەبێ بە کۆترە باریکەو هەڵئەفڕێت و
لە دواییدا لەسەر لێواری پەنجەرەی
زیندانەکەی لەیلا زانا.. بە کاوخۆ ئەنیشێتەوە.
ئەمڕۆ رۆژی زیوینی ژیانتە..ژن
ئەمڕۆ بە شارای قژی تۆدا
جریوە هەڵئەواسین و
ئەچینە ناو ژووری فرمێسکەکانتەوەو
ئەچینە ناو دڵۆپە خوێنتەوەو
جەلادەکانت ئەبینین..ژن!
ئەچینە ناو توناوتوونی زریکەکانی ئەنفالی تۆوە..
بیابانی عەرعەر لە قریشکەی تۆداو
لە دۆزەخی ئەم جیهانەدا ئەبینین..ژن!
ئابلۆقەدانی جەهالەت و گەمارۆدانی خەنجەرو
دۆزەخەوانی دیوانی "بێکەس" و کتێبەکەی"عبدالخالق " و
گوێزانی سەر شادەماری ملی "رشتەی مرواری "سوجادی و
جارێکی دی بکوژانی گالیلۆکەی زانست خوازیی
لە کوشتنی جەستەی "عومەر تۆفیق "دا ئەبینین.. ژن!

له سارای گەرمیانەوە تا کاوانەکانی کوێستان
یەك یەك لە ناو گیانماندا ریزتان ئەکەین، ژنانی ئەنفال!
یەك یەك بە گوڵی ژاڵە ئەتانهۆنینەوەو
ئەتانکەینە ملی کێوبەکێو و
ملی داربەدارو
ملی شەقام بە شەقام
ئەمڕۆ رۆژی زیوینی تۆیە
ئەمڕۆ چرکەو دەقیقەو سەعات مێیینەن
ئەمڕۆ ژیان مێیینەیە..
لەسەر قیژەی راونراوت..ئاگر ئەنێین بەبێ دەنگییەوە.
لەسەر زیندەبەچاڵ کردنی خەون و عەشقت،
ئەبین بە یاسایەکی دەم تیژ
لەسەر هەڵکێشانی دەنگت..ئەبین بە هاواری مێژوو..ژن.
لەسەر تەنیاییت و لەسەر خوێنت..
ئەبم بە قەسیدەی قوربانی و
بە ئاوازێکی خوێناویی و بە قەڵەمێکی شەهید..ژن.
ئەمڕۆ رۆژی زیوینی تۆیە و
ئەمڕۆ ئەبریسکێمەوە چون پێکەنینی زەریاو
منیش شنەشنمە وەك پەرچەمی سەرچاوەی چیا..ژن.
ژن و ژن و ژن و!

# پرشنگی رۆح

# دەستگیر ناکرێ!

1999

ئێرە سلەیمانییەو.ئەوە چەند رۆژە لە چاوانی سلەیمانیدا
تەم و مژی خەمێکی گەورە، خەمێکی سووربا‌وی بە کێنگڵ
باڵای گۆیژەو گڵە زەردەو، بەرپەنجەرەی ژیانمان و
ئاسمانی سەر ماڵانمان و، گەلیەکانی هەناومانی داگرتووە!
ئێرە سلەیمانییەو..ئەوە چەند رۆژە
لە دەربەند باسەڕەکەی گیانی ئەم شارەدا
کەڵە پشکۆکانی ئازارو تۆڵە بەیەکەوە ئەگەشێنەوە.
لەم شارەدا هەموو کەسێ و لە سروشتدا هەموو شتێ
مەراقێکی چاوەڕوانی رەنگ پەڕیوە!
چاومان لێیە " پیرەمەگرون" شاخی دیرۆك، شاخی نەمر
ئەویش چەمۆڵەی بەردینی پڕ نەفرەتی
لە دنیای سۆزانیی ئەنێ و هەردوو دەستی بە گەرداوی
روەو سیمای درۆزنی شارستانیی و پەیکەرەکەی ئەمەریکاوە؟

دەمامكی سەر روخساری گشت ئەوروپا.. هەڵبڕیوە!.

هەمو دڵێك لەم شارەدا:

وەك سێوی سەر لقی بەر تەرزەو باڕێزە ئەلەرزێ و

هەموو دڵێك لەم شارەدا.. دڵۆپ دڵۆپ، خوێناوێكی بەناسۆری

ئەم تەنیایی و بێكەسییەی..میللەتێكی لێ ئەتكێ!.

ئێرە سلەیمانییەو.. درەختەكان لەماڵەكان زویرترن.

شەقامەكان لە دایكانی شەهیدان و

لە بێوەژنی مێردكوژراو..دڵتەنگترن.

گوڵەكانیش لە منداڵان غەمگینترن.

ئەم خەمە:خەمی غەدرێكە، هەموو دنیای پیلان لەكوردیان كرد!

ئەم خەمە:خەمێكی سەراپاگیری نەتەوەییە،

كسپەی برینی كوردستانییەو،

هەورە سوورەو هەموو نیشتمانی داپۆشیوە!.

ئەمە خەم نییە، بۆ نائومێدیو دۆش دامان

بەڵكو حەسرەتێكی هەڵگیرساوی بە لرفەیە.

كە گیانی ملیۆنان كوانوویەتی و

دەروونی وردوو درشتمان جێگەیەتی و

خۆشەویستی كوڕی شاخ و كوڕی مێژووی راپەڕینی

وەك "ئۆجەلان" چاوگێتی!.

ئێرە سلەیمانییەو..شاری شێخەو شاری قودسییەو

شاری بێكەسەو شاری شەهابە و

شاری وشەو، شاری وەرزەكانی ئەوین.

لەم ساتەدا،سلەیمانی و چاوەکانی سلەیمانی

وان لە چاوانی گەریلاو ئایندەیش وا لەناو دەستی ئەواندایە.

لەم ساتەدا،رۆحی شاریش،سروودێکەو

لە زیندانی دوورگەیەکی، دەریاکەی مەڕمەڕە دایە.

لە نێوان ڕووبەڕووبوونەوەی "ئۆجەلان" ی سەرکردەو ئازارو

ئەشکەنجەو مەرگیشدا..

ئەڵێم:سروشتی سومبولێکی مەزنی نەتەوە

ئەبێ لە سروشتی ئەستێرەدا بێ،

لە بەرزییدا بژی و لە بەرزییدا بمرێ.

ورەی سومبولی ئازادیی،ئەبێ لە ورەی کێودابێ.

رۆحی سومبولی راپەڕین،ئەبێ لە رۆحی خەڵکابێ.

لێرە،لە تاریکستانی سەردەمێکدا

لە دۆزەخەکەی ئەشکەنجەدانی جەستەداو

لە ژێرزەمینی بەعسدا

جەللادەکان گێڕابوویانەوە:

ئاسن‌وتبووی"بەڵێ"و بەڵام گۆشتی"شەهاب"وتبووی "نەء".

بەرد وتبووی"بەڵێ"و بەڵام ئێسکی "ئەنوەر" وتبووی "نەء".

دار وتبووی "بەڵێ" و بەڵام خوێنی "جەعفەر"وتبووی"نەء".

ئیتر"نەء"بوو

بە مێژووی چەندین نەوەمان.

لە زیندانەکەی ئەم سومبولە گەورەیەشدا

ئێمە هەمووومان دڵنیاین،لەبەردەمی بەربەرەکانی تورکدا

بەحری مەڕمەڕە ئەڵێ "بەڵێ" و
بەڵام ئۆجەلان ئەڵێ "نەء "
ئەو..بەند کرا
بەڵام وەختێ رووبارێك بەند ئەکرێ
رووبارەکانی تر لە جووڵەو رۆیشتن ناکەون و
سەرچاوە هەر هاژەیەتی.
کە لوتکەی شاخێك ئەگیرێت
سەد لوتکەی تر سەرهەڵئەبڕن.
درەختێکمان پێوەند ئەکەن،لە گشت لاوە،
دارستان و بێشەڵانمان رائەپەڕن.
کە هەڵۆیەك زنجیر ئەکەن،سەدان هەڵۆمان باڵ ئەگرن.
ئەوان "ئۆجەلان" یان فڕاند
بەڵام هەرگیز بەربەریەکان بۆیان ناکرێ
لە ناو گیانی ملیۆناندا،خۆشەویستی ئۆجەلان و
عەشقی خاك و کوردایەتی و تیشکی ئازادیی بفڕێنن؟!
چۆن ئەتوانن شاخ بفڕێنن؟!
مانگی شەهیدان بفڕێنن؟!
شار بفڕێنن؟!خۆر بفڕێنن؟! سروودەکانمان بفڕێنن؟!
چۆن ئەتوانن سلەیمانی و دیاربەکر بەنج بکەن و
چۆن ئەتوانن ئاگری نەورۆز پێوەند کەن و
بەچی چاوی رەشەبامان ئەبەستنەوە؟!
چۆن زریان و شەپۆلەکان کۆت ئەکەن و

چۆن ئەتوانن زەریاچەی وان بگوێزنەوە؟!
بەچی کەلەپچەی باوەڕو هەقمان ئەکەن؟!
بە تۆڕی چنراوی جیهان..هەموو جیهان
"ئۆجەلان" مان..دەسگیر کرا.
بەلاّم ئاخر ئەو شۆڕشەی وا لەناخدا دەسگیر ناکرێ.
سبەینێمان دەسگیر ناکرێ.
ئەم زمانە دەسگیر ناکرێ.
پرشنگی رۆح دەسگیر ناکرێ.
باڵی لاوك و حەیرانمان دەسگیر ناکرێ.
زاووزێی کورد دەسگیر ناکرێ.
ئەم مێژووە بێهۆش ناکرێ و
کەلەپچەیش ناکرێتە دەستی بڕواو هەتاو
ئێرە سلەیمانییەو..سلەیمانی یەك هاوارە
لە ناو گەرووی ئازادیدا،بۆ ئازادیی "ئۆجەلان" و
سلەیمانی هەمان خوێنی دڵی "جگەر خوێن"ی لێ ئەتکێ و
وەك "بێشکچی" هەمان عەشق ئەدا بە خۆیداو
لەگەڵ هەمان خەونا ئەژی.
ئێرە سلەیمانییەو..منیش شاعیرێکی ئێوەم
شاعیری گوڵ و قوربانیی.
لەگەڵتانم
لەم شەوەداو لەناوتاندا ئەنگوستی شیعرم هەڵئەکەم
ئەگەر هیچیشم پێ نەکرێ، خۆ من خەونی پەپوولەیەك

لەبەر شەوقی پەنجەکانما ئەهێنمە دی.

من ئێستاکە "چاوەکانی دیار بەکر" وان لەچاوما

من خۆم ناگریم

ئەوە،ئەوە،لەناو رۆحما بەکوڵ ئەگری!.

لەگەڵتانم

من ئێستاکە وا هەست ئەکەم

لە شەوگاری بێکۆتایی "ئۆجەلان" دا

لەسەر چرپای ئەشکەنجەکەی

بووم بەو گوڵە لۆکەیەی

تەنها بۆ ساتێ سپیم و

لە پڕێکدا ئازاری سوور رەنگم ئەکاو

دامئە پۆشێ گوڵی ژاڵەی تاق و تەنیای برینەکەی!

# بەیانیتان باش..

# راپەڕینتان باش!

1999

بەیانییەکی تری ئەوینەو... ئەوین ئەژی.

بەیانییەکی تری زریوەی ئازادییەو...زریوەی ئازادیی ئەژی.

رۆژێکی تری قافڵەی چراو بەفرە و

چراو بەفری جەستەم ئەژین.

یادێکی تری تەوار و هەڵۆکانی راپەڕینەو

راپەڕینیش وەکوو شەقام و مالآن و رەنگەکانی

ناو بەهارو وەکوو دەنگی منداڵ ئەژی.

پەڕەکانی ڕۆژژمێرم، بەکەناری ئاونگاویی یاددا،

بەلێواری خەونەکاندا

ئەگەڕێنەوە سەرچاوەی سەعاتەکان، ئەو سەعاتانەی

کە لەیەکەم بەیانی راچڵەکینی جەستەمدا، گەردونێکیان لە

پرشنگ دانەوە خولقاندو مەحاڵیان هێنایە زمان،

پەڕەکانی ڕۆژ ژمێرم

سەفەرێکی ئەفسووناویی بە رابوردوی خۆیاندا ئەکەن.

بەپلیکانەی ژمارەکانی خۆیاندا دائەبەزن، ئەچنەوە ئامێزی بەردو
ئەگەڕێنەوە نێو دەرونی شەقام و ئەچنەوە
نێو ژووری زیندانە روخاوەکان.
پەڕەکانی ڕۆژژمێرم یەك لەگەڵ یەکدا دەس ئەگرن و
ئەیکەن بە هەڵپەڕکێی چراخانی مۆم و برین.
بەخێربێیتەوە کازیوەی دەم بەگوڵ و
دەم بە مژدەی.. رۆژی زیوین
ئەی بەیانی پێکەنینی گوڵە گەنم و
ئەی بەیانیی فوارەی تیشك و
ئەی ساتەکانی دیداری
پڕ لە ئەوین.
رۆژژمێرەکەم بەلایتێکی دەستیی بچووکەوە ئەگەڕێتەوە
ئەگەڕێتەوە ئەوسای تاریکستان:
قوربانیەکان پەنگیان خواردبۆوە. ئەموڵاتە دارەبازەیەکی درێژبوو،
ئەموڵاتە خەمێکی پانو بەرین بوو.قوربانیەکان
پەنگیان خواردبۆوەو.
هەموو شتێ خۆی لەترسەوە پێچابوو. گوندەکان نوقومی عەدەمو
شارەکانیش لێوان لێوبوون لەمردنو لەسێدارەو
لەنەفرەتێکی دۆزەخین.
لەسەرانسەری نیشتمانی تاریکستاندا،
لە چەند پزیزکێ زیاتر کەلێرەو لەوێو
لە پرێکدا ئاماژەیەکیان بۆ نەهێنیەکان ئەکرد،

لەوەزیاتر هەموو ڕێکان ڕێی توانەوەو، فەنابوون.

قوربانیەکان پەنگیان خواردبۆوە،

هەموو ماڵێك سەری قوربانیەکی بەدەرگای

حەوشەی خۆیەوە کردبوو.

تۆڵە بەنداوێکی یەخسیربوو.لە(تکریت)ەوە ژەهرباڵی ئەگرتو

لە (تکریت)ەوە چارەنووسی ئاوو درەختو ئاسمانی

ئێمە مۆرئەکرا.

مافییای رژێمی شەڕ، مافییایەك لەو بەربەرییە تازانەی، کەسەری

هەموو گوڵێکیان ئەپەڕاندو هەموو جوانی و

بەهایەکی پیرۆزیان ئەدزی.

لەسیلەی هەموو ڕۆژێکدا، قەنارەیەکیان بۆ

هەتاوێکمان هەڵ ئەخست،

لە سیلەی هەموو دێیەك و لە سیلەی هەموو

شارێکدا گۆڕهەڵکەنی زەردەخەنەو

هەموو درەختێکی ئێمە بوون، بەربەریەکانی بەغدای نوێ،

هاتبوونە قولایی هەستو نەستمانەوە، هاتبوونەناو پارومانەوە،

هاتبوونە ناو پەرداخی ئاوو هاتبوونە ناوکالانەی چاومانەوە،

بەربەریەکانی پەیامی نەمری بەغدا،

چییان نەکرد؟! چی ئەژمێری؟!

سێدارە ئەژمێری؟!

گۆڕ ئەژمێری؟!

گوللەکانی سەرسنگ و دڵمان ئەژمێری؟!

**ڕێچکەی تابووتەکانمان ئەژمێری؟!**

**گۆڕی بەکۆمەڵ ئەژمێری؟!**

**کاروانی ئەنفال ئەژمێری؟!**

**ئەستێرەی کوژراو ئەژمێری؟!**

**قوربانیەکان پەنگیان خواردبۆوە.**

**مێژوویەك بووبوو بەزێ و بەدەریاچەو**

**زێو دەریاچەیش پەنگیان خواردبۆوە،**

**غەزای خەلیفەی ئەمەوی و غەزای جەستەم بەردەوام بوو.**

**غەزای قڕکردن و بڕانەوەم لەناوچەوانم نوسرابوو.**

**غەزای خەلیفەی ئەمەویسەردەم بەردەوام بوو.**

**غەزای بەعس بوو غەزای بەعس.**

**قوربانیەکان پەنگیان خواردبۆوە.**

**هەموو شتێ وێرانەبوو، وێرانەی ژیان بوو.**

**پەڕەکانی ڕۆژژمێرم..چوونەوە بۆلای چراکان.**

**بەلاَم هەر لەو تاریکستان و مەرگستان و خەمستانەدا**

**لەدەراڵی پیرەمەگرون لەئەشکەوتی خلەی گەرمیانو**

**لەتونەکانی توونی باباو لە پێدەشتی قەرەچوغ و**

**لە ماهیەکانی باڵەکدا. هەر لەو دەمەداو لەقوڕگی**

**نەهەنگەکەی بەعسدا.**

**ئەو پیاوانە هەبوون کەچۆکیان بەترس و**

**بە دۆش دامان و بەمەرگ دا ئەدا..**

**دەستەیەك.. دوو دەستە، سێ دەستە**

گوڵ ئەستێرەی ئاوات هەبوون

ریزێك چراوگ و ریزێك مەشخەڵ بوون

وێرانەیان چۆڵ نەكردبوو

ئومێدیان چۆڵ نەكردبوو

دڵی سروشت و دڵی دایكان و

دڵی شارانیان چۆڵ نەكردبوو

قوربانیەكانیان جێ نەهێشتبوو، نالی و مەولەوییان جێنەهێشتبوو.

مابوونەوەو لە كونە چاوی مەترسیدا ئەژیان

مابوونەوەو لە سیەكانی نەهەنگ خۆیدا ئەژیان

بەنێو كەڵبەكانی دێوو درنج دا هات و چۆیان بوو.

لەو دەمەدا:

لەشاری سێدارەكانیشدا، لەشاری بەردەم قەڵاكانی سوڵتانیشدا

لێرەو لە قەڵاتە دێرینەكەی هەولێرو لەدەڤەرەكەی

میری رەواندزداو لەقوڵاییەكانی خەرەندا..

دەستەیەك دوو دەستە سێ دەستە

كوڕی زریانەكانی گۆیژەو سەفین هەبوون

لەژێر زەمینەكاندا،لەژێر شەقامەكاندا لەژێر ماڵەكاندا

ئەوانە خەریكی خۆر دروستكردن بوون بۆ راپەڕین

خەریك بوون، بەیانییەكی تازەیان،لە كەلەكەی تاریكییەوە

دەرئەهێناو خەریك بوون بەهاریان دروست ئەكرد.

لە ژێر زەمینەوە..سەرزەمینیان هۆشیار ئەكردەوە.

لەژێر زەمینەوە..رەگ و ریشەی بڕوایان قایمتر ئەكرد.

لەناو مەرگەوە.. ژیانیان ئەهێناو
لەناو مەرگەوە..لەدایك بوونەوەی تازەیان
دروست ئەكرد.
تیشكە نهێنییەكانی شار..ماڵی نەهێنی ئازادییان هەبوو.
پەیامە نەهێنیەكانی شار چاپخانەی بیری نوێیان هەبوو
بەنەهێنیی روناكییان چاپ ئەكرد.
شەقامە نەهێنییەكانی شار..شارێكی نەهێنی تریان
لەژێر شاردا هەبوو.
لەتاریكیەوە رووناكیان ئەنارده سەرەوە.
لێرەوە "راپەڕین"هات و بێدەنگیی روخان
لێرەوە راپەڕین شەوگاری داگیرسان
لەو رۆژانەوە "راپەڕین " دەستی سوورە هەتاوی لێڕواو.
لەو رۆژانەوە "راپەڕین " روانینی ئایندەی لە چاودا هانی
بەیانییەكی تری ئەوینەو..ئەوین ئەژی.
رۆژێكی تری ژیانەو..ژیان نامرێ.
بەیانییەكی تری عەشقەكەی راپەڕینی داروبەردەو
دارو بەردیش ئەژی و ئەژی.
ئیتر خەونیش بوو بەراستی..
راپەڕین بوو. راپەڕینی جەستە لەكۆت و راپەڕینی رۆح و
راپەڕینی كوردایەتی و راپەڕینی شەوی كەركوك.راپەڕین بوو
سەرەتا پریشكێكی بچووك، بچوكتر لەپەنجەی مۆمی منداڵێكمان
سەرەتا بوو. رانییە دەستی مەشخەڵی خۆی درێژكرد. رانییە

بوو بەچاوگ.ئاسۆس رابوو.کێوەڕەشیش بوو بەکێوی ئاگرستان.
شەقامەکان رابوون.یەکەم بازرەقەی هەتاوو یەکەم هەڵسانەوەی خاك‌و یەکەم زیندووبونەوەی شەهیدو یەکەم گڕبەردان لەترس لەبەر دەرگا سوورەکەی رانییەوە لرفەی کردوو بوو بەگێژەڵووکەی ئاگر. لەجیاتی ئاوو لافاوی سەر، لافاوی لەش،دەستی پێکرد.

ئیتر هیوا تەنیەوە

پرشنگ تەنیەوە..سرودەکانمان تەنینەوە

پەنگ خواردنەوەی قوربانیەکان بەربوون و تەنینەوە

ئاواز تەنیەوە..شیعر تەنیەوە

ئیتر مەشخەڵان باڵیان گرت

ئیتر سەرکەوتن پێکەنی و

ئیتر شەقامەکان باوەشیان کرد بەیەکتر‌داو

ئیتر حەوشەیماڵەکانمان بوون بەیەك حەوشەو

دارستانەکانمان رژانە ناو یەکترەوەو

دڵان هەموو بوون بەیەك دڵ.

بەیانییەکی تری ئەوینەو.. ئەوین ئەژی.

رۆژێکی تری روباری ئازادییەو.. روباریش وەك دەستم ئەژی.

بەیانیەکی تری دڵدارەو.. تا گوڵێکیش لەم ژیانەدا بمێنێ

عەشق ئەژی.

بەیانیت باش.. یەکەم قوربانیی راپەڕین.. بەیانیت باش.

بەیانیت باش.. راستە شەقامی رانیە.. بەیانیت باش.

بەیانیتان باش. ئەی دار هەنارە کوژراوەکانی..ناو راپەڕین..

کوڕانی شار کچانی شار..
ئەی ئەو دەنکە هەڵوەریوانەی پەڕینە نێو ناخمانەوە و
ئیتر ناخمان بوو بەگوڵجاڕی گوڵ هەنار..
بەیانیتان باش.. ئەی ئەو دەستانەی لەرۆژە نارنجیەکانی
راپەڕیندا.. بەرچنەی خاڵیی دڵی ئێمەتان پڕکرد لەنارنجی مژدەو
لەگوڵە لیمۆی چاوی شار..
بەیانیتان باش.. ژنانی ئازادی وڵاتەکەم..ئەی ئەو پرچە
سەرفرازو سەربەستانەی.. ئەو کاکۆڵە ٚ یاخییانەی..لەرۆژە
کەسکەکانی راپەڕیندا.. بووبوون بەئاڵای سەربەچراوگی
ئێمەو چاوی هەمووماننتان پڕکرد لە تیشکی سەوز.. ژنانی وڵاتەکەم
ئەی ئەو گۆرانیانەی بێ ئێوە نە گەروو هەیەو نە ژیان هەیەو
نە جوانیی و نەراستیی.. لەگەردوگوڵی بەیانیی راپەڕیندا،
بەیانیتان باش.. راپەڕینتان باش.. راپەڕین ئازادیی گیانەو..
سەری دیل و قژی دیل و
تاریکییەو قەفەزەو باڵکردنی باڵی فڕین.
ئەی ژنانی وڵاتەکەم،،قژتان وەکوو با ئازاد کەن و
با ببنە باڵی سەرتان بۆ فڕین..
بەیانیت باش.. ئەی گەلەکەم!
گەلی تەنیاو، گەلی قوربانیی و.. گەلی گێژاو و کارەسات
ئەی ئەو جەستەیەی هەموو جارێ کلۆکۆت دائەمرکێننەوەو
بەڵام لەهەموو راپەڕینێکدا لە خۆڵەمێشی خۆتەوە
دیسانەوە ئەژێیتەوە.

ئەی گەلەکەم..ئەی ئەو دارسنەوبەرەی هەمووجارێ ئەتبڕنەوەو
بەڵام لە هەموو راپەڕینێکدا.. سەوزتر ئەڕوێیتەوە.
ئەی گەلەکەم.. ئەی ئەوکۆترەی هەموو جیهان هێلانەکەیت ناداتیَو
هەموو جیهان دانەی داوت بۆ دائەنێن..هەموودنیا دەرت ئەکەنو
کەچی نەئاسمان ئەتوانێ باست نەکاو
نە لەفڕینیش ئەکەوی و نە لە گمە.
بەیانیتان باش.. نەوەی نوێ.. بیری نوێ..
بەیانیتان باش ئایندەکان.
ئەی ڕاپەڕینەکانی عەقڵو زانستو.. ئەی خۆرەکانی مێژوومان.
بەیانیت باش..راپەڕینت باش. کوردستانم!

# سەمای ئاگرو

# سروودی گوڵەکان

1999

ئێوارە، جوانەکان زۆرن. ئێوارە سەوزەکان زۆرن.

ئێوارە پیرۆزەکانیش زۆرن.

بەڵام جوانترینیانو سەوزترینیانو پیرۆزترینیان،

تاقانە ئێوارەکەی نەورۆزە.

ئەو ئێوارەیەی لەکڵپەی زێڕین، تاجێکی شکۆدار ئەکاتە سەریو

لە پڕیشکەکانی بڵێسەیش ملوانکەیەکی نارنجی

بە ورشەدار ئەکاتە گەردنی و

لەلوتکەی مێژوویشمانەوە پیرۆزترین گوڵی ڕوناکیمان

لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەهێنێ.

بۆئەوەی نەورۆز بژی

چەندین بەهارمان بۆکرد بەقوربانیی.

لەلرفەلرفی ئاگرەکەی نەورۆزدا، زیندووبوونەوەی شەهیدانمان

بە چاوی خۆمان بینیەوەو..لەکەسکیی ئەویشدا..

ژیانەوەی جەستەی ئەم خاکەو
بەردەوام بوونی ژیان و زاوزێی سروشت و کردگار.
ئەم جەژنەمان،جەژنی چرابووە،
لەدیرۆکە چاوچاو نەبینەکانی ئەم ولآتەدا.
ئەم جەژنە جەژنی ئاو بووە لە تینوێتی هیوادا و
جەژنی ئەوینیش بووە راپەڕین لەبەردەم تیغەکانی سەر گەردنی
ئەم کوردەدا.
نەورۆز درەختی پرشنگ و درەختی ئاگری ئێمە بووە.
رەگی ئەم بەقولآیی خوێنماندا رۆچووە.
گەلآو لق و پۆپی ئەم لەبەژنی گۆرانیەکانمان ئالآوەو
لەنەورۆزدا یەکەم پێناسەی نەتەوەیی خۆمان دۆزیەوە.
داستانی نەورۆز بۆ منداڵەکانتان بگێڕنەوە!
بۆ ئەوەی لەباخچەکانی ئەم ئاگرەدا لەگوڵی کوردایەتی بچنن‌و
یەك لە دوای یەك بیدەن لەبەرۆکی خۆیان
بۆئەوەی بۆنی ئازایەتی بکەن و بۆئەوەی چاویان
لەهاواری ئەرخەوانیی "کاوە"دا بپشکوێو
گوێشیان بەکۆنترین سروودی ئەم دارو بەردە بکرێتەوەو
بۆئەوەی ببنە عاشقی ئەم هەموو ئازارە زەردو سوورانەو
ببنە دڵداری ئەم هەموو رەوەزی زریکانەو
ببنە پەپوولەی وتەی جوان.
لەنەورۆزدا گوڵ و خۆشەویستی و ئاگر
سێگۆشەی بیرەوەریمانە

گوڵ بۆ زارۆکەکان و
خۆشەویستی بۆ کوردستان و
ئاگریش بۆ دڕدان بەترس و بیم و
بۆمزگێنی سەر ترۆپکی بەلرفەی ئازادیمان.
لەنەورۆزدا.. سروودێك ئەبێ بەهەڵۆی لەبەفر سپیی ترو
باڵ ئەگرێ و ئەچێتە ناو گیانی ملیۆنانەوە.
سروودێك ئەبێ بەتەواری لەیاقووت سوورتروو
ئەچێتە ناو هزری ملیۆنانەوە.
ئەم سرووده باڵگرتووه تخووبەکان ئەسڕێتەوەو
ئەبێ بەگەرووی هەمووومان.
ئەو سروودەی لەیەك کاتدا گۆیژە ئەباتە لای دیاربەکرو
هەولێر ئەباتە ناو وانەوەو زرێباریش ئەباتە لای
چاوەکانی خانەقین.
لەم رۆژەدا.. لەبنجەوە ژیان نوێ ئەکەینەوە
ئەیکەین بەقەسیدەیەکی ئاڵ و واڵای بزۆزو
ئەیبەینە بەردەمی باڵا ئاوێنەکەی رۆحی نیشتمان.
لەم یادەدا.. سڵاوئەکەین بەچەپك، سڵاوئەکەین
بە تیرێژو، سڵاوئەکەین
بەقەڵبەزەو تافگەو بە گوڵەهێرۆو
ئەیاننێرین بۆ ئەو پێشەنگانەی کە لە سەرەتای رێگای وشەداو
لە سەرەتای هەڵکردنی ئازاری داگیرساومانداا
خۆیان کرد بە سەکۆی ئەم جەژنە.

خۆیان کرد بەئەسپی یاڵ گڕداری ئەم پەیامە و
خۆیان کرد بەڕێچکەی یەك لە دوای یەکی وشەی هەڵگیرساو.
سڵاوی نەمریی..سڵاوی "با"و سڵاوی ئاو
سڵاوی گیا..لە پیری قەلەندەرو
لە گیانی ساماڵ ئاسای "پیرەمێرد"
سڵاوی سەیوان و کارێزەکەی وەستا شەریف
لەو پیاوەی بۆ یەکەم جار پەلی نەورۆزی گرت و
لە ماڵ هێنایە دەرەوەو بردیە سەر گردەکەی یارە.
لەو پیاوەی جوانترین سروودی بە باڵای ئەم جەژنەمان بڕی و
لە شەبەقی زامەکانمانەوە پرشنگی یادکردنەوەی خواست و
بیرەوەریمانی بەم رۆژە پاراوکرد.سڵاوی نەمریی لەو دەستە
پیرۆزانەی ئاگری ئەم جەژنەی بۆ کردین بە دەرگاو پەنجەرەی
بیرو هۆشمان و رووناکیی کردینەوە.
ئێمە ئەم ئاگرەمان لە رۆحدا کردۆتەوە.. بۆیە ناکوژێتەوە.
ئێمە ئەم جەژنەمان تێکەڵی خوێنمان کردووە.. بۆیە بیرناچێتەوە.
ئێمە نەورۆزمان لەگلێنەی چاودا هەڵگرتووە..بۆیە دوارۆژ ئەبینین.
ئەی گەورەترین ئاگر بەخێرهاتیتەوە.
ئەی مەزنترین ئەوین بەخێرهاتیتەوە.
لە تۆدا مێژوویەك ئەبریسکێتەوەو
لە تۆدا قوڵە قوڵ ژیان هەڵئەقوڵێ و مردن ئەمرێ‌و
لە تۆدا کۆتەرەی لەشمان سەرلەنوێ ئەڕوێتەوە.
مەزنیی تۆ لە یەکگرتنی هەموو پەنجەکانتایە.

وەختی هاتنی تۆ
وەختی پێکەنینی هەموو سیماکانە.
وەختی تریقانەوەی هەموو رەنگەکانە.
وەختی هەڵپەڕکێی هەموو گوڵەکانە.
هەر لە هاتنی تۆیشدا بوو بۆ یەکەم جار کەرکوك و گڕی تۆ
کەرکوك و خۆشەویستیی تۆ..کەرکوك و بەژنی کەسکی تۆ
تا چەند رۆژێ بوون بە لاولاو و پەنجەرەو
ئاوێزانی ئازادیت بوون.
لە هەر دڵێکدا نێرگزێ بڕوێ تۆ لەوێی.
لەهەر چاوێکدا تیشکێ هەڵفڕێ تۆ لەوێی.تۆ نەورۆزی
بەقژی سەربەستی ژنانەوە پەڕەی هەلاڵە و ئەوینی
لەسەر لێوی ساواکانمان..باڵەکانی پەپوولەی.
لەگەرووی خوێندکارو..لە قەڵەمی گوڵ بەدەمی نووسەرانیشدا
"شەبەقی ئەمڕۆژی ساڵی تازەیەی"
لەسەر مەزاری شەهیدان..وەنەوشەی چاوتەڕی و
لەلای شاعیر وشەیەکی پیرنابیت و لای هونەرمەند
شانۆیەکی:گولاڵەیی.
تاسەمای کلّپە بمێنیّو سروودی رۆحمان بمێنیّو شەقام بژی
تۆیش ئەمێنی.
ئەی نەورۆزی تێکەڵ لە باران و هەتاو
تا ساڵێکی تر دێیتەوە،، سنەوبەرین لەسەر رێتاو
دەس بەچرا رائەوەستین

ئەی سەوزە ژن! تا دێیتەوە گوڵدانی بەژنی هەمووومان

چاو لەرێگەی چەپکی گڕتە..لە ئیستەوە

ئەی نەورۆزی تێکەڵ لە باران و هەتاو

چاوەڕێتین!.

# گەرمییان و دارژانی رۆح
1999

ئەم پێدەشتە بە گڕەیەو ئەم ژیلەمۆی خۆڵە،
پێستی کام قەسیدەی سووتاوو کام مێژووی هەڵقرچاوە؟!
ئەم بەرایی گەرمێنە چ کڵپەیەکی تیا زاوەو؟
چ گێژەڵووکەیەك بە دەمی وەیشوومەو تەندوورەکانی خۆی،
خوێنی رەشتاڵەی قوربانیەکانی تیا نووسیوەتەوە؟!
من و گەرمێن و ئێوە
سیانەی هەموو ئەو شیعرانەین
کە بەردەوام لە داوێنی بەزریکەی ئەنفالەوە
لەگەڵ وردە برووسکەدا ئەکەونە خوارەوە!
ئێرە نیشتمانی ئەو مەرگە بووە کە بۆ خۆی کاروانە
خەون و یادگاریی هەزاران هەزاری جێهێشت و بۆ
جیهانێکی بێ دڵیش چەمۆڵەیەکی بەردینیی نەفرەتین!.
لێرەوە دۆزەخ کەوتەڕێ و
لێرەدا ژیان لە خاچ دراو
لێرەوە خوێن لە وشە چۆڕایەوەو

لێرەوە پەپوولە قرمزیەکان لە ریشی پڕلە هەتاوی
مەولەوی تاوەگۆزیو لە هەنیەی کوژراوی خۆرنشین
ئاسای "عەنبەر خاتوون"ئالأن!
شیعری من و گەرمێن
لە ڤیژەو ئەشکەوت و
لە دووکەڵ و گوندی کاولکراو ئەچن.
من شاعیری دەڤەری قوربانیەکانم و
بە هەناسەی ئەوان شیعر ئەنووسمەوەو
بە دوا سەرنجی پەرتی ئەوانیش گڑوگیای
ئەم پێدەشتە ئەخوێنمەوە!.
من شیعرم..لەم دۆزەخە دانەبڕیوە.
وشەشم..لەجەستەی زارۆڵەکانی جوێ نەکردۆتەوە.
قەڵەمیشم بەردەوام دەروێشە مۆمێکی پرچ هەڵگیرساو بووەو
لە شانۆی ئەم پەنگرەدا سەمای کردووە.
بۆیە روانینەکانم دەمێك ئەبن بە ئاسکی بەرکاوی
ئێوارانی و بە تەم و مژی شیتاڵ شیتاڵی رەنگ و بۆی
گوێ ئاوی و...بەسەدای قەتاری هەڵپڕوزاوی
گەرمییان!
ئەی ئەو زامەی کە هەرگیز سارێژنابێتەوە!
ئەی ئەو تاوسە رەشپۆشەی کە تێلەکانی خۆت
لە بەرینترین گوڵدانی بە سوتماك کراوی چاوماندا دائەنێی.
ئەو وەختەی تۆ بومەلەرزە بووی.

دەڤەرەکانی دیکەم خەونیان بە بوومەلەرزەوە ئەبینی
ئەو دەمەی تۆ سروودی ئاگردان و
پریشکی خوێن و دڵداری سەنگەرە خۆڵینەکان بووی
نەکوێستان فێری شمشاڵ لێدانی تاڤگەو
نەبەردیش فێری زمانی زریان بووبوو.
تۆ لەڕاوەدوونانی مردندا...سەردەق شکێنی ترس بووی.
لە زەماوەندی قوربانیەکاندا...تۆ یەکەمین شاییت کردوو
لە لێدانی دەرگای هەتاویشدا تۆ یەکەمین دەست و
لە تەختایی کارەساتیشدا
تۆ درێژترین شەمەندەفەری کۆست هەڵگری ئێمە بووی.
هیچ پەردەو شوورەو شاخێ...برینەکانت ناشارێتەوە
تۆ وەك حەقیقەت رووت و قوتی و
هەموو ئەندامێکی جەستەی پەیف و هاوارو رازێکت
چون سروشت و چون خوداو چون ئەنفالەکان
وان بەدەرەوە!
ناڵەی ئاسۆت و پوکەپووکی پەلکەگیات
لاواندنەوەی خاك و خۆڵت...لە شیعری تەنگەبەری مندا
جێگەیان نابێتەوە.
باڵای ئاگرەکانت و بەژنی گریانەکانت و
تووڵانیی شەونامەی چیرۆکە جوانەمەرگەکانت
سەدقات بەسەر شیعرە کورتە باڵاکانی مندا ئەشکێنەوە!
من هەموو جارێ لە کلاۆرۆژنەی برینێکی "حەمەرەش " ەوە

کلاًفەیەك شیعرو
لە تراویلکەی چاوە تینوەکانی "مەلا ئەحمەد"ەوە
کانییەك ورەو
لەبۆنی گلّی "باوەشاسوار "یشەوە
مشتێ لە بۆن و بەرامەی ئازادیی وەرئەگرم و
تێکەڵی یەکیان ئەکەم و دواتر تانجیکە ئەنفالێکیان.
لێ دروست ئەکەم و ئەیکەمە سەرت
ئەی خودایە!زمانی گیراوم بەردەو ئەو زمانە
نوێیەم پێ ببەخشە کە بە لووزەو چون بانگی خۆت،
چون لرفەی نوور،چون دارژانی پرشنگ،
برژێتە دیوانمەوە، هەربۆئەوەی
قەرزێکی بچووکی ئەنفال بدەمەوە!.
ئەی خودایە!منیش رۆژانە جێنیشتەی ئەشکەوتەکەی
"داری خلە"م و شاعیرم و سوورەتی شیعرێکی وەك
گەرمییانی نەمرم بۆ بنێرە خوارەوە!
من چی لە زمانێ بکەم...نەگاتە ئەژنۆی منداڵێکی ئەنفال.
من چی لەشیعرێ بکەم...دەستی نەگاتە پرچیکیژێکی ئەنفال.
من چی لە قەڵەمێ بکەم...هەناسە سوارو...هەرگیز نەگاتە
سێبەری سەرو ملی سیامەندێکی دوای ئەنفال.
ئەوەتا بەپەنجەی زارۆکێکی ئەنفال.
ئەستوورترین شیعرم ئەنوشتێتەوە.
بە سەرنجی ژنێکی دووگیانەی ئەنفال.

کێوی پەخشانێکم ئەتوێتەوە.
بە هەناسەی کچێکی ناو چنگی ئەنفال
پووشووم و ئەچم بە ئاسماندا و ئەگەمەلات خودایە!
گەرمیان! ئەوساتەی دێمەناو گرژەباتەوەو
سەرئەنێم بە جەخارتەوە...بە گێژەڵووکەی زریکەتەوە..
من ئیتر ئەبمە دەفی دەست هەورێکی نزمی سەر
"کفری "ت و ئەڵلاّوەیسیم لێ ئەچۆڕێتەوە. ئەو دەمەی
بەلای پەڵە خەمێکتا تێ ئەپەڕم و گردۆڵکەیەکی ئەسمەرت
بەسەر سلاّوێکم لێ ئەکا، من ئیتر لە جێی خۆی،
ئەبمە بێشکەیەکی جێماوی ئەنفال، ئەو وەختەی،
بەرایی خۆرنشینت لە ئێوارە بێدەنگەکاندا بە ڕەنگێکی
ئەرخەوانی کاڵ سەرتاپام ئەکا بە گوڵ هەنار...من ئیتر
ئەبم بە پەپوولەیەکی ئاڵی متی باڵ جووت کردووی سەر
پێڵووی عاشقێکی ئەنفال!.
دەورئەکاتەوە ئەسپە رەشی شیعرم و
چەپۆکانێتی شەپۆلی ئاڤزینی سیروان!
مەرگ تۆزی لێهەڵئەسێ و بەرەو خوارە کاروانسەرای
چرا گریاوەکانی ئەنفال!.
لە وێستگە تەماوییەکانی دوورە ولاّتیشدا
کە بلووری گیانم بە یادەکانت هەڵماوی ئەبوو
تۆم لە سەر ئەنووسیی...گەرمییان!
لەبەردەم پەیکەری برۆنزی "پۆشکین" و لەپاڵ

باڵا خوێناویەکەی "لۆرکا " داو لە پەناگوێی نیرۆداوە
سەرگوزشتەو هەناسەکانی تۆم ئەگێڕایەوە، گەرمییان!
لە "ستۆکهۆڵم"رەشە رێحانەی شیعرم بوویت و
داومی لە قژی دوورگەکان.
لە پاریسدا هەناسەکانی تۆم پێشکەشی " ئیلوار"کردو
لەبەرلیندا ئاخەکانی تۆم بە "گۆتە" هەڵکێشاو
لە مۆسکۆ چیرۆکی سووتانی تۆم بۆ "چیخۆف" گێڕایەوە و
لە کەناری ئۆقیانوسی ئارام کردمیت بە شەپۆلی نارنجیی و
لە لەندەنیش دامیتە دەست مانگە شەوێکی "بایرۆن"و
لەسەر پەڕەی گوڵە رەشەکانی "بۆدلێر"نوسیمیتەوە
لەسەر تریفەو لەسەر دانووب و
لەسەر گۆرانیی و کۆچ و لەسەر باڵی فڕۆکەکان
ناوەکەتم هەڵکەندو
لە دواییشدا بۆ دۆزەخەکەی رامبۆ
دۆزەخەکەی تۆم گێڕایەوەو دۆزەخ گریاو
رامبۆ گریاو شیعریش گریا!.گەرمییان!
لەتەمتوومانی کۆچەوە بۆ تەمتوومانی کۆچێکی ترو
لەم هەورەوە بۆ ئەو هەور...وا جارێکی دیش
بەسەر خۆڵەمێشتا دارژامەوە...گەرمییان!.
بەڵام تۆ هەر زایەڵەی بە نووکەنووکی گڵ نەبووی.
تۆ هەر لاواندنەوەی گوڵە هێرۆ و کڕوزانەوەی بنچك و
گریانی گژوگیاو هۆن هۆن فرمێسکی رەشماڵ و مامزێکی

عەمبارو هەڵبەستێکی نائومێدو پایزێکی ئەژنۆشکاو نەبووی.
تۆ هەر تابووتی درێژی خۆرەتاو و،باڵندەیەکی دۆش داماوی
بێدەنگ نەبووی...تۆ هەر دەشتی پرسەو
مانگەشەوی وردوخاش و
شۆڕەبیەکی بێوەژنی تەنیا نەبووی
تۆ هەستانەوەی هەرەس و هەڵسانەوەی بەردی ئەلحەدو
راوندنەوەی وەرین و گەشانەوەی هەڵقرچاو بووی.
تۆ هاتنەوەی "شەم" و گەڕانەوەی
"سالم" و خولْقاندنەوەی "پەریخان" بووی
دەشتی خوێنە ئازاکان و گوڵە رەوەندەکان و
مامزی بالگرتووی ئەفسانەو داستان بووی.
دەور ئەکاتەوە..ئەسپە رەشی شیعرم و
سمکۆڵان ئەکا بەردی یاخیم و
شەوی خوێنم لەم مەڵبەندەدا بۆتە چراخان!.
من هەموو قومە شیعرێکت بە لێوی سەرابی ئەنفال
پیرۆز ئەکەم و هەموو دەنکە گەنمێکی سەمەلی گەردنت
بە بارانی رووناکیی جەستەم پیرۆز ئەکەم و ئەتکەمەوە
بە خەونی دار سنەوبەرێکی تەمەن چواردەساڵ!.
من چی ئەزانم جگە لە ئەوینی تۆو
من چی ئەزانم جگە لە باهۆزی تۆو
من چی ئەزانم جگە لەوەی شیعر بکەم
بەجوانووی مەراقی بەر دەواری تۆ!

**دەڤەرێك لە ڤیژەو**

**رووبارێك لە شیوەن و**

**پێدەشتێ لە فرمێسك و**

**وێرانەیەك لە كازیوەی كوژراو!.**

**دێمەوە لات!**

**ئەم هەوا خنكاوەت هەڵئەمژمەوە.تا لە زارمەوە**

**تاڵە ڤژو ئاوێنەو شانەو موتومورو رۆكەمەوە سەر**

**پەڕە كاغەزی لە چاوەڕوانیدا سپیی هەڵگەڕاو!.**

**باوەشت بگرەرەوە**

**بۆ گوڵە خەونی هەڵپچوڕكاو و بەرامەی سووتاو.**

**باوەشت بگرەرەوە...بۆ رستە پەپوولەی حەرفەكانم و**

**باوەشت بگرەرەوە...بۆ گێژەنی سەرم و**

**بۆ هەلوەدای شپرزەیی پەرت پەرتی چاوم و**

**باوەشت بكەرەوە!.**

**بۆ تێك ئالآنی دوو جەستەی گوناه و نوێژی**

**لەیەكدی دابڕاو!.**

**دێمەوە لات!... بێزاریم بڕیوەو تەنیاییم**

**تەی كردوەو نامۆییم داوە بەكۆڵماو**

**دێمەوە لات. مشتێك لە قوڕت و مشتێك**

**لە هەناسەت و مشتێك لە قسەت، چەردەیەك**

**لە كۆست و چنگێ لە شەوت و چەپكێك لە دەنگت و**

**شارایەك لە كسپەت**

جەستەمن.. بۆ ئێستاو

پلیکەن بۆلای خواو

لە شیعری فڕیوما... سەرنجی ئاوێتەن!

وشەی تازە لەم عەردەدا ئەدۆزمەوە.

وشەی تازە پەڕیونەتە ژێر ئازارو

ژێر ئەنفال و ناو چاڵەکانی مەرگەوە

زەینی تازە، روانینی نوێ، چاوی سبەی، لەم عەردەدا ئەدۆزمەوە.

ئەو تەمانە لەبەرئەکەم.

ئەو ئاسۆیە ئەپشکنم.

ئەو رەژووە هەڵئەگرم و

ئەو مەراقە رەشتاڵانە

رووناك ئەکەمەوە.

من شیعری نوێ لەم دەشتەدا ئەدۆزمەوە:

لە گیرفانی درەختێکدا. لە بەرۆکی ئاگرێکدا.

لە شوێنەواری ئاخێکدا. لە کلاوی بەجێماوی منداڵێکدا.

لە لانکۆڵەی زەردەخەنەی گڵمتکێکدا

لە دەسماڵی سەر پەیکوڵ و توتڕکێکدا.

من شیعری نوێ لەم مەرگەدا ئەدۆزمەوە،

لەم وەیشوومە چڕانەدا. ئەتدۆزمەوە ئەی عەشقی نوێ!

تۆ پڕشنگت لێ ئەڕژێ و

ئێستە تەڕم بە خوڕی تۆ.

تۆ هالاوی دابڕانت لێ هەڵئەسێ و

**من کەناری خۆرنشینم و تویژاڵ تویژاڵ**

**زەردەی ماڵئاوایی دوایی و**

**هەڵەبجەیەك بە هەناسەی نالییەوە**

**لێم ئەنیشێ.**

**ئەم پێدەشتی هەناسانە رووتەن نین و**

**ژانەکانی ئەم سەحرایە قەت چۆڵ نابن!**

**هەموو دارستانەکانی عەشقی ئێمەو**

**هەموو بێشەکانی گریەی ئێمەو**

**چڕستانی باڵای شەو و باڵای ژن و**

**قریشکەکان لەم شوێنەدا چڕبوونەوە.**

**هەر لێرەیشدا خاچەکانمان سك و زای خۆیان ئەکەن و**

**لەم ئاستەدا خوێنەکان**

**چراکانی خۆیان هەڵئەکەن و**

**لەم ئاستەدا مردووەکانمان ریز ئەبەستن و**

**کۆستەکانمان گەمە ئەکەن و ژاوەیان دێ.**

**ئەم پێدەشتی هەناسانە رووتەن نین و**

**ژانەکانی ئەم سەحرایە قەت چۆڵ نابن.**

**شەقامی گوڵ ئەستێرەی شیعرەکان بێرەدا رەت ئەبن.**

**کۆشکە بلوورینەکانی مۆسیقا لێرەوە بەرزئەبنەوە.**

**مۆزەخانەکانی سەربازی ون ژنی ون.منداڵیی ون.**

**عاشقی ون و پێغەمبەری ون لەم دەشتەدایە.**

**شاری گەورە ئەم زامەیە.**

گەورەترین پارکی گوڵە کۆچەریەکان هەر لێرەیە.
دەنگە دەنگی سینەو مەمك و نووزە نووزی پەنجەکان و
قیژە قیژی پرچەکانو هەراو زەنای ڕۆژی حەشر لەم دەشتەبوو.
لەم دەشتەدا خواوەند گریاو
لەم دەشتەدا مێژوو سەروملی لێ بەجێماو
لەم دەشتەدا بۆ یەکەم جار لە حەژمەتا زەمان وەستاو
هەر لێرەدا ئاسمان بەرەو خوار دابەزی و
پووشووی هاوار هەمووی سووتا.
ئەم پێدەشتی هەناسانە رووتەن نین و
ژانەکانی ئەم سەحرایە قەت چۆڵ نابن.
گوێیەك بنێ بەم خۆڵەوە...چی نابیسی؟
چاوێ بنێ بەم شەوەوە..چی نابینی؟
ئەم پێدەشتە بە گڕەیەو ئەم ژیلەمۆی خۆڵستانە
ئەم بەرایی خەمستانە...چ کلێپەیەکی تیا زاوە؟!
داڕژانی مەرگەو... داڕژانی شیعرو... داڕژانی ڕۆح!

# مەرگی "بۆتان"

1999

مەرج نییە یەك بەیەك هەموو دار سنەوبەرێ بناسی و
مەرج نییە یەك بەیەك هەمووکانییەك بناسی و
مەرجیش نییە یەك بەیەك هەمووگوڵە گەنمێ ماچ بکەیت
تا ئەوسا خۆشەویستیان
لە سپێنەی چاوتا بنووسیتەوە.
دار سنەوبەر لەهەرباخێکی دوریشدا روابێ و
لەهەر شوێنێکیشدا باوەشی بە سامالُدا کردبێ
بۆ هەمووانەو...بۆ ژیانەو...بۆ منیشە با نەمدیبێ!.
با کانییەك من دەمم پێوە نەنابێ
بەلاّم خۆ هەر دەمی من تاقە دەم نییەو
ئەم تینوێتی هەرکەسێکی شکاندبێ، شیعر بۆم ئەگێڕێتەوە
ئەوسا منیش خۆشم ئەوێ، ئەگەر من نەشمناسیبێ،
ئەوسا منیش بڕوا ئەکەم
بەو درەختانەی لە نزیکەوە ئەویان دیوە
بڕوا ئەکەم بەو باڵندانەی لە نزیکەوە دار سنەوبەریان ناسیوە
ئەوسا منیش خۆشم ئەوێ.

نەء مەرج نییە هەرگیز و قەت بەم چاوانە
یەك بە یەك هەرچی عاشقی دەرسیم و گۆمی وانە بیانبینم
بەلاّم خۆ ئەزانم دەرسیم چییەو گۆمی وانیش مانای چییەو
ئیتر دلّدارانیشیم خۆش ئەویٚ.
من پەپوولەکانی دەڤەری دیاربەکرم قەت نەدیوە
بەلاّم زۆریشم خۆش ئەویٚن،
چونکە گولّەکانی دیار بەکر خۆشیان ئەویٚن
من هیچ کەنیسەیەکی دەڤەری قامیشلیم نەدیوە
هیچ کامیٚکیان ناناسم و تەوقەیشم لەگەلّ هیچ شەمالیٚکی
دەڤەری کویٚستانەکانی هەکاردا نەکردووەو
لەگەلّ هیچ کام لە مامز و گولّ ئەستیٚرەکانی
ناوچەی مەهاباتیشدا دانەنیشتووم
بەلاّم هەموویانم خۆش ئەویٚ،چونکە:
قامیشلی خۆشی ئەویٚن.قامیشلی دلّی منە.
چونکە هەکار خۆشی ئەویٚن. هەکار دەنگی منە.
چونکە مەهابات خۆشی ئەویٚن.مەهابات ئاویٚنەی منە.
من "بۆتان "ئەم مانگەشەوە جوانەمەرگەم نەناسیوە
نەلەگەلّ تریفەیدا دانیشتوومو نەگویٚم لە پەیڤی خەرمانەکانی
دەنگی بووەو..نەتەوقەم لەگەلّ هەورەکانی نیٚو سەریدا کردوەو
نەبەسەر ڕیٚگاکانی یاسایشدا قۆلّمان کردووە بەقۆلّی یەکتر داو
نە بە یەکیشەوە گویٚمان لە بڕیارەکانی دادگای هەق گرتووە..
بەلاّم خۆشیشم ئەویٚ..بەلاّم بۆیشی گریام

بەلاّم گولّە وەنەوشەیەکیشم لەسەر مەزارەکەی دانا

چونکە شاخی گوێزە خۆشی ئەویست، ئاخر گوێزە باوکی منە.

چونکە راستیی خۆشی ئەویست، باخچە خۆشی ئەویست،

چونکە شارەکەم خۆشی ئەویست، داد خۆشی ئەویست

ئەی راستیی و باخچەو شارو داد پەنجەرە نین بۆ شیعری من؟!

من بۆ ئەم کتێبە جوانە مەرگە گریام

چونکە شیعری قوباد و غەمباری هاورێم

لە نزیکەوە ئەیانناسی و خۆشیان ئەویست و بۆی گریان.

چونکە ئێوە...ئێوە هەمووتان

خۆتان لە ئەوینی ئەو هەڵکێشاو ئینجا هاتوون

بۆ ئەم گۆڕە نیگا تەڕە.

چونکە چاوی ئێوە چاوی منەو

منیش بڕوا بەفرمێسکتان ئەکەم.

لە دواییشدا چونکە من شاعیرم و

بۆ هەموو ئەستێرەیەکی جوانەمەرگ و

بۆ هەموو تاڤگەیەکی جوانەمەرگ و

بۆ هەموو پەپوولەیەکی جوانەمەرگ و..بۆ "بۆتان "

ناکرێ نەگریم!

ناکرێ شاعیر لەناو دڵی خەمەجوانەکاندا نەبێ.

ناکرێ شاعیر لەهەر شوێنێ

فرمێسکێکی سنەوبەرو ژاڵەی لێ بێ

لەوێ نەبێ

# تڵە تڵی جەستە و

# هەڕەشەیەك لە تاریكیی!

1999

سووتانو بەسووتماك كردنو جەستەی ئێمەو
خاكی ئێمە لەیەك دانەبڕاون.
ئەم چارەنووسە هەڵگیرساوە، ئەم مێژووە سووتەمەڕۆیە،
بەردەوام بەشێك بووە لە لرفەلرفی كڵپە كردن و
لە ئەنجامیشدا دیرۆكی خۆڵەمێشێ كە بێ پسانەوە
كارەساتو كۆستی هەڵقرچاوی گێڕاوەتەوە.بوونی كوردو ئاگر،
لە دووانەیەكی ئەبەدیی ئازارو رووناكیی ئەچن.
جارێك ئێمە كردوومانە بە سونبوڵی مانەوەو
زۆرجاری تریش ئەو كردوینی بە قەرەبرووت!
ئەم قەدەری پێكەوە ژیانی ئێمە و ئاگرە...دێرینە دێرین
لەكوورەی بەناڵەناڵی موغەكانی زەردەشتەوەو
لە نزای سەر بە نووری گاتاكانەوە
لە قوربانییەكانی میدیاوە...لەو مەنجەنیقانەوە

که بۆ یاخیبوونمان داخراوه..تا ئەم ساته وەختە
لەو سەردەمانەوە..لای ئێمەی بلێسە پەرست..
نیشانەیەك بۆ مزگێنی سەرکەوتن،مەشخەڵان بووەو
له بێهودەیی ونائومێدیشدا...ئاگر له جەستەبەردان.
ئێمەو ئاگر تێك ئاڵاوین
چیرۆکی ئاگرو چیرۆکی سووتان، تێکەڵاوبوونی
ژیان و فەنابوون، بوون
تێکەڵاوبوونی رووان و هەڵوەرین. ئاوێتەبوونی لانکه و گۆڕو
هەرەس و هەستانەوەو
بەیەکداچوونی گومان و یەقین..چیرۆکی ئەودۆزەخانە بوون
که هەندێ جار بەهەشتمان تیا رسکاندون و
لەباخی پشکۆدا گوڵمان چنیوەتەوە.
لەدواساڵی سەدەی بیستەمیشدا،ئەوەتا هەرئاگر ئەبێتەوە بەو
رەمزەی گیانمانی پێ ئەبەخشین بۆ ئەوەی لەشمان بکاتەوە
کلۆ خەڵوز و
بەو کلۆیەش ئازادیی لەسەر هاوارەکانمان بنووسینەوە
ئەچینه بلێسەکانەوە
بۆئەوەی له مردندا مانایەکی نوێ بەژیان ببەخشین
ئەچینه ناو رووناکی داخراوی مەرگەوە
بۆئەوەی لێی نەیەینە دەرەوە
سیروان وای کرد
"سیروان" خۆی داگیرسان

بۆ ئەوەی بێزارییەك بکوژێنێتەوە
یان بۆ چەند چرکەیەك هەڕەشە لە تاریکیی بکات
یان بۆئەوەی پەیڤێکی نەمر لە شەوێکی چڕی بێ دەسەلاتیدا
بکا بە شیعرێکی گڕدار
دیسان بۆ چەند چرکەیەك و بەس
تووڕەبوونی زامێك لە دنیایەکی کەڕەواڵە
ئەوە... تەقینەوەی شاخێکی گۆشەگیر و وەڕس بوو
تەقینەوەی ترس و تەقینەوەی بێدەنگیی
هەڵپژانەوەی شەپۆلێکی سەربڕاو..
ئەوە.. نارەزایی رستەیەکی بێ دەمامك بوو لەدنیای دەمامکدار
ئەوە.. ساتەوەختی لێکدانی زەوی و ئاسمانی حەقیقەتێ بوو
دارمانی ئارام و
هەرەسی دڵنیایی و
رووتبوونەوەی رەشەبایەك بوو لەبەردەمی
زەریا بێ باکەکاندا.
لە هەموو خۆشەویستییەکی گەورەدا
لوتکەیەك هەیە...لوتکەی توانەوەیە لەگەڵ حەقیقەتدا...
لوتکەی بڕیارو نەگەڕانەوەی
ئەسپی بە کوڕژن بە چەپۆکانی بەردی ئۆقرە لێبڕاو.
لەوێدا..ژیان داوای مەرگێکی نوێ ئەکات.
لەوێدا..رواڵەت و جەوهەر لە یەکتر جوێ ئەبنەوە.
لەوێدا..خەونێکی هەتاهەتایی ئەبینرێ و

زەمان ئەبێ بەیەك زەمان.
مەزنترین ئەویندارێش هەر ئەوانەن کە بە رۆشنایی جەستەی
سوتاوی خۆیان درِ بە مەترسی و دۆشدامان ئەدەن.
سیروان وای کرد.
ئەو لە جەستەی هەژارو نامۆی خۆی زیاتری شك نەئەبردو
ئەویشیدا بە زرِەی زەنگێك..
بەزایەڵەی ئاوازێك و
بەتاقە هاوارێکی سوتاو
تەنها لە گێژەنە گەورەکان و گەرداوی کارەسات و مەترسیشدا
مرۆڤ و خۆشەویستی مرۆڤ
رووبەرِووی راستییەکان ئەبنەوە
جیاوازییە هەرە گەورەکانیش..
هەر لە ئاستی ئەو جومگانەدا دەرئەکەون
کە مەرگ ئابلۆقەی داون
لەبەرامبەر مەرگدا.. بەهای ژیان تاقی ئەکرێتەوە
ئەو ئێوارەیەی سیروان خۆی کرد بە نەورۆز
نە نەورۆز هەبوو نە ئەو ئاگرەیش کرابۆوە.
ئەو ئێوارەیە.. بوولێڵ گەرِایەوە بۆ تەندوری خۆرنشین
ئێوارەی مانابوو.. ئێوارەی لەدایکبوونێکی تری مەراق
ئێوارەی بەیانیی و
ئێوارەی تەنیایی هەموومان.
لەو ئێوارەیەداو لە بەردەم تەلەفزیۆنێکی خوێن لەچاو تێزاودا

لەبەردەم دیمەنێکی زیندووی نوشوستی هیوادا
کە سومبولێکی لە ئاگرازاوی بووبوو بە داوی گشت جیهانەوە
لەو ئێوارەیەدا..
یەکێك.. فرمێسکێکی ئاگرداو
ئەوی تر ئاخێکی رووآند
من شیعرێکم هەڵپچوڕکاو
بەڵام"سیروان"جەستەی خۆی فڕێدایە
نێو تڵە تڵی نێرینەی ئاگرێکەوەو
بەو تڵە تڵ و نێڵە نێڵی جەستەیە..دەم و چاوی
گومان و ڕاڕایی هەمووومانی ڕۆشن کردەوەو
پێی وتین:من مەزنترین شیعرم
بە ئازاری لەشم نوسیی.
سیروان لە سەرمای هەژارییەوە بوو بە ئاشنای ئاگرو
تەنیایی بردیە ناو هونەرەوەو
شەوانی سەر شۆستەی شەقامەکان..هەنگاوی لانەوازی،
کولێرەو ئاو، لە زستاندا ئاگری ناو تەنەکەی سیلەی
کۆلاَن و لە هاویندا خواردنی شووتی و تاریکیی بەیەکەوە،
بە ڕۆژیش خولیا گەڕۆکەکانی بێکاری و تێڕامان لە
گلێنەی حەرف کردیان بە هونەرمەند
هەر هونەرمەندە هەژارە بێدەرەتانەکانیشن
ڕاستگۆییان لە سادەییەوە هەڵهێنجن و
هەر ئەوانیشن لە زمانی بێگەردی پەلکە گیا بگەن و

بزانن پیرۆزیی نانێکی گەرم و
قلە هەنجیرێکی گەییوو لە چیدایە!
هەر ئەوانن.. بتوانن ئەوەندە لە مردن نزیك بکەونەوە
تا ئەچنە چاوی نەهێنیەکانی ئەودیو گەردوونەوە.
کامێراکانیان ئەوەندە لە مەترسیی بەرنە پێشەوە
کە ئیتر خۆشەویستیان دەرفەتێکی تری بۆ نەمێنێتەوە
جگە لە هەڵگیرسان و هەڵقرچان.
سیروان وایکرد..
ئەو دواوێنەی لەسەر ئاڤزینی مەرگەوە گرت
ئەو دوا وێنەی ئێوارەیەکی کڵپەداری
لە بەردەم فڕۆکەیەکی
بارهەڵگری نامۆییدا گرت
ئەو دوا سەمای لەناو گەرووی ئاگردا کردو
تاجی پشکۆی لەسەر کردو
ئەوسا مرد!
هەموو عاشقێ.. ئەبێ دوا گۆرانی خۆی بڵێ:
لە هەر جێ ژوانێکدا بێ.. دوا دیدار لەگەڵ مردندا ساز بکات
لە ژوورێکدا، لەسەر شاخێ، لە شەقامێکدا.. لە دەشتێکدا
لەبەر باڕێزەی زماندا،یان باراندا، یان لەبەر ئاوێنەی هەتاودا
سیروان جێ ژوانی خۆی لە بێشەلاَنێکی ئاگردا دیاریی کرد..
کە دامرکایەوە بوو بە درەختێکی سووتاوو
بەکۆتەرەی لەوحەیەکی رەش و سپی

ئەم مردنە لەنێو هونەرمەندانداو لە هەموو جیهاندا

وەك تابلۆ گەورەكان

وەك عەشقە گەورەكان

وەك دۆزەخە گەورەكان

دەگمەنە..

دەگمەنە وەك خاچی عیساو

شەوی یەڵداو

تەنیایی كوردستان.

سیروان.. بە ناسۆرترین تابلۆی دوا ساڵی

سەدەی بیستەمی ئێمەبوو..

ئاماژەیەكی گڕتێبەربوو..رووەو زوڵم.

فڕینێكی گڕتێبەربوو..لە تاریكستاندا.

نیشانەی پرسیارێكی گڕتێبەربوو.. لەبەردەم دنیادا.

ئەوە سیروان بوو.

لێرەوە چاوم لێیە بڵێسە باڵیەتی و ئەفڕێ.

لێرەوە ئەیبینم: ئەو قەقنەسەو وێنەی

عەشقێكی ئەبەدی لەئاسۆی خۆڵەمێشینی

ئەم ولأتەدا ئەكێشێ.

لێرەوە چاوم لێیە: "سیروان" لەوێ

لە بەرزاییە برۆنزیەكانی رۆحدا..

یەكێك لە كچە سووتاوەكانی نیشتمان.. لەو كیژانەی

لە ماڵە زیندانیەكانی ئێمەدا.. دەمەو ئێوارەیەك..

**خۆی و تەنیاییەکەی سووتاون..**

**سیروان.. لەوێ ئەیناسێت و بە گڕەوە ئەیخوازێت و**

**ئیتر ئەیکا بە دەسگیران.**

**من لێرەوە چاوم لێیە..سیروان بووە..**

**بە سوورە ئەستێرەی باڵدار..**

**هەموو شەوێ، لەناو بەحری مەڕمەڕەوە**

**دێتە دەرێ و هەڵئەکشێ و بەرامبەر تاقە پەنجەرەی زیندان**

**بۆ چەند ساتێ رائەوەستێ و شەپقەکەی سەری دائەگرێ و**

**لەودیو پەنجەرەی کلێپەوە**

**سڵاو ئەکا لە "ئۆجەلان"!**

# عەشق

1999

**لە ناو سەرما،لە باكووردا،عەشقێك هەیە پڕ لە باران**
**پڕ لە هەورە بروسكەیە.باران راپەڕینی سەوزمە و**
**برووسكە باڵی بڕوامەو سەرم فەزا.**
**لە ناو گیانما.لە باكووردا،عەشقێك هەیە پڕ لە باهۆز**
**باهۆز نیشتمانی چریكەمە و**
**دەمێك ئەبێ بە پەیامی كێوەكان و**
**دەمێكی تر بە هەناسەی شارەكان و**
**باهۆز ئەبێ بە شەقامی خۆرەتاوو**
**ئەبێ بە مانگی سەر چیاو**
**باهۆز ئەبێ بە گەریلا.**
**لە ناو سەرما،لە باكووردا،عەشقێك هەیە پڕلە سروود**
**سروودی ئاو.سروودی بەرد،سروودی بەفرو رەشەبا**
**سروود ئەبێ بە رووبارو ئەڕژێتە شیعرمەوەو ئیتر ئەڕوا**
**ئەڕژێتە جیهانەوەو سروود ئیتر هاژە ئەكاو**
**سروود ئەبێ بە دەنگی خوا**

سروود ئەبێ بە ئەستێرەی ئەرخەوانی و
سەرم بە چرای گەریلا.
لەناو سەرما،لەباکووردا،عەشقێك هەیە
پڕە لە جریوەی مندالْ،پڕە لەئاوێنەی گولْ و
پڕە لە ئەوینی ژن و
پڕە لە گۆمی رووناکیی و
پڕە لە هەنیسکی گەلاْ.
لەم عەشقەدا
ئاوێنە ئەبێ بە رێگا
ئەوین ئەبێ بە گۆرانیی و
گۆمیش ئەبێ بە چاوان و
هەنیسك ئەبێ بە هەلْەبجە و
لەدواییشدا هەر هەموویان
ئەبن بەخەونی گەریلا!.
لەناو سەرما،لەباکووردا،لەئێستەدا
عەشقێك هەیە پڕە لە ملیۆنان دەستی خۆر و
پڕە لە ملیۆنان جۆگەی دەنگ و
پڕە لە هەزاران شەقام و
دەستی خۆر ئەبێ بە دوارۆژ
جۆگە ئەبێ بە رۆژنامەو
كێلْگە ئەبێ بەزاری نان
لە دواییشدا شەقام ئەبێ بە "ئۆجەلان"

لەناو سەرما، لەباکووردا، لە ئێستەدا
عەشقێك هەیە پڕ لە هەور
پڕ لە کانی ژێر زەمینی و
پڕیش لە هاواری ناکاو
هەور ئەبێ بە دەربەندی هاژەو سێلاو
کانیش ئەبێ بە بوومەلەرزەی جەستەم و
هاواریشم بە وڵاتێکی هەڵقرچاو
لەناو سەرما،لەباکووردا،لەئێستەدا
عەشقێك هەیە،عەشقی "وان"ێکی تینووە
عەشقی گڕێکە زیندانی و عەشقی زمانێکی زامدار
وان هەڵئەسێ و لە ئازادیی ئەخواتەوە
گڕ هەڵئەسێ و نەورۆز ئەباتە سەرلوتکەو
ئەم زمانە زامدارەیشم رائەچڵەکێ و
دەرگا لەسەر حەرفەکانی ئەکاتەوە.
لەناو سەرما. لەباکووردا. لەئێستەدا
عەشقێك هەیە، عەشق بووە بە پەنجەرەی هەموو ماڵێ
عەشق بووە بە سترانی هەموو ماڵێ
عەشق بووە بە باڵندەو بە درەختی هەموو ماڵێ
لەناو سەرما.لەباکووردا.لە ئێستەدا
عەشقێك هەیە... هەموو رۆژێ گەورە ئەبێ و گەورە ئەبێ
لە ئێستەدا وڵات جێی تیا نابێتەوە
دارستانی بڵێسەیەو پەل ئەهاوێ، پەل ئەهاوێ. بەرەو ژوورتر

ئەگاتە شەوی ئەنقەرەو نالّە ئەکات.. پەل ئەهاوێ

ئەگاتە ناو ئەستەمولّو شەقام شەقام لرفە ئەکات.. پەل ئەهاوێ

ئەگاتە ناو پێکەنینی ئەتاتورك و پێکەنینی ئەکا بە خۆلّ

ئەمە کلّپەی عەشقی منە... عەشقێکەو ناوی گەریلاو

عەشقێکە ناوی:کوردستان..

ئەمە کلّپەی عەشقی منە.. ئازادیی ئەنووسێتەوە...

لەسەر جەستەی شەهیدان و... لە ئێستەدا

بووە بە نەورۆزی جیهان!

# رسكان لە خۆڵەمێشدا..!

1999

لەو بەیانییەدا خۆرنشین زاو شەوێکی رەشی بوو.

لە هەتاوی ئەو رۆژەدا چڕبوونەوەی کۆست پەلی هاویشت و

لە ئاپوورەدا.. تەنیایی لەدایك بوو.

لە بیست و چواری نیساندا..پایزێکی قەمبوور هات و

لە گەشانەوەی باخە هەرزەکارەکانیشدا

زەمانێکی پیروپووکانەوە بوو بەوەرزمان!.

من نیشتمانێکم هەیە

هەر لە منداڵییەوە سێدارە رایژەنیوەو

کۆچ پێناسەی بووە و.. زوڵم پارووی بووەو

درەختەکانی برین شمشاڵی بوون و

گوندی بێوەژن و شاری بێوەژن و شەقامی بێوەژن

هەرێمەکانی بوون و

پەپوولەی کوژراو بارانی و

ئاوێنەی شکاو دەم و چاوی و

لاواندنەوەیش لاولاوی!

**من نیشتمانێکم هەیە.. لە دووکەڵ پێکهاتووە**
**دووکەڵی چوارگۆشە و**
**دووکەڵی لاکێشە و**
**دووکەڵی سێ گۆشە و**
**دووکەڵی بازنەیی**
**لە پەنجەرەی رەژووی هەر کامێکیانەوە**
**سەیر بکەیت:**
**دارستانی ڤیژەو**
**شاخی وەیشوومەو**
**هاوینەهەواری فرمێسك و**
**گەڕەکی زایەڵەت لێوە دیارە!.**
**من نیشتمانێکم هەیە**
**لە هیچ نیشتمانێکی تر ناچێ.**
**لە هیچ گریانێکی تر ناچێ.**
**لە هیچ سووتانێکی دی ناچێ.. هەموو جارێ**
**ئەیهاڕن و پووش و پەلاّش و پاشەڕۆی ئازارەکانی**
**ئەدەن بەدەم**
**بای شمشێرو بای زرێپۆش و فڕۆکەوەو کەچی لەوسەر**
**ئەم نیشتمانە ئەفسانەیە دێتەوەو.. کەچی لەوسەر**
**ئەم کۆتەرەیە ئەبێتەوە بە سنەوبەرو ئەڕوێتەوەو**
**کەچی دیسان ئێسك و پروسکی ناو سوتماك**
**یەك ئەگرێتەوەو کوتەکوتەی ئەم جەستەیەیش**

هەڵئەستێتەوە سەرپێیان و ڕووئەکاتەوە دنیاو
ئەڵێ منم کوردستان!
من نیشتمانێکم هەیە.. تەلیسمی گەردوونە
لە قەڵادزێدا ئەیکوژن و بەڵام لە ئامەددا زیندوو ئەبێتەوە.
لە هەڵەبجەدا سەری ئەبڕن و بەڵام لە کەرکووکدا ئەژێتەوە.
لەهەولێردا لە قەنارەی ئەدەن و
لە ورمێدا بەرزەوپێ ڕاست ئەبێتەوە.
من نیشتمانێکم هەیە حەوت پەراسووی
لە هەموو نیشتمانەکانی دیکەی ئەم دنیایە زیاترە
نە قەوارەو نە حاڵ و نە ماڵ و نە چەترو نەشوورەو
نە ئەندامە لە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانداو
نە پولێکی هەیە لە سندوقی دراوی دەوڵەتانداو
نە ئالاّ و نە زرێ پۆش و نە فڕۆکەو
کەچی ماوەو کەچی ئەژی و کەچی هەیشە!
من نیشتمانێکم هەیە
بالاّی ئەو بالاّی ئەشکەنجەیە و
چاوی ئەو چاوی ئەنفالەو
گەردنی ئەو گەردنی گریانەو
ئەم قاچی ـ "4/24 "ەو
ئەو قاچی ـ"3/16"یەو
لەبیرمە بەیانییەك دەستی ڕاستی لەژێر هەرەسێکدا قرتاو
لەبیرمە دەستی چەپی زرێ پۆشێ

لەگەڵ زینجیرەکانی خۆیدا بردیو

لەبیرمە بەیانییەکی تر دنیا زەهرخواردی کردوو

کۆڕەویێکیش مێژوویەکی ئاسنینی دا بەکۆڵیاو

کەچی لەپڕ ئەو بالآیە ئەستێرە ئەگرێ و

ئەو چاوە ئەبێ بە چاوی دوارۆژو

ئەو گەردنە ئەبێ بە گەردنی ئاگرو

4/24 ئەبێ بە 3/21

3/16 ئەبێ بە 3/5

هەرەس راست ئەبێتەوەو دەستی راستم ئەبێ بە قەندیل و

دەستی چەپم ئەگەڕێتەوەو ئەبێ بە دەستی راپەڕینم و

هەمان دنیا دێتەوەو ماچم ئەکات و

ئەمجارەیان مێژوویش ئەبێ بە ئەسپی غارکردنم!

لەبیستو چواری نیسانی ئەو ساڵەدا کەخۆشەویستی شیرین

هەزاران هەزاری کردبوو بە فەرهادی بێستونەکانی ئەم خاکە.

زانکۆی سلەیمانی بە سواری کەژاوەی چرا گەیشتبووە

قەلآدزێ و بەهاری ئەیلولی دابوو بەخۆیدا. ریزە چراوگی

سەری خوێندکارو مامۆستا. ریزە وشە. ریزە قەڵەم

بووبوون بە چراخانی زانست و هونەر. سەر لەبەیانیی

ئەو رۆژە. لەناکاوێکدا، ساماڵ بوو بە نەینۆکی

شکاو هارەی کردو بەیانیی بو بە بوولێڵ و قەلآدزێ

کەوتە سەر چۆکی شکاوو فوارەی جەستەمان بەرەو

ژوور بوو بە ئاوی یاقووتین و هەڵکشا.

ئیتر دڵۆپە وشەو خوێنی گوڵان یەك یەكتریان خواردەوە.
چاوی كتێب و چاوی درەخت سۆمایان پڕاو
كوێرایی چرا داهات و
پێكەنینی هەڵوەری.
كۆلیجێك بوو بە تابووتی ژمارە كوژراوەكانی ماتماتیك و
كۆلیجێك بوو بە تابووتی شیعرەكوژراوەكانی ئەدەب و
كۆلیجێك بوو بەتابووتی گوڵەگەنمە كوژراوەكانی كشتوكاڵو
زانكۆیش بوو بە تاقیگەی مەرگ!
من نیشتمانێكم هەیە
لە سێسەدوو شەست و پێنج پەنجەرەیساڵێكیا
رەنگە هەر پێنج پەنجەرەیان پێ بكەنن
ئیتر سێ سەدو شەست پەنجەرەكەی تری
یان هەڵمی كۆست دایگرتوون و
یان دەستیان ناوەتە ژێر چەنەی خەمی ژوورو
یان سەرسام ئەڕواننە پایزی دوورو
یان لەگەڵ رێژنە باراندا ئەگرین!
من نیشتمانێكم هەیە..
بۆ خۆیشی ئەوەندە بچوكە
جێی بزەی گوڵ خەندەرانێكی تێدا نابێتەوە.
من نیشتمانێكم هەیە بۆ پەژارەیش ئەوەندە گەورەیە
جێی هەموو زایەڵەی دنیای تێدا ئەبێتەوە،
من شیعرم كردووە بە ئاو

ئەیکەمە دەفری هەموو رۆژەکانی ساڵەوە.
من شیعرم کردووە بە مێو
لەنێو پەنجەکانی خولیاو خەیاڵما
هەموو جۆرە پەیکەرێکی ئەفراندنیان لێ دروست ئەکەم.
جوانیی خودام تێکەڵ بە جوانیی زمانەکەم کردووە
بێگەردی منداڵم تێکەڵ بە روانینم کردووە
دەنگی هەژارانم تێکەڵ بە دەنگی خوێنم کردووە
بۆیە ئەتوانم ببمە هاژە لە گوێتانداو
بۆیە ئەتوانم خۆشەویستیتان سەرسامکەم و
بە سیحری زمان کەمەندکێشتانکەم
من ئەمرۆ لەنێو شتە بچووکەکانەوە ئەچمەوە نێو قەڵاَدزێ
شتە لەبیرکراوەکان ئەوانەی بوون بە هەڵم و کۆست و
بارانی لەبار بردن،من سەرلەنوێ
ئەیانکەمەوە بە هەورو بە چەخماخەو بە باران
من پەلکە گیای سورباوی قژی سەروەرو
فەقیانەی سپی لە کۆترچووی حەمە ساڵحم لەبیرە
سروودەکانی هێرش هەر لە سنگمان
بۆیە ئەتوانم بەر لەهەمووتان
قەڵاَدزێ راکێشمە ئەم هۆڵەوە.
من نیشتمانێکم هەیە..خەم سابات و خەم کەپرێتی
خەم بووە بە باڵندەی خەم بووە بە گژوگیاو خەم بەماڵی.
لەگەڵ ژاندا دیلانێ ئەکاو

لەگەڵ ئازاردا بووە بە هاوڕێو

لەگەڵ مەراقدا بووە بە دراوسێ و

بەڵام من نیشتمانێکیشم هەیە..

لە دوای هەموو قەڵادزێ و هەڵەبجەیەك

ئەڵێ وئەڵێ: لەوانەیە مردن بمرێ

بەڵام من نا!

# ناوەڕۆك